(تێبینییەک لە بناغەی مێژووی ئێراندا)

# دوانزە سەدە بێ دەنگی !

نووسراوەی یەکەم : سەرهەڵدانی هخامەنشییەکان

ناسر پورپیرار

حەمە سدیق میرزا کردوویە بە کوردی

( تیْبینییەک لە بنچینەیْ میْژووی ئیْراندا )

# دووانزە سەدە بیْدەنگی!

## نووسراوەیْ یەکەم : سەرهەڵدانی هخامەنشییەکان

نووسینیی: ناسر پورپیرار

حەمە سدیْق میرزا لە فارسییەوە کردوویە بەکوردی:

*Heme Sidêq Mîrza*

چاپی یەکەم

٢٠٠٤

ناوی کتێب : دووانزه سەده بێدەنگی

نووسینی ناسر پورپیرار

حەمە سدێق میرزا لەفارسییەوە کرردوویە بە کوردی و تایپی کردووە

تیراژ : ۱۰۰۰ دانە

ساڵی چاپ ۲۰۰٤

ژمارەی سپاردن : (۱۸۱)ی ساڵی ۲۰۰٤ ی وەزارەتی ڕۆشنبیری پێدراوە



چاپخانەی شڤان : سلیمانی

# کۆرتە پێشەکی وەرگێڕ

یەکەم جار کە زنجیرە کتێبە بەنرخەکەیٚ ماموٚستایٚ هێژا. بەڕێز ناسری پورپیرارم بینی . ئەو خەیاڵەم بە مێشکدا هات . کە ئەکات بەڕێزیشیان لاسائی ڕوٚشنبیرە کلاسیکەکانی بەرەیٚ پێشووی کرد ببتەوە و هاتبێبە شانوباڵی پادشاهان و حاکمانی پێش و پاش ئیسلامدا. توٚزە توٚزە کە لاپەڕەکانی بەرگی یەکەمی کتێبەکەم هەڵدایەوە. هەستم دەکرد کە بوٚچوونەکەم لەجێگای خوٚیدا نییە و نووسەرباسی تازەیٚ فراوانی پیٚیە . کە بوێری و دەسەڵاتی بەڕێزیان لە بیرخستنەوەیٚ چەمکە مێژووییە پشتگویٚ خراوەکاندا زوٚر بەرچاو و خوێندنەوەی ئەوٚ بەرهەمانە بوٚ هەرکەس کە خولیای پرسە مێژووییەکان ..بێت پێویستە . ئەوٚ باوڕەی من نابیٚوەها لەیەک بدرێتەوە کە هەموو بوٚچوونەکانی ئاغایٚ پورپیرار بەدوور لە ڕەخنە و کەموکووڕیی دەزانم و ئەبیٚ ئەو ڕاستییە بزانین .کەش و هەوایەک کە جنابیان تێدا دەژی شتێک نییە کە بوٚ مروٚڤی خاوەن شارستەنییەتی ئەم سەردەمە کەش و هەوایەکی ئاسایی بێت ولەکوٚرتە ڕستەیەکدا ئەڵێم کە کارەکەی بەڕێزیان بەرهەمێکی هێژایە. تەنانەت ئەگەر ناچار بووبیٚ بوٚ دەربازبوون لەزەختی ڕم بەدەستانی سەردەمی ئەشکەوت نشینی ٢٦ سەدە بێدەنگی بکات بە ١٢ سەدە . بەوٚبوٚنە وەبڕیاری وەرگیڕانی بەرگی یەکەمی زنجیرە کتێبەکەیٚ ئاغایٚ ناسر پورپیرارم دەرکرد وهیوادارم شایستەگی کەڵک وەرگرتنی . بوٚ دوٚزینەوەیٚ ڕاستییە مێژووییەکانی نەتەوەکەمانی هەبێت .

حەمە سدێق میرزا

# پێرست

# پێشەکی نووسەر

هەرچەن بۆمێژوو و بۆجیهان ئاشکرا بووە کە خەڵکی ئێران سەرەڕای هەبوونی کەند و کۆسپی دەورەیی، ڕێگای سەربەخۆیی و پێشکەوتوویی خۆی دەربازدەکات و دەسەلمێندرێت کە بێ یەکگرتنی فۆرمی، ئازاد و نەتەوەیی، داهاتوییەکی هێمن لەکاردا نی‌یە، پێ‌نووسەکەم خۆی بە بەرپرس دەزانێ ئەوانەی کە ساڵانێکە لەبارەی مێژووی ئێرانەوە لە بیرمدایە، بیهێنمە سەر ڕووپەلی کاغەز. هەڵسەنگاندنی مێژووی ئێران بە هەڵسەنگاندنی مێژووی پارس و پارسەکان نازانم و هەوڵ ئەدەم ژیانی دێرینەی هۆزە جۆراوجۆرەکانی دانیشتووی بەرزاییەکانی ئێران ـ نەوەک داگیرکەریی هۆزە باکووریەکان کە بناغەی شێوەی دوواکەوتووی شاهەنشاهی‌یان دارشت، بکەم بە بنەڕەت و دەسپێک و ناسنامەی نەتەوەیی دانیشتووانی ڕەسەنی ئێران و لەم ڕێگاوە ئەرکی نەتەوەیی خۆم بۆ ئامادە کردنی زەمینەی یەکێتی ئەو هۆزانە بەجێ بهێنم. ئەم کۆمەڵە باسە کە بەم بەرگە دەس پێ‌دەکات لە چوار بەرگدا بەوناونیشانەی خوارەوە کوتایی پێ‌دێت.

بەرگی یەکەم : دووانزە سەدە بێدەنگی، سەرهەڵدانی هخامەنشییەکان.

بەرگی دووهەم : پردێک بۆڕابوردوو، سەرهەڵدانی ئیسلام.

بەرگی سێهەم : هەوڵدان بۆ پێناسەی نەتەوەیی، سەرهەڵدانی سەفەوییە.

بەرگی چوارەم : کۆتایی پڕوبڵاویی، سەرهەڵدانی خەڵک.

ڕوانگەی سێ بەرگەکەی دیکەش، وەکو بەرگی یەکەمی ئەم پرتوکە، سازشتی لەگەڵ مێژوو-نووسینەکانی فۆرمیی سەردەمی ئیستادا نی‌یە و ڕێگای خۆی تێپەڕ دەکات. بڕوام وایە ئەوەی کە خەڵکانی دیکە دەربارەی مێژووی ئێمە نووسیویانە بەشێک لە پشکنینەکانی دوو-سێ سەدەی ئەم

دواییەن ، کەژێر نووسێکی هاوبناغەیٚ یەکتر و ناڕاستی ئاریاباوڕانەن و هخامەنشییەکانیان کردووە بە یەکەم ئەندازیاری مێژووی نووسراوەیٚ ئێران .

مێژوونووسە ناوخۆییەکانیش کە ژمارەیان زۆر نییە ، پشکنینێکی ئەوتۆیان لە بنەڕەتی مێژووی ئێراندا نەبووە و تەنانەت بریٚ لەوانەش پێنووسەکانیان بەشێوەیەک گەڕاندووە کە خواردەمەنی سەر ئەوٚ خوانە بێت وا تەختی جەمشید بەناوەندی جیهان گریمانە دەکات .

لەهەمان حاڵدا هیچ بەشێک لەبەشەکانی ئەم کتێبە نابێت و ناتوونێت ببێت بەبیانوی بۆچوونی کەسانێک بە (پان)ە وە خۆیان سەرقاڵ کردووە . :پان تۆرکەکان: :پان ئیرانییەکان: :پان کوردەکان: :پان عارەبەکان : پان ئیسلامەکان: و پانەکانی دیکە . کە لەڕێڕەوی ناوخویی و نێو نەتەوەیشدا تەنیا بووە بەهۆیٚ کێشە و ئاڵۆزی .

سەڵتەنەت پەرەستەکان ، نەتەوەپەرەستەکان ، حیماسەت دۆست و مێژوونووسەکانی مووچەخوری ئیمپراتوری کورش[1] ئەم کتێبە دەکەن بەوشەنامە . نووسەر کە دڵەڕاوکی لە کۆرتبوونی نان و هەبوونی خۆیٚ نییە ، داوا لە بیر و بڕواکانی دیکە دەکات کە هەڵوێستیکی شیاویان لەم بارەوە هەبێت چوونکە ئاژاوە و بەزم وهەرا ئاکام و بەرهەمی بۆ کەس نەبووە .

هەندیٚ مژار وەکو نەبوونی شوێنەواری مادیی و ڕاگەیاندنی هخامەنشییەکان ، پێش لە سەرهەڵدانی ئیمپراتورییەکەیان ، زۆرجار دووپات کراوەنەتەوە ، تاکو گرنگایەتی ئەوانە نیشان بدرێت .

سوپاسی بیٚسنوورم بۆ هێژایان دوکتۆر مهیار خلیلی و خشایار بهاری کە هێشتیان لەسەرچاوە نایابەکانیان کەڵک وەربگرم ، هەرچەن وەها تێگەیشتم کە ناوەڕوکی ئەم کتیبەیان بەدڵ نییە .

ناصر پورپیرار

[1] کاتێک کەبیەشێک لەم کتێبەم بۆ خاوەن شکویەک دەخوێندەوە کە خاوەنی چەندین کتێب و وەرگێراو دەربارەیٚ هخامەنشییەکان بوو ، بەتووڕەییەوە لێم هاتە دەنگ و لە بەردەم کومەڵێک لە دوستانماندا ووتی بەسیەتی ئاغا ئێمە لەم ڕێگاوە نان دەخوەین .

# دەرگا

**مێژوو لە سەر زەوییەوە دەڕوێت**
**و وەکو هەر ڕووەکێکی دیکە خەڵکی هەرێمەکەیٚ خۆیەتی.**

گەورەترین کەند وکۆسپی مێژوو نووس ئەوەیە کە وڵامی پرسیاری (مێژوو چیە) فراوان بوونی وەکو باوە، (بەڵگە مێژووییەکانە) . ئیستا کەلاکی مردووەکان ، شتومەکی تەنشتیان ، مۆر، دراوٚ، نوسراوە، ئامرازی دێرینی کار و ژیان، پیتی نووسین ، خوداوەندان ، ئیمپراتوران وهاوسەرەکانیان ، سەرداران ، گەورەپیاوان ، نووسەران ، هونەرمەندان و کۆگایەکی ورد و درشتی دیکەی مێژوویی، ئاسۆیٚ بینینی مێژوونوسی داپۆشیووە ، هەوڵی ئەوی بۆدۆزینەوەی وردی زەمەن و شێوەی خولقاندنی دەفرێکی سواڵەتی، خوێندنی نەکراوی نووسراوەیەکی کۆن، دۆزینەوەیٚ خاوەنێک بۆ مۆرێک و هیتر ، بەخۆیەوە خەریک کردووە هاودەق کردنی سەخت و پشتشکێنی ڕووداوە مێژووییەکان ، لەگەڵ نموونەی نەدۆزراوی مێژوودا ، تەمەنی هەر مێژوو نووسێک دەڕزێنیٚ و دەبێتە هۆیٚ وونبوونی ڕێگاکەیٚ . ساڵانێکی زۆرە کە شێوەیٚ ناڕاستی هەڵسەنگاندنی مێژوو، مێژوو نووسی بۆ کۆکردنەوەی بەشە وردەکانی مێژوو پاڵ پێوە ناوە و ناچاری کردووە بەجێگای مێژوو، دێرینەناسی فیر بیٚ، پیتەکانی نووسینی کۆن بخوێنێتەوە، ببێت بە بسپۆری هەموو ئایینەکانی پێش لەمێژوو و مێژوویی، ئیمان ترادیخون، ڕێگا وڕەسم و باوڕەکان لەیەک بداتەوە، مێژوو لەگەڵ شێوەیٚ ڕاکشانی هەر مردوویەکدا لەهەرچوارگۆشەی جیهاندا هاودەق بکات، ژمارەیٚ کاسەو کوچەڵە و ئەسپەکانیان بژمێرێت ، دەرەقەتی کاری پرزەحمەتی زمانشناسی بێت، پێشینیان و وەچەکانی هەردەسەڵاتدارێکی مێژوویی لە پانتایی بەربڵاوی حەرمخانەکەیدا بناسێت ،

ڕۆژ وکاتژمێری هەر ڕووداوێکی مێژوویی بەوردی لەمێشکیدا ڕابگرێت . بەهاودەق کردنی قەبارەی لوت و تاج و ڕەدێن و کڵاو وگریّ برویّ پادشاکان بە دراو و مۆرەکانەوە ، سەردە مە "مێژووییە جۆراوجۆرەکان پێکەوە بلکێنێ ، لەتیرە و ڕەسەنی پارچە سواڵەتێک ئاگادار بن . هەموو ڕۆژەکانی مێژوو ، بەتەقویم و گاوژمێری میسری ، مایایی ، یونانی ، هیندی ، و چینی و بابۆلی بژمێریّ . سیستەمی ئاودێری سەردەمە کۆنەکان و شێوەیّ ئەندازیاری ، کەوانی سەرتاق ودرگاکان ، و نەقشی تەختی کوشک و ژوورەکان بناسێ . بتوانن نێوی ئامراز و ئیسترومنتەکانی موسیقا لە دەهەزار ساڵی پێشودا دیاری بکا ، لەگەڵ هۆنەری سەردەمانی کۆندا ، تاڕادەیّ بسپۆڕ وشارەزا ئاشنا بیێ .

" لە سەردەمی مومسن و رانکەوە ، مێژونووسان هەموو هێزی خۆیان بۆ کۆکردنەوەی برێک ماتریاڵی کاڵ و کرچ بەکار بردووە و لەڕێگایّ خوڵقاندنی شتومەکی دۆرستکراو و نیوەدروستکراوەوە ، هانایان بردووەتە بەر دابەشکردنی کاروپلە مێژووییە دەسکرەکانیان وەکو کۆمەڵێ نوسراوەیّ ئامادەیّ چاپ لە زانستگەی کەمبریجدا ، بڵاو کردووەتەوە" .

ئەم کۆمەڵە نووسراوانە نموونەی ماندونەناسی ، زانستی نواندن ، وەستاکاری هۆنەریی و دەسەڵاتی ڕێکخستنی کۆمەڵگایّ ئێمەیە . و وەکو نموونەیّ پردەکان ، تونێلەکان ، بەربەندەکان ، کەشتییەکان ، و کۆشکە بەرز و سەرکیش و سەرنج ڕاکێشەکانمان دەژمێردرێن و ڕێکخەر و خوڵقێنەری ئەوانە لەریزی ئەندازیارانی بەناوبانگی ڕۆژئاوادا جیّیان خۆش کردووە . سیستەمی پێشەیی دەرفەتی بۆئەو کەسایەتییە شەڕاشۆانە ڕەخساند تا بەبارمەتی پەلامار و داگیرکەری وڵاتان و بیرەوەرییە مێژووییەکانیان بەسەر دانیشتووانی ئەوّ وڵاتانەدا زاڵ ببن و دەسخوشانەیەکی شیاو وەرگرن . سەرەڕایّ ئەوەش لەڕوانگەیّ چاودێرانی بیّلایەنەوە ، ئەم پرسیارە دەکرێت ، کە ئایا بیرکردنەوە بە سەرکەوتن بەگشتی وەکو مژارێکی تایبەت و بەم شێوەیە ، هەڵسەنگاندنێکی خەیاڵی و دوور لە ڕاستی نییە . (آرنولد توین بی ، هەڵسەنگاندنی مێژوو ، بەرگی یەکەم ل ٤ )

وەکو ئەڵێن ، ئەم "بەڵگە مێژووییانە" لەخراپترین حاڵەتدا ڕادەیّ بیرکردنەوە و کردەوەیّ ، تاقەکەس ، گروپ و یان هەلومەرجێک نیشان ئەدات کە دۆزینەوەیّ دەقاودەقی ئەوەش ، بەواتایّ ئاشکرا کردنی نهێنییە مێژووییەکان نییە . بەڵکو ئەوپەڕی ، بە "مێژوونووس" ئیجازە

ئەدات کە ڕووداوێکی مێژوویی لەگەڵ هەموو وردەکارییەکانیدا و بە لێکدانەوەیەکی شەخسی لەو بەڵگەنامانە کە زۆربەیان ناڕاستن، بگێڕێتەوە. بەڵام ئەم کۆمەڵە سەرکەوتنانە هیچ کاتێ بە دۆزینەوەی وڵامێک بۆ"مێژوو چی‌یە" کۆتایی پێ‌نایەت، چوونکە تۆژینەوەی وردەکارییەکانی مێژوو، ئاشکراکردنی خۆدی مێژوو نی‌یە. بۆنموونە ناتوانرێت مێژووی شەڕی دووهەمی جیهانی بەپاڵدانەوە بەقسەکانی هیتلەر، یان چرچیل ، یان هەردووکیان ڕێک بخرێت، هەرچەن ئەم قسە و ڕاگەیاندنانە بەشێک لەبەڵگەنامەکانی شەڕیش بن.

گێرانەوەی شەڕ، لەسەر بروا و خەیاڵی دوو هۆکاری شەڕ، خۆبەخۆ ئەبێتە هۆی ناڕاستی و بێ ناوەڕۆکی بەڵگەنامە مێژووییەکانی. هەروەها دەرکەوتووە کە ئەم ناڕاستییە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی زنجیرە پادشاکانی میسری دێرینە، مێزوپۆتامیا، چین، یونان، ڕۆم و عارەب. هەرلەم سەردەمەی ئیستاشدا، لەژاپۆنەوە تادەگاتە کەنەدا، هەر وتارێک کە بەزاری هەمووبەرپرسانی دەسەڵاتداردا دێت و لەسەر لاپەڕەی کاغەزدەنووسرێت، هەر هەمووەکەی بەمەبەستی ڕاست نیشاندانی مێژووی وڵاتەکەیان پێ هەڵدەستن، بەڵام وەکو نوسراوەکەی داریوش لەبێستووندا بێ‌بناغە و دوور لەڕاستییە.

هیچ بەڵگەیەک ناتوانێت زۆرتر لەوەی کە مەبەستی نووسەرە، شتێک بسەلمێنێت، ئەوە کە نووسەر لەمێشکیدا بوو، ڕووی داوە، ئەوەی کەبیری لێدەکردەوە ئەبێ سەر هەڵبدات، یان لە داهاتوودا سەر هەڵئەدات و لەوانەیە ئەوێ کە نووسەر دەیویست کەسانی دیکە بیری لێ‌بکەنەوە ، ئەو بیری لێ‌کردووەتەوە، یان تەنانەت ئەوەی کە خۆدی خۆی بیری لێکردووەتەوە، بیری لێدەکاتەوە. هیچکام لەوانە تاکاتێ کە مێژوونووس کاری بۆنەکردوون و کلیلی دۆزینەوەی نهێنییەکەی نەبینێتەوە خاوەنی واتا و ناوەڕۆک نی‌یە. (دی. اچ. کار، مێژوو چی‌یە، وەرگیراوی حسن کامشاد، ل ٢٢)

ئەم قسە بریقەدارانەی "کار" هێشتا بەدوای کێشەی گەورەتردا دەگەڕێ، چوونکە ئاکامی هەوڵدانی مێژوونووس هەرچۆنێک بێت، تام‌وبۆنی بیری ئەوی پێیە و بێ‌ناوەڕۆکی باڵی بەسەردا کێشاوە. نموونەی ڕۆشن و نێزیک لەم‌بارەوە لێکدانەوە و بۆچونی دیاکونف لە مێژووی مێدیایە کە بۆچونێکی پەلامارانە و بەسوودە بۆ باوەڕەکەی دیاکونف.

بەم‌جورەیە کە بازنەی زنجیرەیەکی پوچەڵ لە خەیاڵ، قەرەباڵخی و کێشە وهەرا، کە بێگومان

مێژووەکەی لەشوێن یەک و نەبچراوە و بۆئەوەی کە لەزاری لاێنگرییەکی تایبەتەوە دەردەچێ و لەزاری لاێنگریکی دیکەوە لەیەک ئەدرێتەوە ، مێژوونووسی لەگیژاوی سەرسوور هێنەری ئیستادا قوڵبەس کردووە .

گۆڕەپانی ئەم تێکەڵ و پێکەڵییە ، کاتێ دەگاتە ئەوپەڕی سنووری ئاژاوە کە مێژوویان بۆ سەلماندنی ڕاستی بیرکردنەوە کۆمەڵناسانە و مەبەستە سیاسییەکانیان لەسەدەی نۆزدە و بیستەمدا بەکار هێنا . ئەوبەسەرهاتەی کە "مێژوو نووسانی" سۆڤیەت بۆ مێژوو ، بەتایبەت "مێژووی ڕۆژهەڵات" و " مێژووی ئێران" و لەهەمووی خراپتر "مێژووی هەمدەمی ئێران" لەلایەن ایوانف و هاو نموونەکانییەوە دابین کرا ، وهایە کە هەستی نەیاری و نیفرەت سەبارەت بە مێژوو ، دەروونی خوێنەری تیژبین دەهروژێنێت .

بەگوێرەی بۆچوونی ئەوانە ، مرۆڤ لەدەهەزار ساڵی ڕابوردووەوە لەسەرتاسەری جیهاندا ناچار بوون بەشێوەیەک بژین وکار بکەن کە بڕیاری تێوری زانانی کۆڕ و کۆمەڵە نیونەتەوەکانی مارکسیزم پاسا بکەن ، تاکو بتووانن بەبێ شەرمەساری ئوردوگاکانی کاری زۆرەملی و بێسەروشوێن کردنە خوێناوییەکانیان پەرە پێبدەن و بە پێداویستییەکی مێژوویی بەخەڵکی بناسێنن .

چەنگیزخانیش کە لەدەسپێکی دەسەڵاتداریەتیدا پاڵی بەفێودالەکانەوە دابوو ، ڕێبواری ڕێگایەک بوو کە بەداگیرکردنی جیهان کۆتایی پێدەهات . . . هەوڵدان بۆ بەدەسهێنانی لەوەڕگای نوێش بزوێنەرێکی گرنگ بوداگیرکەری وڵاتانی دیکە بوو . . . (ئەم شێوە) بەبڕوای گەورە پیاوانی چوڵگەرد کە خاوەنی مەڕوماڵاتی گەورەبوون و بەگشتی سەرقاڵی ئاژەڵداری بوون ، گەلێک گرنگ بوو . (پطروشفسکی ، کشاورزی و مناسبات ارضی در ایران عهد مغول ، ل ٥٠ )

کەوتنە شوێنی ماتریالیزمی تارێخی ئەم پشکێنەرە مەزنەی مێژووی وا لێکردووە کە فێودالیزم بۆ نێوخێڵە چوڵگەردەکانی باکوور دەگوێزێتەوە ، هەرچەن لەکتێبەکەیدا هەوڵی زۆر ئەدا کە بیسەلمێنێت ، مەغولەکان سەرنجێکی وەهایان بۆ کشتوکاڵی زەوی نەبووە .

هیچ مێژوونووسێک ناتووانێ لەهەلومەرجی ئیستادا کە دادوەرە پایەبەرزەکانی زانکۆ ، وەکو سەردەمی دەسەڵاتداریەتی قەشەکان لە ئوروپا ، لەگەڵ مێژوونووسدا هەڵسوکەوت دەکەن ، (ئەنگیزاسیون) خزمەتی مێژوو بکەن .

**"اوربان** : پێداگرتنی مێژوونووسانی ئینگلیزی دەستی بەرچاوتەنگی و بەدگۆمانی هەڵبەستوان و چیرۆک نووسان وزاناکانی بەئاسانی لەپشتەوە بەستووە . لەم پێشبڕکیەدا ، مێژونووسی ئینگلیزی نارازی لەکاری ئەوانەی دیکە ، تەنیا بەشوێن توێیەکەدا ڕاناکات ، بەڵکو لاقی یاریوانەکەش دەکاتە ئامانج . نەتەنیا ڕەوشت سەرکەوتنەکانی بەرانبەرەکەی دەخاتە نێو کەوانی گۆمان و دوو دڵییەوە ، بەڵکوو لەشەرعییەتی ئەوەش دوودڵە و هەوڵی ئەوە ئەدات کەڕاست و ڕەواییەکەشی لێبستێنێت ، بەکورتی لەبنەوە لێ ئەدات . لەوانەیە ئەم توند و تیژییە خاوەنی بیر و باوەڕی ئایینیش (عقیدتی) بێت ، چوونکە مێژوو زۆرتر لە زانست و چیرۆکە خەیاڵییەکان مرۆڤ ئازار ئەدات .

**توین بی:** وەچەکانی پاش شەڕ لە ئیگلیزدا بڕوایەکی تەواویان بە پسپۆڕیەت و پیشەیی بوون هەیە و وەها تێدەگەیشتن کە ئەرکی نووسین کاری هونەرمەندانە ، نەوەک خەڵکی ئاسایی . لەهەمان حاڵیشدا دانیان بەوەدا دەنا کە پێداگرتن لەسەر پسپۆڕیەت ئەبێتە هۆی دوورکەوتنەوەیان لەخەڵک . خەڵکێک کە مێژوونووسان بەرواڵەت نیفرەتیان لێیان هەیە ، بەڵام ناتوانن بیاندوێنن چوونکە لەدەروونەوە دەزانن کە کە ئەگەر بریار وا بێت کە تەنیا بۆ یەکتر شت بنووسن ئیتر نرخ و ڕوومەتێکیان بەلای خەڵکەوە نامێنێت . بەڵام وشەی مێژوونووسی پسپۆڕ لەچ کاتێکەوە کەوتە سەرزاری خەڵک؟ ، لەوانەیە لەوکاتەوە کەمێژوو نووسین تەنیا لەدەس زانکۆکاندا بوو ، چوونکە تائەم دوایەش بەناوبانگترین مێژوو نووسانی بەریتانیایی کەسانێ بوون کە ئیستا وەکو کوڵی و سەرەتایی نێویان لێ دەبرێت .

من بینیومە لەبەر ئەوە "ورونیکا وج وود" هیچ کاتێک لەزانکو ماموستا نەبووە ڕەخنەیان گرتووە ، و ئەم قسەیە زۆر هیچ و پووچە . (آرنولد توین بی ، مورخ و تاریخ ، ترجمەی حسن کامشاد ص ٥١ و ٥٢)

**ئیستا "مێژوو"** کەوتووەتە گێژاوەیەک کە مێژوو نووسی پسپۆڕ و هونەرمەند ، دێرینە ناسان ، زمان ناسان و لێکوڵەرانی هونەر ، لەگەڵ خوانە ڕەنگینەکەیاندا هەڵخرێنراون ، بۆقووڵاییەکی پڕ لە دڵەڕاوکێ و نەناسراو کە تێدایە دەتلێنەوە . ئەوانە بەبێ ئەوە دەرفەتی هیچ جۆرە هێمنییەک بەچاودێران بدەن ، ماندوو نەناسانە بەداهێنان و خوڵقاندنی زمان ، هۆز نەتەوە ، شارستانییەتی گەورە پیاوان وگەورەژنان و هەروەها ژماردنی کەشتییەکان و ئەرابەکان ، ئەسپەکان ، تیرهاوێژەکان ، ڕێبواران (پیادەکان) ڕم بەدەستان ، ئەوەش بەژمارەیەکی خەیاڵاویەوە سەرقاڵن کە بەرهەمیان کۆمەڵێ ئەفسانەی لەڕادە بەدەری مێژووییە و هەموو نەتەوەکانی خرتایی زەوین لە بنیادنانی یەکسانی مێژوودا بەشدار دەکات ، چوونکە هیچ نەتەوەیەک بەبێ مێژوونووس و لێکوڵەری بەشە چکولەکانی

مێژوو نەماوەتەوە. ئەوەندە بەسە کە لە قوژبنێکی جەمسەری باکووردا ناڵە ئەسپێ بدوزرێتەوە، ئەوکاتە سەرتاسەری هەرێمەکە ئەبێتە لەوەڕگای ئەسپ و دانیشتووانی جەمسەری باکووریش بە پەروەردە کردنی ئەسپەوە لەجیهانی دێرینەدا دەناسێنن، "پەروەردەکەرانی بێوێنە"!.

بەڵام مێژوو، چپەیوەندییەکی بە هیچ کام لەم تۆڕهاتانەی پرفیسۆرە پایەبەرزەکانەوە نییە. هەوڵدانی ئیستای"مێژوونووسان" لەگۆڕەپانی شەڕێکی پڕلەتوند و تیژی دەچێ کە گلادیاتۆرەکانی کلوزئوم بەڕێوەی دەبەن شانۆیێکە لەململانێ تیوری مێژوو و بە ئامرازە هەمەجۆرەکان: یەکی تۆڕ دەخات، ئەوی دیکە بەڕم شەڕدەکات، سێهەمی بەخنجێر، چوارەمی بەشمشێر، پەنجەمی بەگورزوە... بەرهەمی پسپۆڕیەتی ئەوانە دارانەوەی شەڕکەرێک لە لایەنی بەرانبەر و گەوزاندنەوە لەخوێنی خۆیدایە کە وەکو ئەوی‌تر لەکەلکوەرگرتن لەئامرازە مێژووییەکەیدا شارەزا نەبووە.

بێگومان گەڕان بەدوای"چۆنیەتی مێژوو" لە"شتە مێژووییەکاندا"سەرلێشێواویە. بەساڵانە پسپوڕان بەپارێز و وردبینییە شایانی حوڕمەتەوە، بۆنموونە بەروکی مردوێەکی چەن هەزار ساڵەی مۆمیایی کراویان گرتووە و پرسیاری مێژوو چی‌یەی لێدەکەن و لەبەر ئەوە لەمردووە بەسەزمانەکە وڵامێک وەرناگرن، دەچنە سەروەختی ئەو قۆماشەی کە مردووەکەیان پێوە پێچاوە، دوایی ددانەکانی دەژمێرن، مێدالیاکەی لێدەکەنەوە، بەدوای مۆر و ئەنگوسەویلە تایبەتەکەیدا دەگەرن و دەس ئاخر ئەوەی کەماوەتەوە، بەمەبەستی تاقیکردنەوە روانەی لابراتواری دەکەن و بەهەڵسگاندن و تاقیکردنەوی "کیمیاوی" ئۆمێد دەکەن کە لە کۆتاییدا شتێک لە "مێژوو" ببیننەوە.

**"ئوربان** : خوێندنەوەی پەیتاپەیتای مێژوو بەگشتی وەکو کارخانەیەکی هەرەبەزی پێهاتووە نموونەکانی و رەوشتەکانی لە هەمە جوٚرە زانست وەرگرتووە، چ زانست بەگشتی و چ زانستی کۆمەڵایەتی. ئەڵبەتە گلە و گازندەی ئێوە لەم جوٚرە مێژووەیە. ئایا رۆژێک ئەبێ کە پشکێنەرانە لە کۆنە مشکەکانیان دەرکەون و مزاری مرۆڤایەتی بەچاوێکی کراوەتر- بۆ خوێنەر کەم خەمتر تماشا بکەن؟.

**نوین بی** : هونەری‌کردنی ئیکجار زۆری مێژوو، شوێنەواری زۆر ناحەز و ئیفلیج‌کەر لەسەر مێژوو نووس دادەنێ: هەرمێژوو نووسێک کە بیەوێ پانتایی خەباتی خوێ پەرە پێبدات، لەوە دەترسی، نەوەک ئەو زانایانە کە خاڵ و نیشانەی وردتر ئەبیننەوە، زەحمەتەکانیان بەبا بدەن و بیانخەنە دوورۆوە. کاتێ هەڵە و لادانەکانی

کەسێک، پەیتاپەیتا وەبیری بهێنیتەوە خۆباوەڕی و کەسایەتی دەروونی دەڕوخێت. شوێنەواری ناحەزی ئەم مژارە ئەوەیە کە خەڵک بەشێوەیەکی ئاسایی پلەی زانستی پسپۆڕانی خۆدی لەهەرێمەکەدا جێدی ناگرن. خەڵک وادەزانن کە ئەو کومەڵە بۆیەکتر شت دەنووسن، نەبۆ ئەوان کە بەشێک لە کۆمەڵگان، و نابی حێسابیان بۆبکرێت. لێرەدایە کە نووسەرانی عامەپەسەند هەنگاو بۆپێشەوە دەنن و دەنگی ئەو مێژوو نووسانە کە پێشەیان نووسینی مێژووە، بەرز ئەبێتەوە و هاوار دەکەن کە ئەمانە زانستی پێویستیان بۆ نووسین نییە و تەنیا بۆڕازی کردنی خاتری خوێنەر شت دەنووسن. ئێمە پێداویستیمان بەو مێشکانە هەیە کەڕادەی تێگەیشتنیان بەرز بێت و کاریگەرییان لەسەرخەڵکی ئاسایی و زیرک هەبێت. فرانسەوییەکان لەمبارەوە زۆرباشن. وەکو خۆیان ئەڵێن، کارە تەنزاوییەکانیان "عامیانە" زۆرجار باشترین و بەقیمەتترین کاری پشکێنەرنەی فرانسە پێکدەهێنن. بەڵام دوودڵم لەوەی ئیتر کاری بەمجۆرە بخولقێنن. بەرواڵەت فرانسەییەکانیش رێگای ئاڵمانی و ئامریکایی و ئینگلیسییەکانیان گرتووتە پێش. (آرنولد توین‌بی، مورخ و تاریخ، ترجمە حسن کامشاد، ل ٦٨ و ٦٩)

بەڵام ئایا مێژوو لە "بەشە مێژووییەکاندا" خۆی داشاردوە؟. ئایا مێژوو پەیوەندی بەشێوەی هاتنی هەلاکو خان بۆ بەغداد، ژمارەی برینەکانی لەشی سێزار لەسێنای ڕۆمدا، ئاگر تێبەردانی تەخت جەمشید لەلایەن ئەویندارەکەی ئەسکەندەرەوە (!)، هێرشی خەشایارشاه بۆ سەرئاتێن، یان شۆڕشی جووتیارانی چینەوە هەیە؟. ئایا دووپاتکردنەوەی هەزاران جارەی ئەم ڕووداوانە بەهەزاران پەسن و لێکدانەوەی جۆراوجۆرەوە، مێژوو دەخولقێنی، یان ڕوشنی دەکاتەوە؟.

ئایامێژوو دەسکری دەستی پاڵەوانان، خوداوەندان، پەیغامبەران، گرسەی خەڵک، شەرکەرەکان، فیلسوفان و هونەرمەندانە، یان بەرهەمی بیت و بەرکەتی مزگەوت وکلیساکان؟. هیچکام لەمانە! چوونکە هەمووی ئەوانە تەنیا بەبۆنەی هەبونیان لەمێژوودا، "مێژوویین" و هەمووی ئەوانە بەبێ "حاڵ وهەوایکی" مێژوویی بەئاسانی لە پانتایی مێژوودا ڕاودەنرێن و لەبێ ناوییشانیدا بزر دەبن. هەرچەن هەموو ئەو کەرسە و بەڵگەنامانە یارمەتیدەری مێژوونووسن، چونکە بۆ دۆزینەوەی بەنرخی یان بێنرخی هەر نووسراوەیەک، یەکەم جار ئەبێ بخوینرێتەوە، بەڵام هیچ کام لەوانە خۆبەخو مێژوو نین و وڵامێک بۆ پرسیاری سەرسەختی "مێژووچی‌یە" نابیننەوە. کەوابوو پێویستە "مێژوو" پێش لە بەڵگەنامە و بەش و شوێنەوارەکانی تری دروست بووبێ.

مێژوو بوونەوەرێکی (پازل؟) پژوبڵاو نی‌یە تا بەگەڕان بەدوای لەت و پارەکانیدا و دوزینەوەیان دیسانەوە ساغ بکرێتەوە. مێژوو بوونەوەرێکی دروستکراوە کە لە دەزگای ڕووداوە مێژووییەکاندا

دابەش بووە، بوونەوەرێک کەوێنەی ساکاری بلیمەت و پلانەجۆراوجۆرەکانی مرۆڤ بەهاودەق بوونی لەگەڵ هەلومەرجەهەرێمییەکاندا لەنێو دڵیدا دەژیت.

بۆنموونەکەسێ وتوویە لەسەرهەڵدانی مرۆڤەوە تا داهێنانی پیتی نووسین، پێ‌یێژین"پێش لەمێژوو" ئەم پەسنە زۆر بێ‌سەرنج و بێ‌ناوەرۆکە. چوونکە لەئافریقادا کە کۆنترین (هۆمیند؟) و کۆنترین ئامرازمان دۆزیوەتەوە، پەسنی سەرەوە زۆر ...ەی لێ‌ئەبێتەوە، تائەو ڕادەیە کە کۆمەڵگای ئافریقای پێکهێنەری یەکەمین ئامرازی کار، بەهۆی بێبەری‌بوون لە پیتی نووسین دەکەوێتە دەرەوەی مێژوو، بەڵام میسرمان بەبۆنەی پێکهێنانی پیتی هیروگلیفەوە، هێناوەتە نێو مێژووی سینما. پەسنی دۆرست‌تر، هەرهۆز و نەتەوەیێک کە بەرهەم بەدەست دەخات، دێتە نێو مێژووەوە. وەستاکاری کە گۆزەیەکی چکۆڵەی گڵین دەخوڵقێنی لەگەڵ مێژوو و پێداویستییەکانی ژیاندا تێکڵاو دەبێت و ئەگەر لەسەر هەمان گۆزەی دەسکرد کۆنگەرەیێک، یان چەن هێڵی هاودەق و خواروژوور و یەکبڕ هەڵکەندرێت، لەو ڕێگاوە هەبوونی خۆی ڕادەگەیەنی و بە پیتێ کە خۆێ دەیزانی و جەوهەرەکەی لەمێشکیدا ڕاگرتبوو، لەگەڵ مێژوودا دەدوێ. دادوەرانە نی‌یە کە نەزانینی ئیستای ئێمە خەباتی ئەو وەستاکارە، بۆ ڕاگەیاندنی هەبوونی خۆێ لەمێژوودا ڕەت بکاتەوە. وادەزانم باشترین ڕێگای ڕۆشن‌کردنەوەی مێژوو دەرچوون لەو چوارچێوەیە.

ئیستا کەدێرینەناسینی ژیاری گیانداران باوە و بۆناسینی هەلومەرجی کۆمەڵە سەرەتاییەکان، دیسان دەیانبووژێننەوە و تاقیان دەکەنەوە. بۆ نموونە بەردە چەخماخێک بەچەن تۆڵاش و تەڵیزم دابەش دەکرێت و بەپەیڕو کردنی شێوە کۆنەکەی چەن ئامرازێکی لێ دۆرست دەبێ‌تا ڕۆشن ببێتەوە کە دۆرستکرنی ئامێرێک بەچەن زەختی چەکۆشی وەستاکاری ئەوسەردەمەکۆنە دۆرستکراوە. ڕێگای ناسینی چۆنیەتی مێژوو، هاتنەناولە"درگای" مێژووەوەیە ونەقشی یەکەمین گرووپی مرۆڤ لە هەلومەرجە جۆربەجۆرەکان مێژوودا یاری بکەین، بینە نێو مێژووەوە و بە شێوەی سۆرشتی ڕۆشنی بکەینەوە کە تایبەتمەندی هەرێمی تاقیکردنەوەکە لەگەڵ کام ڕەوشتی بەڕێوەبەری، سوودبردن لەزەوی و درێژە پێدانی ژیان و گەشەکردندا سازگارە.

ناسین بریتیە لە بەڕێوەبەری شیاوی، ناسینی بنەماکانی مێژووی فلان هۆز و بیسار هەلو

مەرجە، چوونکە ئاگامان لەوە هەیە کە ڕچەیّ مرۆڤ هەر لەکۆنەوە لە دەرفەتە جۆغرافیە جۆراو-جۆرەکانی جیهاندا دیارە و چەن شێوەیی مێژوو نیشانی ئەدات کە مرۆڤ لە هەر جۆغرافیایە-کدا، تەنیا توانیویە "مێژووی" تایبەتی هەمان جۆغرافیا بخوڵقێنی. ئەگەر نموونەی مێژوویی سەروە تەنیا لەگەڵ یەک هەرێمی جۆغرافیاییدا هاودەق بکەین، بێگومان لەدایکبوونی مێژوومان لە زکی جۆغرافیادا سەلماندووە و بۆ پرسیاری پێداگر و بیانووگیری "مێژوو چییە" وڵامێکمان دیتوەتەوە. مێژووی ڕوون کردنەوە تەنیا ڕەوشت و تەنیا بەڕێوەبەری شیاو و لەبەردەستایە کە بۆ ڕێکخستنی بەرهەم و درێژە پێدانی سۆرشتی لە هەرجۆغرافیایەکدایە کە بیری لێ بکەینەوە و لەبەر ئەوە کە زەوی شوێنی ڕەسەن و ڕاستەقینەیّ بەرهەم بووە، **دەی! مێژوو لە زەویەوە ڕوواوە و وەکو هەر ڕووەکێکی دیکە خەڵکی هەرێمەکەی خۆیەتی.**

**جوغرافیایّ کۆڵنەدەر (جۆغرافیای بێ مێژوو)**

پێویستە لەخۆمان پرسیار بکەین، بۆچی دانیشتووانی ئالاسکا، ئامازۆن، بوشمەنەکان، گریشمەنەکان، دانیشتووانی دارستانە دەق نەشێواوەکانی نیوە پارزەمینی هێندوستان، ئازبەتەکانی ئەندونوزیا و یا هەر خاڵێکی جۆغرافیایی دیکە، کە مرۆڤ دەسەڵاتی بەسەر دەقە سۆرشتییەکەیدا نییە، مێژووی نیّیە؟ وڵام ئەمەیە، لەودۆخەدا سنوری دەسەڵات و پیداویستی، سۆرشت دابینی دەکات، نە داسەپاندنی ئیرادە و دەسەڵاتی مرۆڤ. بۆنموونە ساڵژمێری ئسکیمو-وەکان بریتییە لە سیّ لاپەڕە. ڕۆژێک بێ‌نەچیر، ڕۆژێک کەم‌نەچیر و ڕۆژێکیش بەنەچیری باشەوە. ئەم ساڵژمیرە سیّ ڕۆژیە، بەدرێژایی حەفتە و مانگ و ساڵ و سەدە ودەیان هەزارساڵ و تاکاتی سەرهەڵدانیان لە زەمەندا، دووپات بووەتەوە. سەرکەوتن بەسەر گەشەکردنی مشەخوارانەیّ ڕووەک، مێروو، بارانە وەرزییەکان وکۆمەڵی بێ‌ئەژماری گیان لەبەران لە ئامازون و بەشی زۆری ئافریقاشدا پێک نەهاتووە، کەوابوو لەم جۆغرافیاشدا هیچ بەڕێوەبەرییەک ناگاتە بەرهەم و هیچ مێژوویەک نانووسرێت، چوونکە لە جۆغرافیایەکدا کە بەبوّنەیّ جۆرواجۆرەوە، زاڵبوون بەسەر سرۆشت و گەڵاڵە دارشتن بۆ بەرهەم مەیسوور نییە، ڕێکخستنی مێژوویش نامە یسوورە. نموونەیّ ئیسکیمووەکان باشترین نموونەیە بۆ کاریگەری جۆغرافیا بەسەر مێژوو و

بەسەر پێشکەوتندا . ئەو جوگرافیادا کە خاکی پێویست دەس ناکەوێ و بەهوێ سەرما و سوڵەوە گڵیش دەبێەستێت ، ئیسکیمووەکان لە هەرجوورە سواڵەتێک بێبەرین ، بەڵام دەتوانن لەپارچە سەهوڵ خانوو ساز بکەن .

## بەم جوورە چوونە ژوورەوەی مرۆڤ بوناو مێژوو، پەیتاپەیتا بە ڕادەێ دەرفەتی جوگرافیاوە پەیوەندی هەیە.

ئەگەر هێشتا ژمارەیەک کومەڵگای مرۆڤی بێبەری لە مێژوو لەدنیادا پێش چاو دەکەوێ ، هەمووی ئەوانە لە جوگرافییەکی کونترۆڵ نەکراودا دەبینین ، و بێهیچ ململانیەک ئاشکرا دەبێت کە هوکاری سەرەکی مێژوو ، ئەو پێداویستییانەیە کە جوگرافیا بو سوود وەرگرتن دابینی دەکات و بەڕێوەبەرێکی تایبەتە کە لە هەر جوگرافیایەکدا ئەم سوود وەرگرتنە ڕێک دەخات . بەڕێوەبەرانی تایبەتی لەهەر جوگرافیا و دەروبەری پەیوەندیدار لەگەڵیدا ، مێژووی تایبەتی هەر هەرێم و هوزێکی دانیشتووی ئەو هەرێمە لەگەڵ شیوەی سوود وەرگرتن لەو جوگرافیایەی کەبناغەکەی دارشتووە ، هاودەقە . بەڕێوەبەرایەتییەک کە لەگەڵ بەڕێوەبەی مێژوو پێکهێنەری هوزێکی دیکە ، لەجوگرافیایەکی دیکەدا ، لەبناغەوە جیاوازە .

## جوگرافیای شیاو (جوگرافیای گەشەکردن)

لەم جوگرافیادا باران و وەرزەکانی ساڵ ڕێکوپێکن ، ئەندازیاری زەوی تووشی کەمترین خەسار ئەبێ و پانتایی پێویستی هەیە . رووباری هێمن و پڕئاو ئەبێتە هوێ پێکهاتنی تۆڕی ئاودێری و هێڵی گواستنە ، پلەێ گەرما دۆخی شیاو بو وەرزەکانی ساڵ دەخولقێنێ و هاوتایی لەنێوان گوڵ و گیا و ژمارەێ گیاندارانداا دۆرست دەکات . مرۆڤێک کە لەم جوگرافیاد سەرهەڵ ئەدات ، یان کوچبەری وەها شوێنێک دەبێ ، کێشەێ هەڵبژاردنی نیيە . مەرجی سۆرشتی شیاو ، ڕێکخستنی سوود بردن لەسۆرشت و دوایی بەرهەمهێنانی بو ئاسان دەکات . پەیوەندی ژن‌وشوویی و زاوزێ بەهوێ هاوئاهەنگی سامانی سۆرشتی و نەبوونی کێشەێ قاتی و قری درێژخایەن ، گەرما و سەرماێ لەڕادە بەدەر ، هێرشی گیان‌لەبەرانی توقێنەر و هیتر . . گەشەپێدانی کومەڵە سەرەتاییەکان بەتوندی پاڵی پێوە دەنێ . ئاسان‌بوونی بەدەست‌خستنی پێداویستییە سەرەتاییەکان ، سنووری

پشو و حەوانەیّ مرۆڤ بەربلاوتر دەکات و هێمنیەکی گشتی بەبووژانەوەیّ بیروباوەڕی ئەدات. پانتایی بەربلاویی هەرێمی شیاو و پێش‌بەچوونی دەروونی، هیچ کێشەیەک بۆ هاتنی کۆمەلانی تازە ساز ناکات و تیّهەلچوونی ڕوخێنەر بو نیشتەجیّکردن، کە ئەبێتە هوّیّ توانەوەیّ پاشەکەوتەکانی کۆمەلّ، لەوّ هەرێمە کە باسی‌لێدەکەین، پێویست نی‌یە.

یەکەمین کۆمەلّی مرۆڤ لەم جوّغرافیادا، بەرێژەیّ پێداویستی و توانایی و ژمارەیّ خوّیّ، سنوورێک هەلدەبژێرێت و لەویّ نیشتەجیّ دەبێت. کۆمەلّی دووهەم بەبوّنەیّ ڕوانگەیّ هەبوونی فراوانی و دەولەمەندی هەرێمەکە، دوور لەهەر جوّرە کێشەو بەرچاوتەنگییەک ئوزیّ دوورتر، سنوورێکی دیکە بوّخوّیّ هەلدەبژێرێت و بەم‌جوّرە لەنێوان هەزاران سالدا ناوەندگەلی تازە لە ئاوەدانیگەلی تازە بەدانیشتووانی زوّرەوە، لەهەرێمەکە سەرهەلّ ئەدەن کە لەشوێنە دوورو نزیکەکانی دەورویەرەوە کوّچبەر بوونە و بەبیّ تیّهەلچوون و ململانیّ لەگەلّ پێشەنگەکاندا شوێنی خوّیان هەلدەبژێرن و گەشەی تێدا دەکەن.

هوّکاری گەشەکردنی بەشی هەرە زوّری دانیشتووان، زوّر بوونی دەروونی ڕێژەیّ ژمارە و شینایی ئەوانەیە کە ئاکامی زاوزیّ لەسنوورێکی دیاریکراودایە و جوّغرافیاکەیّ تا سنووری بەیەک گەیشتنی ئاوەدانییەکانی دراوسیّ پەرە دەستێنیّ. لەم قوّناخەدا چەندی و چونی گەشەکردن بوّباری چەندی و چونی دەرونی و ئەستونی دەگوّردرێت و ئەبێتە هوّیّ باشتربوونی ناوەروّکی شێوەیّ سوود وەرگرتن لەبەرهەم و ئامرازی بەرهەم‌هێنان. بەسەرهاتی جوّغرافیایەکی سنووردارو دیاریکراو بەرێژەیّ پانتاییەکەی، لەنێوان چەن ئاوەدانی بەتەواوی پەرەسەندوو وهاوسنووردا دابەش دەکرێت و لەهەرێمێکی دیاریکراو و خاوەن پەیوەندیی دەروونی و هاوبەشییە ئاشتی‌خوازانە دەرەوەییە-کانیدا، ولاتێک پێکهاتوو لە کوّمەلّی ئوّستانی جوّراوّجوّر سەر هەلّ ئەدات. هەر ئوستانانێک، لەهەمان حالدا کە پەیوەندییە فیدراتیڤەکەیّ بەرانبەر بە دراوسیّەکانی دیکە دەپارێزێت، لەئابووری، سیاسەت و فەرهەنگی خوّیدا سەربەخوّ و لە پێکهاتەیّ دەسەلاتداریەتی ناوەندیدا، بەرادەیّ دەسەلاتی ئابووری و زوّری ژمارەیّ دانیشتووانەکەیەوە هاوبەشی دەکات. سنووری ئەم پێکهاتەیە لەگەلّ هاو نموونە دراوّسیەکانیدا، بەربەندە سوّرشتییەکان: چیاکان، ڕووبارە

پڕئاوەکان، دریاچە، شیو و دۆڵ و دارستانە چڕوپڕەکان دیاری دەکات. هەموو وڵاتە پێشکەوتووەکانی ئیستای جیهان، وەکو نموونەی ژاپۆن، چین، بەشێک لە هیند، چەند بەش لەڕوسیای ناوەڕاست وسەرتاسەری ئوروپای ڕۆژئاوا، لەبەر ئەوەی کە لە جوگرافیایەکی یەکدەستدا هەڵکەوتوون، ئیستاکە لە سیستەمی یەکدەستی ئابووریی، سیاسی و فەرهەنگی پەیڕەوی دەکەن. کۆڵەکەکانی ئەم سیستەمە لەسەر بنەمای کویلەداری ئارزوومەندانە و بێ تێهەڵچوون و ململانێ، لە جوگرافیایەکی هێمن و چوارچێوەی بەڕێوەبەری ئاوەدانییە سەرەتاییەکاندا دانراوە و ئیستا سوودی لێئەبەن. دابەش کردنی هەروڵاتێک بەچەن ئۆستانی سەربەخۆ و پردەسەڵات، لە دوا توژینەوەدا، واتای دابەش کردنی ئەو وڵاتە لە نێوان یەکەمین ئاوەدانییەکانی مرۆڤی نیشتەجێ لەو جوغرافیا و گەشەکردنی بنەماڵەکان لەقۆناخەکانی دواییدایە.
ئیستا سەرتاسەری ئوروپا لەنێوان بنەماڵە پەرەسەندوە سەرەتاییەکاندا دابەشکراوە کە ناوبانگی جۆراجۆر وەکو: دوکەکان، لۆردەکان، بارۆنەکان، کۆنتەکان، سینۆرەکانیان هەیە. هەندێ لەم بنەماڵانە دەتوانن وێنەی کۆنترین باب و باپیرانیان وەکو شەجەرە نامە لەسەرڕێگا و بان و داڵانی کۆشکە پرژمارەکانیاندا، تاقووڵایی مێژوو هەڵواسن. بەم جۆرە جوگرافیایەکی هێمن دەرفەتی هەلبژاردنێکی بێململانی، تاسەردەمێکی دوور و درێژ بۆ دانیشتووانە ڕەسەن و کۆچبەرەکان ڕەخساند، نەلەبەر ئەوە کە تووی "بەرە لەشوێن‌یەکەکانی گەورەپیاوان"، بەدەسەڵات، بنچکدار و تێکنەچووی ئوروپایی و هەرێمە هاونموونەکانی لەسەدەکانی هەرەکۆنەوە بگرسێ، بەڵکو بۆ ئەوە کە ئەم جوگرافیایە یەکەم پرنسیبی ڕیزگرتن لە سامان، پێداویستی هاریکاری سیاسی و هەروەها سەربەخویی فەرهەنگی بەسەر بەڕێوەبەرە سەرەتاییەکاندا داسەپاند.
لەم جوگرافیادا دەسکەوتە ئابوورییەکان جێگای ریز و ڕوومەتە و دڵنیایی ئابووری لە بناغە پەسەندکراوە گشتییەکانن. هاریکاری سیاسی بەواتای بەشداری‌کردن لەدەسەڵاتی ناوەندیدا، بەڕادەی توانایی بەرهەم لەهەر یەکەیەکی گەشەکردووی ژمارەیی و فەرهەنگیدا، یاسامەندە.
بەم جۆرە جوگرافیای هێمن تایبەتمەندی خۆی کە ڕێکوپێکی، فراوانی و یاسامەندییە، بۆ دانیشتووان و ڕێکخەرانی سەرەتایی خۆی دەگویزێتەوە. لەقوناخی دواییدا، گرسەی کوچبەرانی

بێبەشی باکووری ، کە مێژووی ئوروپا بە هۆ و بێشارستانییەتیان دەزانێ ، سەرەڕای پلامار و خوێن ڕشتنی زۆر ، نەیانتووانی بەسەر ئەوکۆمەڵە گەشەکردوو و دەسەڵاتدارەێ پێشوودا سەرکەون و بەپێچەوانەشەوە ، هێرشەکانیان بوو بە هۆێ یەکگرتوویی نەتەوەیی هۆزەکانی باشوور .

دووا کۆچبەرانی ئیسلاڤ لەباکووری ئاڵمان و قەراخەکانی دەریای بالتیکدا کۆبوونەوە کە ئیستاش بەگشتی شانازی بەباب و باپیرە شەڕاشۆکانیانەوە دەکەنو بە دامەرزاندنی سەرزەوینی یوگوسلاڤیا (ئیسلاڤی باشوور) لە ناوچەێ باکووری ئوروپادا ، بەڕۆشنی ڕاێانگەیاند کە ئوروپای باشوور نەتەنیا زەرفییەتی تازەێ بۆ کۆچبەرەکانی باکوور نییە ، بەڵکو ئامادەێ داگیرکردنیش نییە . تەنیا لەئەم سەردەمەدا بوو کە هۆزە باکوورییەکان ئامادەکارییان بۆ پێکهێنانی دەوڵەت ناوچەییەکان لە ئیسکاندیناڤیا ، ئوروپای باکوور و روسیادا دەس پێکرد . ئیمپراتوری روسیا کەمترلە ٦٠٠ ساڵ پێشتر و پاش پشتگوێ خستنی ئاواتی داگیرکردنی باشوور خۆێ ڕێکخست ولەگەڵ پێکهاتنی ئامریکادا تاڕادەیەک هاوتەمەنە .

## جۆغرافیاێ ناڕێک (جۆغرافیای کێشەدار)

لەوانەیە وابزانین کە سەرەتاییترین یەکەێ مرۆڤی نیشتەجێ لە جۆغرافیایەکی دیکە ، لە جۆغرافیای کێشەداردا سەر هەڵ ئەدات ، یان کۆچبەری ئەوشوێنە دەبن . لەم جۆغرافیادا دەشتگەلی پانوبەرین و رووباری هێمن و پڕئاو کە ئامادەیی مێوانداری بێکێشەێ گرووپی پڕژمارەێ لە قەراخەکانی خوێدا هەبێ ، بەرچاو ناکەوێ . لەم جۆغرافیادا وەرزەکانی ساڵ تێکڵاو و زەوی پڕە لە تەپۆڵکە و بەرزی نزمی . هەربەوسانە بەفر و بارانیش لەکاتی خۆێدا ناباریێ و ئەوەش کە دەباری بەشێوەی باریکە ئاوێکی کۆرت لەڕۆگەێ شیو و دۆڵە بێژمارەکاندا ئەکەوێتە ڕێ و لافاوێکی کاولکەر و بێبەرهەم پێکدەهێنی کە بۆ دانیشتووانە کەێ هیچ کەڵکێکی نییە . هەر ئاوەدانییەک لە سنوورێکدا کۆئەبنەوە و دادەمەرزێن کە بتووانن ئاوی پێویست لە پاشەکەوتی ژێرزەوینی ، کانیئاو ، گۆماو و ڕووبارە وەرزییەکان هەڵبگوێزن . هەربەو جۆرە کە ئاماژم پێدا ، ئەم جۆغرافیایە توانایی مێوانداری گرووپی گەورە و قەرەباڵخی لەکۆچبەرەکان نییە و ئەوێبەری دەتووانن دانیشتووانی گۆندێک پێک بهێنن . لە گەڕان و بەدوواچوونی دوواییدا ، شوێنێکی شیاو بۆ نیشتەجێبوون دەبیننەوە ولەوێ دادەمەرزێن .

هۆکاری کۆچبەربوون تەنیا لە ئاکامی زۆربوونی شینایی (ژمارە) وکەم بوونی بەهرەمەندی زەوی ناکەوێتەوە، بەڵکو لە نەشیاوی جوغرافیا، هووشکەساڵی، نەخۆشینی کشتوکاڵ، لافاو، بومەلەرزە وکەم‌بوونی سەرچاوەکانی ئاویش سەرهەڵ ئەدا. بەم‌جۆرە جوغرافیای دیاریکراو داگیردەکرێت و نێوانیان، نێوانی جوغرافیایەکی شیاو، بەڵام بچوک، تایەکەیەکی جوغرافی شیاو وبچوکی دیکەیە. کەم‌وکوڕی پێداویستییەکان لەوەها هەرێمێکدا، ئەندامان ناچار دەکات کە بەدوایٚ ژینگەیەکی شیاوتردا بگەڕن. ئەم پروسەیە زۆرجاربە تێکهەڵچوونێکی بەپەلە و داکۆکییەکی بێوچان بۆ ڕێکخستنی ناوەندی کۆمەڵەکە، ئەبێتە کارێکی پێویست. لەبەرئەوی کە ناکوکی ڕواڵەتی زەوی، وکەم وکووڕی ئاوٚ، کەڵکوەرگرتن و دابەش کردنی دادوەرانەی زەوی پێویسیە، کەسایەتییەک لە بنەماڵەیەکەوە هەڵ‌ئەکەویٚ کە پڕهێزترین، زاناترین، پرئازمونترین و تەبانەت داگیرترین کەسایەتییە و هەموو بوون و نەبوونی کومەڵەکە، دەهێنێتە ژێردەسەڵاتی خوٚی، تا بوٚئامانجی ڕێکوپێکی، و درێژەپێدانی پروٚسەیٚ بەرهەمهێنان، دابەشکردنی بیٚکێشەیٚ سەرچاوە سنووردارەکان بەکاری بهێنیٚ. و بەم‌جوٚرە بەڕێوەبەری بەکومەڵ بوٚ شێوەی دەسەڵاتداری تاقەکەس دەگوٚڕدرێت. بەوڕادەیە کە ئامادەکاری بوٚداکوٚکی لەپێداویستی، یەکە جیٚ‌گیربووەکانی ناوەندە جوغرافیەکە پەلاماردانیش بوٚیەکە سەرلیٚ‌شێواوەکان کە سنووری شیاو بوٚ نیشتەجیٚ‌بوون نابیننەوە، تەنیا شێوەیٚ بەدەسهێنانی ئەو سنوورەیە. خاڵی کوٚتایی ئەپروسە ناسوٚرشتیی وبەربەندکراوە، داگیرکردنی سنووری دراوسیەکانی یەکەیەک لە پرهێزترین یەکەکانە کە بوٚ کوٚکردنەوەیٚ هەمووی ئەوانە وکو خێڵێک، دووایی وەکو هوٚزێک، بوٚڕێکخستنی داکوٚکی بەکوٚمەڵ و دابەش‌کردنی گشتی سەرچاوەکان پێویستە. بەم‌جوٚرە تاقەکەس کە پێشتر گەیشتبووە پلەی سەرەوەیٚ بنەماڵەکەیٚ، لە ململانێیەکی بیٚ‌وچاندا ئەبێتە سەروٚک خێڵ و لەکوٚتاییدا سەروٚک هوٚز.

دەسەڵاتداری تاقەکەس بوٚخوٚپاراستن و ئاسایش دەکەوێتە جموجوڵ و لەقوٚناخی دووایدا، لەگەڵ دراوسیٚ و سەزەوییەکانی دیکەدا دەکەوێتە ململانیٚ. بەئامانجی داسەپاندنی دەسەڵات ەبەرهەمی ئەو ململانێیەیە، هەرکوٚمەڵیٚ لە چوارگوٚشەیٚ جیهانی کوٚندا کە ملی بوٚدەسەڵاتی ئەوتاقەکەسە دانەنواندووە لەناخی خوٚیدا مەترسیێکە کە هەڕەشە لەئاسایشی تاقەکەسە دەسەڵاتدارەکە دەکات. بەم‌جوٚرەیە کە کورش لەنێوان ماسازتەکاندا، کەمبوجیە لەمیسردا، داریوش

لەرێگای هیندوستان و خشایار شاە لەیونادا دەبینینەوە و بەمجۆرە دسپوتیسم لەدایک دەبێ ١ .

"کورش منم پادشای جیهان، پادشای مەزن، پادشای بەهێز، پادشاێ بابل، پادشاێ سومەر و ئەکەد، پادشای چوارگوشەی جێهان، کوڕی کەمبوجیە، پادشاێ مەزن، پادشاێ ئانشان، نەوەێ کورش، پادشاێ مەزن، پادشای ئانشان، نەبیرەێ چیش پیش ، پادشای مەزن، پادشای ئانشان"(فرمان کورش بزرگ، عبدالمجید ارفعی ل١٧)

"داریوش شاە ئەڵی: ئەمە ئەوٚ وڵاتانەیە کە بوون بە هی من: بەئیرادەێ ئەهورا مەزدا من شاێ ئەوانە بووم. پارس، ئیلام، بابوٚل، ئاشور، عارەب، میسر، خەڵکی دەریا، سارد، یونان، مێدیا، ئەرمەنستان، کەپوکیە، پارت، زرنگ، هەرات، خوارەزم، باختەر، سەغد، گندار، سگ، ڕەخج، مەک: بەگشتی ٢٢ وڵات" : (بند٦ از ستون اول کتیبەی داریوش در بیستون.. .خوداوندی مەزنە ئەهورامەزدا کەمەزنترین خوداڵیانە کە ئەم زەوینەێ ئافراند، کە ئەوٚ ئاسمانەێ ئافراند، کە خەڵکی ئافراند، کە بوٚ خەڵک شادی ئافراند، خەشایارشاێ کردە شاە، تاقە شاهی شاهانی زوٚر، تاقە فرمانڕەواێ گەلێک فرمانڕەوا، من خەشایار شام، پادشاێ مەزن پادشاێ پادشایان، پادشاێ وڵاتانی خاوەن نەتەوەێ زوٚر، پادشا لەم سەرزەوینە دوور و درێژەدا، کوڕی داریوش پادشاێ هخامەنشی. (بندهای ١و٢ ازکتیبەی خشایار شاە بردامنە الوند)

ئەمە وێنەێ ئەنجامی داگیرکەرییە و ساتێکە کە داگیرکەر هەست بەئاسایش و خاترجەمی دەکات. جوٚغرافیاێ کێشەدار بوٚ بەڕێوەبەری تایبەتی هەرێمی خوٚدی، ڕێگەیێک جیا بوٚ خاڵی کوٚتایی ململانی هە میشەیی ناخاتە پێشدەس.

١ـ لەوانەیە ووردبوونەوی لەباسەکانی دوایی ئەم کتێبە خوێنەر وەها تێبگەیەنێ کە داگیرکردنی ئێران لەلایەن هخامەنشییەکانەوە ئاکامی توٚژینەوەیەکی مێژوویی بووە بەلام ئەبێ سەرنجی ئەو ڕاستییە بدەین کەهخامەنشییەکان ، دسپوتیسم، کەشیوەیەکی ناوچەیی دەربازبوون لەمێژووە و دەێتووانی شێوەی دەربازبونی هخامەنشییەکان و هەندێ لەناوچەکانی دیکەێ ئێران بێت، بوٚ سەرتاسەری ئێران هینوستان، ئێوان دوو ڕووبار(مێزوپوٚتامیا)، ئاسیای ناوین، میسر، ئاسیای بچووک و یونان بەکاریان برد. ئەم ئاڵامەتە مێژووییە بەهوٚێ داسەپاندنی ١٢ سەدەیی پەیتا پەیتای لەمێژووی ئێران و ڕوٚژهەڵاتی ناوڕاستدا مایەوە و سەرەڕاێ خەباتی ناوچەیی فراوان بوٚ دەرچوون لە بڕیارەکانی، بەتایبەت لەلایەن هوٚزەکانی نیشتەجێ لەکەنارەکانی دەریاێ خەزەر، ئازربایجان، کوردستان و خوزستانەوە، کە خاوەنی جوٚغرافیایەکی هێمنترن، دیسانەوە لەبەر داگیرکردنی بێوچانی ئیران لەلایەن هوٚزە گەروک و نەیارەکانی دوواییەوە وەکو ئەشکانییەکان، ساسانییەکان، عارەبەکان ، توٚرکەکانی سەلجوقی، غەزنەوی، مەغول، قاجار و هیتر، کە گشتەکەیان لەجوٚغرافیایەکی کێشەدارەوە هاتبوون، ئەم پرسە نەتەوەییە چارەسەر نەکرا و من (نووسەر) ئومێدی زوٚر ئەکەم کە لەداهاتووی نەفرە دووردا کەمێژوو بوٚ ڕێگای سوٚرشتییەکەێ بگەڕێتەوە، واتا بوٚڕێگایەک کە لەدەسپێکی دەسەڵاتداری هخامەنشییەکاندا لایدابوو. ئەم کتێبەش بەهیواێ ئامادەبو ونی بیروڕاێ ئێرانییە ڕاستقینەکان و دانیشتووانی ڕەسەنی ئەم سەرزەوییە ئەرکی خوێ بەجێ بهێنێ و بەیارمەتی نەوەکانی نوێ و سەرەڕاێ گشت بەربەندە مێژووییەکان، لەسەر ناسنامە و فەرهەنگی نەتەوەییمان پێدادەگرین.

دەسەڵاتداری دسپوتیست , کاریگەرترین چەکی خۆیَ دژی نەتەوە ملکەچ کراوەکان بەکار دەهێنیَ هەموو پێداویستییە ئابوورییەکان ، ماف و خاوەندیەتی سامانی هەموو سەرزەوییە داگیرکراوەکان ، وەکو زەویی ,کێڵگە ، لەوەڕگا ، ئەسپە تیژڕەوەکان ، ڕان و ڕووگی فراوان ، باخ ، ژنانی جوان و شۆخ و شەنگ و هەموو ئەوسەرچاوە ئاوانە کەلەڕوبەری زەویدا ڕەوانن . ئەبیَ بەماڵی دەسەڵاتداری داگیرکەر ، دەسەڵاتدارێک کە ئەوانەیَ بەزەختی شمشێر لەخاوەنەکانی سەندووە . دەسەڵاتداری داگیرکەر پاش بەدەس خستنی ئەوانە بەشێکی لەنێوان خزمەتکارەکان و یارمەتیدەرانیدا بەمەیلی خۆیَ دابەش دەکات و شێوەیَ بەرهەمهێنانی گشتی کە شێوەیەکی سەقام گرتوو و ئازادە ، بۆشێوەیَ بەرهەمهێنانی کاتی" تیول" دەگۆردرێت .

داریوش شاە دەڵیَ: لەم وڵاتانە هەر زەلامێک کە بەوەفا بوو باش ڕیزی دەگرم . ئەوەی کە وەفایَ نەبیَ بەسەختی سزایَ ئەدەم . (بند ۸ ازستون اول کتیبە داریوش در بیستون)

بەڵام ئەوەی کە سەروکی دسپوتیستی جوغرافیایَ کێشەدار بە کەرەمی خوَدایَ گەورەیَ دەزانیَ ، دانیشتووان و سەروکەکانی جوغرافیایَ هێمن ، بە یاسایَ دارستانی و بەربەرییەتی دەزانن .

مروڤ لەیوناندا بەرادەیەک ئازاد بووکە لەسەر بناغەیَ ئەوە بتووانیَ لەگۆرەپانی ڕامیاری و بیر و بوچوندا جموجووڵ بکات . بەڵام لە قراڵیەتی هخامەنشییەکان و لەپاڵ نێوی پادشاکانی ئەم زنجیرەدا ، ئێمە تەنیا لەحاڵ و وەزعی چەن کەسایەتی لە هاوڕێان و دۆستەکانیان ئاگادار دەبین . . .

پارسەکان لەلایَ یونانییەکان ,کەبریَ جار بەمێدیاکان بەناوبانگ بوون ، زیاتر لە توقێنەر و خوێن ڕێژ نێویان نەبوو . یونانییەکان لە داسەپاندنی بیَ ئەملا وئەولای دەسەڵاتی قراڵیەت ، بەسەر نەتەوە داگیرکراوەکاندا ، دەسەڵاتێکی توقێنەریان دەبینی و لە پەیڕەوکردنی وەفاداری ساتراپەکاندا بەرانبەر بە بنەماڵەیَ شاهی ، ملکەجییەکی کویرانەیَ تەواوێان هەبوو . (هرمان بنگستون ، یونانیان و پارسیان ، ترجمۀ دکتر تیمور قادری ، ل ۱۷و۱۸ )

بەم جوَرە لەجوغرافیای نەزوَکدا ، پاراستنی ئابووری تەنیا لەژێر سێبەری دەسەڵاتی پادشاهیدا دەگونجا و گەورەترین نەخوەشین و زیانەکانی ، گەشەکردنی وەها بەڕێوەبەرییەک بوو کە لەسەرکوَتی گشتی گەورپیاوانی دەرباری ، بەئامانجی بێدەنگ کردنی خەڵک و کپ کردنی سەرهەڵدانی هەرجوَرە نەیارێک دەکەوتەوە . بەهەمان ڕادە کە گەورەپیاوانی جوغرافیای پربەرهەم بە ژماردنی باب و باپیرانی خوَیَ بەسەر بەرزی دەزانیَ ، لەم جوغرافیایَ" ئەشرافییەتی زنجیرەییەدا"نایاب و

کۆکردنەوەیٚ سامان و سەرمایە نامەیسوورە .

لە وەها جۆغرافیایەکدا ئەشرافییەت ئەوپەڕی لە تەمەنی دەسەلاتداریەتی یەک پادشا و بەدەگمەن تەمەنی چەن پادشایٚ زنجیرەیەکدا دەوامی هێناوە . پادشایٚ تازە باند و دارو دەستەیٚ پادشایٚ کۆن تێکدەشکێنی و سامان دارایيەکەی دەفەوتێنی و لەکۆتایی زنجیرەیەکدا ، هەموو پاشماوەکانی ئشرافییەتی زنجیرەپێشتر ، نەتەنیا سامان و دارایی ، بەڵکو گیانی خۆیان وبنەماڵەکەیانیش بەدۆڕاو دەزانن . بەم جۆرەیە کە لەنموونەیٚ سەدەکانی ناوڕاستدا دەبینین ، ئەشرافییەتی ئەفشاری سەفەوی ، ئەشرافیەتی ئەفشاری زەندی ، ئەشرافیەتی زەندی قاجار ، ئەشرافیەتی قاجار ،پەهلەوی و ئەشرافیەتی پەهلەوی جمهوری ئیستا تێکی داوە . ئەشرافیەتێک کە لەجمهوری هەنووکەییەوە سەری‌هەڵداوە بەگشتی لە گەڵ ئەشرافیەتی ڕابوردوودا پەیوەندیٚ نی‌یە و بەتەواوی جیاواز و تازە پێاکەوتووە .

لەم بەڕێوەبەرییەدا ، کۆبوونەوەیٚ سەرمایە دەست نادات و ئەشرافییەتی نەتەوەیی بەهۆیٚ کۆبوونەوەیٚ دەسەڵات لەکەسایەتی پادشا و دابینکردنی سیاسەتەکان لەسەرەوە بۆخوار ، (لەشاوە بۆ کویخا ) نادیارە . دەسکەوتەکانی بەرهەم ، بۆ سیستەمی بەرهەم‌هێنان ناگەڕێتەوە و بەشێوەی گەنجینەیٚ شاردراوە بۆڕۆژی تێکهەڵچوون لەگەڵ سیستەمی ناوەندیدا پاشەکەوت دەکرێت ، گەشە پێدانی نەتەوەیی ڕاوەستاو و بەرهەم لەهیچ دەورەیەکدا ، بەهۆیٚ ئاسایشی پاراستنی سامان ، لە پێداویستییەکانی ڕۆژانە تێپەڕ ناکات . لەوەها هەرێم و بەڕێوەبەرییەکدا ، بەبۆنەیٚ نەبوون و شاردراوەیی ئەشرافییەتەوە ، بارگرانی کۆڵفە و خەرجی گشتی و دەرباری پادشایی دەکەوێتە سەرشانی بچووکترین یەکەکانی بەرهەم‌هێنان و بەزمانی ئەمرۆ سەرشانی هەژارترین توێژەکانی خەڵک ، کەئاکامەکەیٚ هەژاری گشتی و ڕاوەستانی تەواوی گەشەکردنە .

سیاسەتی دسپوتیستی ، هاوەدەقە لەگەڵ ئابووری دسپوتیستی ، دیکتاتۆریەتی پەتی ، لەسەربناغەیٚ لەبەرچاوگرتنی لایەنگران و سەرکوتکردنی ڕەخنەگران . ئەم سیاسەتە کە خاڵی بەرانبەری سیاسەتی فێدراڵی جوغرافیایٚ هێمنە ، بروایٚ بەمافی نەتەوەیی هیچ نەتەوەیەکی بندەست نی‌یە و پادشا تەنیا "فرمانبەر" و "ئاژاوەچی" دەبینیٚ و مژارێکی دیکە ناناسێت .

## جۆغرافیایْ چوڵاییەکان (جۆغرافیای ڕاوەستاوْ)

لەم هەرێمەدا دۆخی شیاوی سوود بردنی سۆرشتی وەکو خاڵێک لەداوێنی جۆغرافیادا خۆیْ نیشان ئەدات . بیرە ئاوێک ، گۆمیکی بچووک ، و یان کانیئاوێکی لاوازی وەرزی ، بەڕادەیەک لەوەڕ و دار و درەخت تێرئاوْ دەکات کە کۆمەڵیْ بزن و ئەسپ و حوشتری پیْ بەخێوْ بکرێت ، ئەبێت بەوڵاتی یەک یان چەن بنەماڵە . نێوانی هەرکام لەو خاڵە جۆغرافیانە ، بەڕادەیەک دوور و درێژە و پرکەندوکۆسپە کە تەنانەت بۆململانیْ ، یان یەکگرتویی بۆ چارەسەر کردنی درێژەپیدانی ژیانیش ناشێت . نامەیسوور بوونی ململانیْ دەرەکی ، بەڕێوەبەری پرژمارە ، بێرتیژی ، دانیشتووانی ئاوەدانی چوڵاییەکان هەڵدەخرێنیْ کە لەدەروونی خۆیاندا بکەونە ململانی . فەرهەنگی هەمدەم زۆر ساکارانە نێوی دمارگرژی لیْناوە . ئەم دیاردەیْ دەمارگرژییە کە لەپاشماوەی سۆرشتی و ئاژەلی دەچێت ، زانایانە هەولْ ئەدا کە بەشی ڕۆژانەیْ مەسرەفی تاقەکەس ، زۆرتر لەوەیْ کە جۆغرافیاکەی پێشکەشی دەکات ، دەربازنەبی . بەڕێوەبەری ئەم جۆغرافیایە ، بەهیچ شیوەیەک دەسەڵاتی ئەوەیْ نییە کە پێداویستییەکانی ژیان پەرە پیْبدات و بۆ دابین کردنی مەرجی گونجاو بۆدرێژە پێدانی ژیانی نەوەکانی نوێْ ، بەهەموو بیانوێک ، داگیرکەرانی مافی ئاوەدانییەکان دەفەوتێنیْ ، یان سنوور بەدەریان دەکات و ئەوەش جیاوازی لەگەڵْ فەوتاندا نییە .

لەئاوەدانیەکاندا ، کە لەسەر بناغەیْ خوێنڕشتن و بەبیانوی پاراستنی نەریتە کۆنەکان بەڕێوە دەچیْ ، نەتەنیا بەربەرییەت ، بەڵکو حوکمی جۆغرافیایە کە کە ئامانجەکەیْ هاودەق کردنی ژمارەی دانیشتووان داخوازدەکات ، بەتۆزیْ بەخششی سۆرشتییەوە .

لەجۆغرافیایْ ڕاوەستاوْدا ، سەردەستی دەسەڵاتداری بەڵگەیْ درێژەپیْدانی حوکمە و بەتەمەن بوون چیروکی هاودەق کردنی تەواوی ئەوْ مەرجانە دەگێرێتەوە کە داکوکی ولەبەرخۆدان بۆکردن ناشیْ و نیشانەیْ گیان رزگار کردنە لەیاسانەگۆڕ و بیْگوزەشتەکانی ئەو جوغرافیە وشیاوی پلەیْ سەرکردایەتییە . هەروەها لەم جۆغرافیادا ، تەنانەت ئایدولۆژیایْ گشتیش کە ئەبیْ بە هۆیْ

جۆری لەنەرمی وهێمنی، و هاوبیری نەقش نانوێنێ و هەر ئەندامێکی ئاوەدانییەکە توتمێکی پەرەستش کراوە وهەموو بوونەوەری دەوروبەر و مانگ و هەتا و دار و بەرد و ڕووەک و گیان لەبەران بە خۆیەوە پەیوەند ئەدات و دەیانپەرەستێ.

لەجۆغرافیای ڕاوەستاودا جۆرێکی دیکە لە ململانێ وتێهەڵچوون بەرانبەر بە کەرسەێ دەربازبوون لەوڵاتانی دیکەوە هەڵوێست دەگیردرێت. دانیشتووانی ئەم جۆغرافیا کە ناتووانن بەهوێ دورو درێژی نێوان هەرێمی خۆدی و هەرێمەکانی دیکەوە، کێشە نێوخۆییەکەێ بۆئەوانە بگوێزێتەوە، چاوەڕوانی دەربازبوونی کەرەسەکانی وڵاتانی دیکە دەکات تا شکستەکانی خوێ لەڕێگای هێرش و پەلامارەوە قەرەبوو بکاتەوە. هەمووی ئەوشێوە و بۆچوونانە لە بەڕێوەبەریکەوە سەرهەڵ ئەدات کە زانایانە دەیهەوێ ئیدامەی ژیان تەنیا لەیەک ڕێگاوە بەدەس بخات کە لەڕوانگەێ دانیشتووانی جۆغرافیاکانی دیکەوە تۆقاندن و تۆند و تیژی دەنوێنێ. هەرچی لەجۆغرافیای ڕاوەستاوەوە دوور بکەوینەوە ئەم تۆند وتیژییە نائیجابی‌تر دەبێ و بۆ روون کردنەوە ناشێ.

ئیستا بەشە چکۆلەکانی مێژوو لەم چوارچێوەدا واتاکەێ ڕۆشن ئەبێتەوە و لەدیمەنی ڕێکەوتێکی مێژوویی دەردەچێ. کوشتنی سزار و چارلزی یەکەم لەسەنای ڕۆم و ئەنجومەنی نوێنەرانی بەریتانیادا، وڵامی بەڕێوەبەرانێکە کە لە جۆغرافیاێ هێمن‌دا دیکتاتۆریەت پەسەند دەکەن و فەوتاندنی بەردیا لەلایەن داریوشەوە بەڕێوەبەرێکی دیکەیە کە لەدەسەڵاتی دسپوتیسمدا، مەیلی بە دێموکراسی هەیە. ئەزموونی ڕاستیی سەرهەڵدانە مێژووییەکان، بەکلاس‌بەندی سەرەوە و لەدەروونی دۆخە جۆغرافیاییەکانەوە زۆرساکارە. لە هیندوستاندا کە سێ جۆغرافیای جیالەیەکی هەیە، سێ شێوە مێژوو دەبینرێت. نزیکەێ بیست ملوێن هێندوی بێ‌مێژوو لەقووڵایی دارستانە چروپڕەکانی ئەو وڵاتە، بێ‌پەیوەندی لەگەڵ مێژووی هیندوستاندا دەژین، بەڵام لەکەنارەکانی ڕۆژهەڵات و ناوەندی هیندوستاندا، جۆغرافیای هێمن بەرزترین پێشکەوتنی ئابووری بەخۆیەوە دیوە و لەناوچەکانی باکووردا کە جۆغرافیاێ نیوە بەرهەمدار سەردەستە، فرمانڕەوایانی دسپوتیست لەنێوجەرگەێ خێڵە چیاییەکاندا دەسەڵاتدارن. ڕوسیاێ پێش ١٩١٧، بەپانتاییە زەبەلاحەکەیەوە، هەرچوار جوغرافیا و هەرچوار مێژووەکەی نیشان داوە.

جوانترین خاڵی ئەم باسە ، هاونموونەیی حوکم و ئامۆژگاری ئایینە جۆراجۆرەکان و لەوانە ئایینە مەزنە ئاسمانییەکان، لەگەڵ چەن جۆری جوغرافی جیهاندایە. هەرچەن کە سێ ئایینەکە یەک خوداوەندییەکان، سێ پەیغامبەری خاوەن کتێبەکەیان لەڕۆژهەڵاتی نزیک و سنووری جوغرافی دیاریکراو و یەکجۆر، سەریان هەڵداوە، بەڵام پەرەسەندنی ئایینەکانیان دوواتر بەبۆنەی پەند وئامۆژگارییەکانیانەوە، لەیاسای جوغرافیای مێژوو پەیرەوییان کرد.

بەمجۆرە کە ئایدیۆلۆژیای عیسا(ع)، کە لەسەرخاکی فلستینەوە سەریهەلدابوو، نە لەشوێنی سەرهەڵدانەکەی، بەڵکو بوو بەبڕوای خەڵکانێک کە لەجوغرافیای پەرەسەندوودا دەژیان. چوونکە جوغرافیای هێمن بە بیروبۆچوونێک پێویستی هەیە کە هێمنی و ملکەجی ولەشساغی مەبەستیە و ئەو باوڕانە لەگەڵ جوغرافیاکەیدا هاودەقە.

ووتراوە کە ئەگەر کەسێ چاوی کابرایەکی کوێر کرد، ئەبێ تۆڵەی لێبکرێتەوە و چاوی کوێر بکرێت و ئەگەرکەسێ ددانی کەسێکی دیکەی شکاند، ئەبێ ددانی بشکێنی. بەڵام من ئەڵێم ئەگەرکەسێ ستەمی لێکردی و زۆری پێووتی، داکۆکی لەخۆت مەکە: تەنانەت ئەگەر چەپاڵەیەکی لەلای ڕاستت وەشان، ئەو لاکەی دیکەشت بهێنە پێشەوە تا چەپاڵەیەکی دیکەی لێبدات. ئەگەر کەسی تۆی بۆ دادگا بانگکێش کرد. کە کراسەکەت لێبستێنێت، عاباکەشت پیشکەشی بکە. ئەگەر سەربازێکی ڕۆمی ئەمری پێکردی کە کوڵەکەی بۆ یەک مایلی ئەولاتر بۆهەڵگری، تۆ تادوو مایل ئەولاتر هەڵیگرە. ئەگەر کەسی شتێکی لەتو داخواز کرد، پیشکەشی بکە و ئەگەر کەسێ داوای قەرزی لێکردی دەسبەتاڵ مەیگێڕە دوواوە بیستووتە کە ئەڵێن لەگەل دۆسەکانتا دۆست بە، لە گەڵ نەیارانت دوژمن؟ بەڵام من ئەڵێم دوژمنەکانی خۆتان خۆش بوێ، و هەرکە ئێوەی نفرین کرد، دوعای بەرەکەتی بۆنکەن؛ بەوکەسانە کەلەئێوە نێفرەتیان هەیە چاکە بکەن و بۆئەوانە کە جنێوتان پێئەدەن و ئازارتان ئەدەن دوعای خەێر بکەن. ئەگەر پەندەکانم گوێ لێبگرن، ڕۆڵەی ڕاستەقینەی باوکە ئاسمانیەکەتانن، چونکە ئەو تیشکی هەتاو بەسەرتاندا ئەپژێنی، چوونکە پیاوچاکان پارانی مێهرەبانی بەسەر دادوەر و ستەمکاردا دەبارێنن. ئەگەر تەنیا لەگەڵ ئەوانەدا چاکە بکەن کە خۆشتان ئەوێ، چ جیاوازییەکتان لەگەڵ خەڵکانی سۆرشت نزمدا هەیە، چوونکە ئەوانەش هەروەها بیر دەکەنەوە. ئەگەر تەنیا لەگەڵ دۆستەکانتاندا دۆستی بکەن ، لەگەڵ کافراکاندا چ جیاوازییەکتان هەیە. چوونکە ئەوانەش هەر وەها بیردەکەنەوە. کەوابوو، ئێوە تەواوبن، بەهەمان شێوە کە بابی ئاسمانیتان تەواوە. (عهد جدید، متی، موعظەی سرکوە ٤٨ـ ٣٨:٥)

ئیسلام کە ئاڵا و پەیامی "بەرانبەری لە بەرانبەر خوداوەندا" بەرزکردەوە و جیاوازییە خێڵەکییەکانی، خوێنی و دسپوتیستی تووڕدا، بۆدابینکردنی باڵانسی کۆمەڵایەتی هەوڵ وخەباتێکی فیداکارانەی

ڕاگەیاند و سەردەستی و جیاوازی چینەکانی کۆمەڵگای، لەگەڵ بیری خۆپاراستن لە سوچ و تاواندا (تقوی)، گوریەوە، نەلەسەر پیرۆزبوونی خوێن و بنەماڵە؛ لەجوغرافیای کێشەدار و جوغرافیای ڕاوەستاودا، کە پیویستی زۆری بە فرمان وڕاسپاردەکان هەبوو، بەتوندی و لەدولایەنەوە بۆ ئاسیای ناوین و باکووری ئافریقا بڵاو بووەوە بەڵام لەبەر دەروازەکانی جوغرافیای هێمن و فراوانیدا، لەسنووری فرانسەوهێند، بەربەست کرا، چوونکە لەو جۆرە شوێنانە پێش لەهەرشتێک، سەردەستی سامان ودارایی نرخی هەیە، نە خوێن و بنەماڵە. لەجوغرافیای کێشەداردا ڕاسپاردەی خۆڕاگری و سینگ فراوانی، لەگەڵ یاساگشتییەکانی ژیاندا هاودەق نی یە و لەمێشکی دانیشتووانی ئەو وڵاتانەدا، قسەکانی لووتکەی چیای عیسابەتەواوی سەرنجی کەس ڕاناکێشی. بەمجۆرەیە کە ئەم قسانە لە ئوروپادا وەردەگیردرێت و لەکۆڕی خێڵەکی بەرزی و نزمیەکانی ئەفغانیستاندا ڕەت دەکرێتەوە، چوونکە خەڵک ئیجازەنامەی پێویستیان پی یە کە هەبوونی تاڵانکراویان، بەدەستی دەسەڵاتدارانی دسپوتیستی ستەمکار، وەربگرنەوە.

"احشروالذین ظلمو و ازواجهم و ماکانو یعبدون من دون‌الله فاهدوهم الی صراط‌الجحیم و قفهم انهم مسئولون. ستەمکاران و هاوڕەسەنەکانیان، پیشەواکانیان، کە بە خوای گەورەی دەزانن، کوی بکەنەو و ڕایانوێستێنن و ڕوانەی دۆزەخیان بکەن، تابزانن کە وەڵامی کردەوەکانی خۆیان بدەنەوە". (قران کریم، صافات، ٢٢، ٢٣، ٢٤)

یەهوودییەت کە ئایینێکی هەمە لایەنەی جیهانی نی یە و بە ١٢ بەندی نەوە و نەبیرەوە سنووردارکراو و بەستراوەتەوە، لەگەڵ ئەو یاسانە هاو هەڵوێستن کە حوکمی پێکەوە ژیانی خێڵەکی دەپارێزن. یاساکانی تەورات کەگوایە هێشتا ئامانجی ڕزگارکردنی مادی و دەروونی نەوەو نەبیرەکانی یەهوودە، لەجیهانێکدا کەپەیتا پە یتا لەپێداویستییە خێڵەکییەکان دوور ئەکەوێتەوە، جۆرێک لە گۆشەنشینی و نەیاری و دڵەڕاوکی هەمیشەیی بە یەهوود پێشکەش کردووە، هەوڵی تازەی سەهیونیزم بۆمیلیتاریزەکردنی یەهوود، لەبەر ئەوە کە ناوەرۆکەکەی لەگەڵ گەوهەری تەوراتدا یەک ناگرێتەوە، ستەم لێکراوی هۆزەکەی کردووە بە ئامرازی هیوا و ئارەزوە دوورو درێژەکانی و ئیسراییلی هەنووکەی کردووە بە نەیار ونائاشنا و سینمایی نیشانی ئەدات. ڕۆژی سەبت (شەممە) بەیاد بهێننەوە وڕیزی لێ بگرن. لەحەفتەدا ٦ ڕۆژکار بکەن وڕۆژی حەفتەم کە سەبەتی خوداوەندە هیچ کارێک مەکەن، نەخۆتان،

نەکوڕتان، نەکچتان، نە کویلەکانتان (بەنێرینە و مێینەوە)، نە مێوانەکانتان، نەڕەشەوڵاخەکانتان. چوونکە خوّدایّ گەورە ئاسمان و زەوی ودەریا و هەرچیکیان تێدا هەیە، بە ٦ ڕۆژ ئافراندی و ڕۆژی حەفتەم دەستی لەکارکێشا. کەوابوو، خوّداوەند ڕۆژی سەبەتی بەپیرۆز زانی و کردی بەڕۆژی پشودان.

ڕیز لەباب و دایکتان بگرن تا لەسەر زەوینێک کە خوّاوەند ئەیبەخشیّ بەتو، تەمەن درێژت بکات. مرۆڤ کوژ مەبە، زینا مەکە، دزی مەکە، درۆ مەیژە، چاوی خراپەت بەماڵ و ناموسی کەسەوە نەبیّ. چقوت لە خوڵام و کەنیز و گا و وڵاخ و دارایی دراوسێیەکانتەوە نەبیّ. (عهد عتیق، سفر خروج، ١٧ـ٨: ٢٠)

هەرجوّرە قووڵبوونەوەیەکی زانایانە، لە حوکمی سیّ کتێبە ئاسمانییەکەدا، بەئاسانی مرۆڤ تێدەگەیەنیّ کە سەرنجی قوّرئان لەسەر "ململانی کوّمەڵایەتی" بوّ داسەپاندنی ماف و دادوەری و هەروەها ڕەسەنییەت بەخشین بە "بیروزانستە" کە لە دوو کتێبی تەورات و ئەنجیلدا، تەنانەت ئاماژەشی پیّنەکراوە. و بەڕادەیەک ڕێنموونیکەرە کە بەناوکردنی "خاتم الانبیا" بوّ حەزرەتی محەمەد (ص)، روون دەکاتەوە.

بەڵام ئەم درگا هەر بەوّجوّرە کراوەیە و تائەو ڕادەیە نووسراوە کەسێبەرێک بێت لەسەر ئەم کتێبە، کە وەرزێکە بوّ مێژووی زوّر دوور و درێژی ئێرانی دێرینە. درگایەک کە لە کتێبەکانی دوایدا بەردەوام لەسەر پشتە "(١)".

(١) ـ گوایە لێکدانەوەی تەواوی ئایینە ئاسمانیەکان و بەتایبەت ئیسلام، لەسەرخستنی مرۆڤ لە ئەشکەوتەکانەوە بوّئەستێرەکان تەنیا لە دوو لایەنی پەیوەندیە فەرهەنگییەکانەوە مەیسوور بووە: یان لایەنی ملکەجی و باوەڕ و ئیمانی تەواو و یان لایەنی تیّڕوانینی قووڵ و گەڕان، کە ئەوەش لە بیّ بڕواییەوە دەس پیّدەکات.

## پێش ووتار

نزیکەیٚ ٦٠٠٠ ساڵ پێشتر و لە چوارگوشەیەک بەدرێژایی ٥٠٠٠ و پانی ٢٠٠٠ کیلومەتردا، کە ناوەندەکەی مێزوپۆتامیا و پاتەختەکەیٚ دەوروبەری بەغدادی ئیستا بوو، شارستانییەتی مرۆڤایەتی لەدایک بوو.

لەم چوارگۆشە لاکێشییەدا هەرسێ پەیغەمبەری مەزنی ئایینە ئاسمانییەکان سەریان هەڵداوە، یەکەمین پەیکەر و پەرەستنگەیٚ خوداوەندانی زەوینی دۆرستکراوە، یەکەمین دێری یاسا بە یەکەمین نموونەی پیتی نووسین، نووسراوە، یەکەمین شێوەیٚ بەرهەمهێنانیان ڕێکخستووە، یەکەمین شارسەری هەڵداوە، یەکەمین شەڕ قۆماوە، یەکەمین کەشتی خراوەتە سەرئاو و یەکەمین گری هونەر و فەرهەنگی مرۆڤایەتی داگیرسا. هۆز و نەتەوەکانی ئیستایٚ ئێران، لە دەسپێکی ئەم سەردەمەوە، لەبەشی ڕۆژهەڵاتی ناوەندی ئەم چوارگۆشەوە، تاسەرهەڵدانی هخامەنشییەکان و پاش ئەوەش دووای ئیسلام، بەشێکی گەورەی لە ڕێکخستنی تووانایەکانی مرۆڤی بەئەنجام گەیاندووە. پان و بەرینی شارستانییەتی دێرین لە ڕۆژهەڵاتی ناوڕاستدا، سنووری بروایٚ ئاسایی مرۆڤ تێپەڕ دەکات. گڵە نووسراوەکانی "ئوروک" لە کۆکردنەوەی باجی دەوڵەتی لە ٥٥٠٠ ساڵ پێش لەئیستاوە ئەدوێ، بەڵگەنامەیەک بەدەستەوەیە کە هی ٤٥٠٠ ساڵ پێش لە ئیستایە و لە قورسایی باج و شۆڕشی خەڵک بۆگۆڕینی دەسەڵات ئاگاداری ڕادەگەیەنێ.

لەتەختەبەردێکی دیکەدا نووسراوە کە لە ٤١٠٠ ساڵ پێش لەئیستا ، لەشاری "ئور"دا ، باس لە دادوەری کۆمەڵایەتی و مافی سزادان کراوە، نووسراوەی بابۆلی تل‌حرمل، ٤٠٠٠ ساڵ پیشتر تیشکی خستووەتە سەر مژاری نرخی شتومەک وخیانەت لە ئەمانەت و لەکۆتاییدا ٣٨٠٠ پێشتر، بەردە نووسراوەکەی حمورابی ئاماژەی بەشاردنەوە و هەڵگرتنی کەرەسەی ژیان (احتکار)، نرخی سوو و سەلەم، لەباربردنی منداڵ، لەیەکدانی کەرەسەی هاتوچوو (دەعم) و پەیوەندی دوکتور و نەخۆشەکەی کردووە. (١)

هەموو ئەوانە لەکۆمەڵگای مرۆڤایەتی و پەیوەندی بەرباڵاوی کۆمەڵایەتی، ئابووری و رامیاری سەردەمە هەرە کۆنەکان ئاگادارمان دەکەن کە گوایە لەگەڵ پرسەکانی ئەمرۆدا دەس‌بەیەخە بوون.

لەم چوارگۆشەدا تائیستا شارستانییەتەکانی میسر،کنارەی رۆژئاوا و باشووری مەدیترانە، یەهوود، سومەر، ئاشور، بابۆل، لیدی، ئورارتو، مێدیا، ئیلام، شوش، ئالی‌پی سیەلک، لۆرستان، مارلیک، ماردین، هیرکانی، سکایی، سیستان، هرات و لەکۆتاییدا دوڵ و شیوەکانی سەند ناسراون.

تازەترینی ئەم شارستانییەتانە شارستانییەتی مێدیایە کە لای کەمی، تەمەنی دەگەڕێتەوە بۆ ٧٠٠ ساڵ پێش لەسەرهەڵدانی هخامەنشییەکان و لەمێژووی زۆربەی شارستانییەتییەکانی ڕۆژهەڵاتی و باکووری ئێران کۆنتر، یان ئاگاداری زیاترمان لەبارەیانەوە نی‌یە،

لەپاڵ پشکنینی ٥٣ گڵکۆی هەڵکۆڵاودا کە بەشێوەیەکی پڕوباڵاو ئەنجام درا، ئاشکرابووکە لە رووبەری سەرەوەی تەپۆڵکەی گۆڕستانەکەدا، لەزۆربەی گۆڕەکاندا کەرەسەی بەنرخ وگرانەهایان لە تەنشت مردووەکاندا داناوە. هەبوونی ئەو شتە بەنرخانە ڕادەی سامان و دارای زۆری ئەو هۆزانە بووو ناوەڕوکی هونەری و پیشەسازی ئەوانە خوێندنگایەکی بەرز و گەشە کردووی هونەری و فەنی، لە ڕابوردوی وڵاتەکەمانە (١) کە مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ سێ‌هەزار ساڵ پێشتر، واتا کۆتایی سەدەی دووهەمی پێش لە دایکبوونی عیسا. (عزت الله نگهبان، ظروف فلزی مارلیک ل ١٤)

(١) دوو نموونەی خوارەوە لە یاسای هیمورابی، بەرباڵاوی و وردبینی و بەرانبەرخوازی ڕوانگەی یاسادانەر لە ٣٨٠٠ پیش لە ئیستادا نیشان ئەدات کە ئەگەر لە یاساکانی ئەم سەردەمەدا هەڵیسەنگێنین، ڕوانگەیەکی مۆدێرنە. بەندی ١٣١: ئەگەر ژن و مێردێک پاش زەماوەندیان دەێندار بوون، هەردوکیان بەرپرسی ئەو قەرزەن... بەندی ١٥٢: ئە گەر هاوسەری (خێزان) کەسێ لەلایەن مێردەکەیەوە گومانی لێکرا کە لەگەڵ مێردێکی دیکەدا خەوتووە بەڵام لەو حاڵەتەدا نەبینرا بوو، پێویستە ژنەکە بەرانبەر بەخودای گەورە، سوێند بخوات و بگرێتەوە نێو ماڵەکە.

لەوانەیە دۆزراوەکانی مارلیک، تەنیا پشکنینێکی جیدی بێ لە شارستانییەتی ئێرانی دێرینەیێ پێش لە هخامەنشییەکانە کە ئاگادارییەکی بڕوا پێکراوی ڕاگەیاندبی و ئیستا لەدەستماندایە. لەگەڵ دۆزراوە بەرێکەوتەکانی حەسەنلو، سییەلک و سیستان و هی‌تر نیشانی ئەدەن کە ئەگەر لە هەر ناوەندێکی پێناسەکراویی ئێرانی دێرینەدا پاچەکوڵەیەک لە زەویی بدەین، لەگەڵ نموونەگەلی سەرنجڕاکێشەری شارستانییەتی دێرینەیێ نەتەوە کۆنەکانی دانیشتووی ئێرانی پێش لە هخامەنشییەکاندا ڕووبەڕوو دەبینەوە (١).

بەم جۆرە دژواری ئیستا لەنووسینی لەنووسینی مێژووی ئێراندا، لەناسینی قووڵی بناغەکەیەوەیە. وەکو ئەڵێن، ئەگەر دەربازبوونی هۆزەکان بۆ مێژووی پاش دۆزینەوەیێ پیتی نووسینە، بەدڵنیاییەوە ئێرانییەکان بەپێشکەشکردنی چەن نموونە پیتی نووسین پێش لەهخامەنشییەکان لە مێژوودا هەبوونی خۆیان سەلماندووە.

١ دێرینەناسینی جیهانی بەبۆنەیێ کۆمەڵیک هۆکارەوە کە لەبەشەکانی دواتردا پێشکەشی دەکەم، پێداگرانە هەوڵ ئەدات کە شارستانییەتی کۆنی نەتەوە کۆنەکانی پێش لە هخامەنشییەکان، هەروەها لەبن‌خاکدا بهێڵێتەوە و لە ئاستی چیرۆکەکانی شاهنامەدا ڕایانگرێت. دۆزراوە ڕۆشن و سەرنجڕاکێشەکان لە گۆشە جۆربەجۆرەکانی ئەم وڵاتەدا، هیچ کاتێک نەبووە بەهۆکاری پەرەسەندنی گەڕان و پشکنین، بەڵکو بەپێچەوانەوە دۆزراوەکان بووە بەبیانووی ڕاوەستانی بەپەلەتری پشکنینەکان. سامانو زانستی تایبەتمەندی دێرینە ناسینی جیهانی لەڕێگایێ پشکنینی ڕێکوپێک و بێ‌وچان، لەهەمەدان و پاسارگادو شوش و تەختی‌جەمشیددا، هەوڵ ئەدات کە شارستانییەتی ئێران بەدەسپێکی ئیمپراتوری هخامەنشییەکانەوە گرێ بدات. هانابردنی نەوەدڵانەیێ گروپی دێرینەناسینی زانکۆی تاران لەبەشێکی بچووکی تەپۆڵکەکانی مارلیکدا، کەسەرەڕایێ دەسکەوتە بەنرخەکانی بەپەلە کۆتایی پێهات، بەجوانی نیشانی ئەدەن کە شاردراوە ڕاگرتنی شارستانییەتی ئێرانی دێرینە سیاسەتێکی بەئەنقەس بووهو ئەم نووسراوەهەوڵ ئەدات پەردەکانی ئەم نهێنییانە لابدات. ڕۆشن‌کارییەکانی ئاغایێ عزت‌الله نگهبان لە لاپەرەکانی ١١ و ١٨یێ نووسراوەیێ (طروف فلزی مارلیک)دا، ڕاپەڕەگەیاندنێکی لە ئەم ئیشارەیە.

هەلبژاردنی هەرێمی ڕەحمەت‌ئابادی ڕوودبار و داوێنەکانی باکوور و بەرزاییەکانی زنجیرەچیای ئەلبۆرز لەم هەرێمەدا، بۆهەڵسەنگاندن، دوو هۆکاری هەبوو. یەکەمیان ئەوە بوو کەلەم هەرێمەیێ وڵاتەکەماندا هەڵکۆڵینی زانستییانە نەکراوە و لەڕوانگەیێ پشکنینی (هەوڵدەرانە) کە بتوانێ مێژووی ڕابوردووی ئەم وڵاتە ڕۆشن بکاتەوە، ئەنجام نەدرابوو، دووەم ئەوەیە کە پشکنینە نائاساییەکان بەمەبەستی گەیشتن بە شوێنەوارە بەنرخە دێرینەکان، لەم بەشەدازۆر باو بووە.

هەڵکۆڵینی ئێمە لەم گۆڕستانەدایە یەکەمین هەڵکۆڵینی زانستییانە و سیستیماتیک بوو کە ڕاستەخۆ لەلایەنی بەڕێوەبەری گشتی دێرینەناسیی و گروپی دێرینەناسی زانکۆیێ تارانەوە، پاش ساڵانی زۆر کەئەم هەرێمە کەوتبووە بەر هەڵکۆڵینی نائاسایی و تاڵانکەرانەیێ قاچاخچییەکانەوە ئەنجام درا و بەڵگە و زانیاری بڕوا پێکراوی دەربارەیێ دانیشتووانی دێرینی ئەم هەرێمە خستە دەستی زانایانی ئەم بوارە.

پەسنی ئێمە لەئێران ئەو نەتەوانە لەخۆ دەگرێت کە لەسنوورێکی بەربڵاوتر لەجوگرافیای هەنووکەیی ئێراندا دەگونجێت، پەسنێک کە وەکو ف ـ ئیشپیگڵ ئەیژێ، سەرزەوینێکە لەلەنێوان رووباری سێند و دیجلە و بەوتەیّ بارتیلێد، باکتریا و خۆراسان و تووس و سیستان و بەلوچیستان و کرمان و مۆکران و فارس و قۆم و کاشان و گۆرگان و ڕەی و گیلان و مازندەران و ئازەربایجان و لۆرستان و خوزستان و ئەرمەنستان و هەمەدان دەگرێتەوە. ئێوەجۆر بەجۆرەکانی بەردە نووسراوە کەیّ تەختی جەمشید کەدەتووانین ڕیزەکانی لەڕووی وێنەکانەوە بەهاوێنەیی باوەکەیّ بارتولید بزانین، هەبوونی درێژخایەنی نەتەوەکانی دانیشتووی ئێرانی دێرینەیّ پێش لەهخامەنشییەکان ئەدات. لویی واندنبورک لەکۆمەڵە کەم وێنەکەیدا (دێرینەناسیی ئێرانی کۆن) لاپەڕەیّ ١٣٤دا نووسیوویە ; ئەگەر تیشک بخەینە سەر سەردەمە جۆربەجۆرەکانی شارستانییەتی ئێران لەگرنگی شارستانییەتی پێش لەمێژووی ئەم وڵاتە، تووشی سەرسوورمان ئەبین.

دەسکەوتە هەنووکەییەکان بەرانبەر بەفراوانی سەرچاوە شاردراوەکان لەئاستی هیچدایە، هێشتا بۆسەلماندنی هەبوونی ناوەندی شارستانییەتە پرژمارە وجۆربەجۆر و زۆر پێشکەوتوو و دەوڵەمەندی ئێرقتی دێرینەیّ پێ ؛هخامەنشییەکاندا، وەکو پێویست هەوڵ نەدراوە.

ئەم دەسکەوتانە لەوّ ناوەندانە هەڵکەوتوون کەهەموویان تاڕادەیەکی زۆر باسی پێشکەوتوویی و پەرەسەندنی ئاستی هونەری کۆن و کەم وینەیّ ئەهۆزە ئێرانییانە دەکەن کەبەزمان، پیتی نووسین، سیستەمی ئاودێری، شارسازی، ئەندازیاری، بەڕێوەبەری و هەروەها فەرهەنگ، هونەر، پیشەسازی و ئاینی تایبەتی خۆیانەوە لەجیهانی دێرینەدا بەخۆناوییەوە ژیاون.

لەڕاستیدا دەتووانین ڕایگەیەنین کە ئێران یەکەمین خوڵقێنەری ئامێر و ئامرازی مەتاڵینە، چوونکە ئەم وڵاتە بەپێچەوانەیّ مێزوپۆتامیا و میسر و دەشتاییەکانی شیوی سێند، لەلایەنی کانزا مەتاڵینەکانەوە زۆر دەوڵەمەند بووە. بەگشتی دەزانین کە بەدرێژایی مێژوو، زێر و زیو و مس و ئاسن و قوڕقوشمی سوور و زەرنیخ لەئێراندا و زۆرتر لە کرمانیا (کرمان) کەڵ‌ک ی لێوەرگیراوە. (ئێرانشهرجلد اول نشریهٔ شمارهٔ ٣٢ کمیسون ملی یونسکو).

ڕێژەیەکی دوور و درێژ لەم شارستانییەتانە، لەچاوخشاندنێکی کورتدا، بەکۆمەڵێک ناوەند ئاماژەدەکات کە بەکورتە پشکنینێکی هەندک، شایەتی لەسەر هەبوونی شارستانییەتی درۆشاوەیّ دانیشتووانی ڕەسەنی ئێرانی دێرینە ئەدات.

ئەوەیٚ کە لەحەسەنلو، دین‌خواه تەپە، تەختی سلێمان، گوی‌تەپە، زیویە، مارلیک، کلورز، دیلمان، حەیمەجان، قەڵا چاخ، ڕوستەم قەڵا، دەماوەند، قەیتەرییە، چەشمەعەلی، خوروین‌تەپە، کلاردەشت، خەرگوش‌تەپە، تورنگ‌تەپە، گودین‌تەپە، شقەتەپە، تەپەیٚ حەسار، نەیشاپور، سیەڵک، تەپەی گیان، نوشی‌گیان‌تەە، تەپە سەراب، دوٚم سوٚرخ، باباجان تەپە، تەپەیٚ گوٚران، وەرکەبود، تەپەموسیان، چغازەنبیل، حەفت تەپە، تەپەی‌شووش، تل‌باکون، تەپەکانی میروەی، عەلی کوش، فەهلیان، تل‌ئیلیس، گوٚڕستانی خنامان، چەداد، تەپەیەحیا، شاری‌سوتاو و هی‌تر و هی‌تر، کەهەمووبان دیمەنێک لەشوێنەوارەکانی پێش‌هخامەنشییەکان دەنوێنن، دوٚزراونەتەوە و بەڕوٚشنی نیشانی ئەدەن کەپێش لەسەرهەڵدانی ئەو کوٚچبەرەباکووریانە کە پاش‌کاولکردنی شارستانییەتی مێزوپوٚتامیا و ئێرانی دێرینە بەهخامەنشییەکان ناوبانگیان دەرکرد، لەدەوروبەر و ناوەندی لەناوەندی ئێرانی دێرینەدازوٚرتر لە ١٥ کوٚمەڵگا و شارستانییەتی گەورە ژیاون. لەهەرێمی هەندیٚ لەم شارستانییەتانە، وەکو کاسپین کە هیچ نەبیٚ بریتی بووە لەقەزوێن (کاسپین) تادەگاتە ئەوپەڕی دەریای کاسپین (خەزەر)، بەجوانی دەتووانین یەکەمین نموونەیٚ یەکگرتوویی هوٚزە دراوسێەان ببینین و ئەگەر مێژووی پێشکەوتنی ئەوخەڵکانی و شارستانییەتەکەیان بەشێوەیەکی سوٚرشتی گەشەیٚ بکردبایە، لەوانە بوو کە لەزەمینەیٚ ڕامیاری و ئابووریشدا وەکو ئیمپراتورییەی سەردەمە دێرینەکان، لەچەن بەشێکی وڵاتدا یەکیان بگرتبایە. چوونکە مێژووی دێرینە کەمترین نیشانەیٚ لەناکوٚکی و دژبەری نێوان ئەوهوٚزانە دەناسێنێت. پانتایی ئیمپراتوری مێدیا ، کەهوٚز و نەتەوە و نەریت و زمانی جوٚربەجوٚر لەسنووری بەربڵاو، لەباشووری ڕووباری ئەرەس تا هەمەدان و ڕەیٚ و هەرێمی باکووری دەشتی کەویر لەخوٚ دەگرێت، وەکو دیاکونوف ئەیژیٚ، هیچ نەبیٚ هوٚزەڕەسەنەکانی کوتی لولویی، مێهرانی، هوریانی، و کاسی زووتر لەسیٚ‌هەزارساڵپێش بەشێوەیەکی ئاشتیخوازانە لەیەکتی مێدیاکاندا کوٚبوونەوە. ئەم یەکیتیە کەلەباکووری ڕوٚژهەڵاتەوە لەگەڵ یەکیتی کاسپیەکاندا و لەباکووری ڕوٚژئاواوە لەگەڵ یەکیتیئورارتوەکاندا دراوسیٚ بووە، ئەگەرمەجالی پێشکەوتنێکی سوٚرشتی هەبووایە، بێگومان لەسنووری خوٚیدا ئیمپراتورییەکی ڕەسەنی هەرێمی پێکدەهێنا. بەتایبەت یەیتی بەهێزی ئیلام

لەباشوور و یەکیتی زۆر بەهێز و پێشکەوتووی لوڕستان و ئالیپی لەباشووری ڕۆژهەڵات و هەروەها شارستانییەتی سیەلک لەباکووری شارستانییەتی لوڕستان، ئەو سەردەمەداهەومەرجێکی پەیوەندی نەتەوایەتییان هەبووە.

پەرەپێدانی ئەم بۆچوونە، بوئەوکاتە کە شارستانییەتەکانی کرمان، مۆکران، سیستا، زابولستان، خوراسان و گورگان، زەمینە و چاوەڕوانی پێکهاتنی کیانێکی نەتەوەییان لەبەشێکی بەرینلاوی ئەو کومەڵگادا هەبوو.

نموونە دۆزراوەکان نیشانی ئەدەن کە دەوڵەتانی ئەم یەەنەتەوەییانە پێش لە هخامەنشییەکان لایەنگری مەزنایەتی و سەردەسخوازی توندڕەوانە نەبوون، بەپێچەوانەی ئیمپراتوری هخامەنشییەکان خاوەنی ناوەندی چەکدارانە نوبوون، مێژوو نیشانەیەکی لەشەڕ و پێکدادانی درێژخایەن و سەرتاسەری نێوان ئەوانەی تاپۆ نەکردووە، و زۆرینەی شەڕ و دژبەرییەکانی ئێرانی دێرینە لەسنووری بەرتەسکی پراوێزی ڕۆژئاوا و نێوان شارستانییەتی ئاشور و سومر و بابوڵ لەمێزوپوتامیادا سەری هەڵداوە.

بەمجۆرە لەدەسپێکی هەزارەی یەکەمی پێش زاینی، پێکهاتەی هۆزی و نەتەوەیی خەڵکی ئێران، هێشتا نەگۆڕدرابوو، ٢٥٠٠ ساڵ پاش یەکەم جێگیربوونیان و لانی کەمی ٥٠٠ ساڵ پێش لەهخامەنشییەکان، و هەر لەمێژەوە پێکهاتەیەکی ئارەزومەندانەی ئاشتیخواز و پێکەوە ژیان باڵی بەسەر هەرێمەکەدا کێشابوو.

پێشتر وترا کە دانیشتووانی دێرینەی سەربانی ئێران خەڵکانی خاوەن هەڵوێست و برایەتی بوون. لەمبارەوە و لەچەن ڕوانگەیەی دیکەوە، هاوێنەییەی زۆریان لەگەڵ هاوتەمەن و دراوسێکانیان لەدوڵی سێندا هەبووە. بەڕواڵەت دیار نییە کە ئەم خەڵکانە لەچ کاتێکەوەلەو تایبەتمەندییە باش و جوان و ئاشتیخوازییە دوورکاوتەوە و یا ناچار بەو کارە کران. (واندونبرک، باستانشناسی ئیران باستان، ل ١٣٤)

درگایەکی تر بۆ سەلماندنی نەبوونی کێشە لە پێکهاتەی نەتەوەکانی دانیشتووی ئێرانی کۆن، هاوبەشی ئەوانە لە فەرهەنگ وهونەرە جۆراوجۆرەکانیاندایە. یەکدەستی شێوە و تاڕادەیەک نەقشی سواڵەت و شتە مەفرەقیەکان، شوشەیی، ئاسنی و نیشانە نەتەوەیی و ئایینییەکان، کە لەسەر بەردە داتاشراوی سەردەمە کۆنەکان ماوەتەوە و هەروەها خشڵ و کەرەسەی نێومال، شوشە، زیوو

و ئالتووون، لەو پەڕی سەرسووڕماندا، لە پەیوەندییەکی بێ‌کێشەی نێوان بەشێک لە هۆز و نەتەوەکانی ئێرانی دێرینە باس دەکات.

دیاردەیێ زور لە شوێنە دێرینەکانی ئێران لەسەردەمانی پێش لە مێژوودا، لە هەزارەی شەشەم تاهەزارەی سێهەم پێش لە مێژوو، سوالّتە نەخشێنراوەکانە. شێوەی ڕازانەوەیێ ئەوانە لەبەشە جۆربەجۆرەکانی ئێراندا جۆربەجۆرە، بەڵام شێوەیەکی یەکگرتوو لە هەموویێ ئەوانەدا بەدی‌دەکرێت کە لە هەندیێ لایەنەوە، لەگەڵ سوالّەتەکانی شارستانیەتی مێزوپوتامیا لە ڕۆژئاوادا هاوبەشن. هەمووی ئەم دەفرە سوالّتییانە بەرهەمی بلیمەتی خوڵقێنەرانی ناوچەیین. (جان کرتیس، ایران کهن، ل ٦)

بەم جۆرە هەبوونی ئیتنیکی کەدوایی بەهخامەنشییەکان ناوبانگیان دەرکرد، لە دەشتە بەرزەکانی ئێراندا سەریان هەڵدا. نەتەوەکانی دانیشتووی ئێران هۆزێکی کۆچبەری نەناسراو نەبوون کە بۆ سەرزەوییەکی نەشیاوی نیشتەجێ بوون و دوور لەشارستانییەت دەرباز بوویێتن، بەڵکو زنجیرە نەتەوەگەلێ بوون کە لەگەڵ شارستانییەتەکانی ٦٠٠٠ ساڵەیێ مێزوپۆتامیادا بەبێ کێشە و بەرانبەرکی‌ژیاون و تەنانت بۆکەم‌کردنەوەیێ کیشەکانیان بەپارێزەوە هەڵسوکەوتیان کردووە.

دەسکەوتە فەرهەنگیەکانیان لەپەیوەندی و پێشکەوتنی کۆمەڵایەتی، ئابووری بەهێز و گەشە کردوو باس دەکات و نموونەیێ ئەوانە لە مارلیک، سیەلک، لۆرستان و شووش، شایەتێکی ڕاست وێژ لەم بارەوەیە. ئەم کتێبە زمان و شوێن و هاتنی کۆچبەرانێک بۆهەرێمێک هەڵدەسەنگێنێت کە ئیمرۆ بەوێ هەرێمە ئەڵێن فارس. ئەوێ خەڵکانە وەکو لە چیروکە فۆرمیەکانی ئەم سەردەمەدا دەرئەکەوێ، بەڕواڵەت پاش بەشداری لە زنجیرەیەک هەڵسوکەوت و مامەڵەی سیاسی وچەکدارانەدا، خۆیان گەیاندە فارس وئەوێ شوێنەیان کرد بەپێگەیەک بۆهێرش و پەلاماردانی نەتەوە و هۆز و شارستانیەتە دێرینەکانی ئێران و پاش ئەوە بۆسەر نەتەوەکانی دراوسێ، لە مێزوپۆتامیەوە تا میسر و سوریا و لە یونانەوە تا هێند و ئاسیای ناوین. کتێبەکە هەروەها کاریگەری درێژخایەنی مێژوویی ئەم‌هێرشە، کە ڕێگایێ مێژووی سۆرشتی ڕۆژهەلاتی ناوڕاستی تووشی پژوێڵاوی کرد و بوو بەهۆکاری ئەو دوواکەوتووییە کە ئیستا دەیبینین، بەدۆرستی و دوور لە هەرجۆرە دەمارگرژیەکی ئاسایی ئەم سەردەمە، هەڵدەسەنگێنێ.

بەردە نووسراوەیێ پلیکانەکانی هوڵی گشتی تەخت جەمشید بەڕاستترین وێنەی بەشێک لە مێژووی

دێرینەی ئێران، ڕۆژهەڵاتی ناوڕاست، ئاسیای ناوین و هیندوستان دەزانێ. نوێنەرانێک کە لەو بەردەنووسراوەدا، شیاوترین بەرهەمە نەتەوەییەکانیان بۆ بارگاکەی داریوش ئەبەن، دانیشتووانی ڕەسەن وخاوەن شارستانییەتی سەرزەوییەکانی ئێرانی کۆن، مێزوپۆتامیا، هیند و ئاسیای ناوینن، کە بەرلە هێرشی هخامەنشییەکان، لە داڕشتنی بناغەی شارستانییەتی مرۆڤدا، بەبێ کێشە بەشداریان کردووە، هونەرە دروشاوەکەیان ڕەگ و بنچکێکی یەکگرتووی هەیە و بە هاوپەیوەندییەکی هاوبەش پەروەردە بوون. بەردەکەی تەختە جەمشید کە ئەو گشتە ڕیزداری و هێژاییە بێواتەیەی پیشکەش دەکرێت، یادگاری بەدیلگرتن و سەرکوتکردنی خەڵکانیکە کە دەرونی شەڕاشویی سەرکەوتووەکان، ڕیزی پەیتاپەیتای ڕم بەدەستان، کۆی ئەشرافیەت وگەورەپیاوانی دەسەڵاتداری ئەو تابلوە بەڕۆشنی دیارە ودمارگرژی و لووت بەرزی لە سەر و بەچکە بەردینەکەشیان دەباری. یاساوڵەکان کە جلوبەرگی ئاساییان لەبەردایە لە ڕاسپاردەی ئاسایش بارەگاکەی داریوش دەچەن کە ڕواڵەتی هێمنیان سێبەری خستووەتە نێو هۆڵکەوە. ئەم کتێبە گەرەکیە بێژی کە دەسپێکی سەرهەڵدانی هخامەنشییەکان لە ڕۆژهەڵاتی دێرینەدا، لەگەڵ کۆتایی ژیانی نەتەوایەتی ـ فەرهەنگی تەواو و یا کاتی ئەم هۆزانە، لەوانە هۆز و شارستانیەتەکانی ئێرانی کۆندا، بەرانبەر بووە،

تێکستی بەردە نووسراوەکەی داریوش نەتەنیا بەڵگەی دەق نەشێواوی دەسەڵاتی چەکدارانەی هێزێکی نامۆ بەنەتەوە و وڵاتە، بەڵکو خاوەن بیری ئەو نووسراوەیە کەسەرزەوی و نەتەوەی زۆری لە ئێران و مێزوپۆتامیادا داگیرکرد و دەتووانین وەکو یەکەمین بەردی بناغەی لادان لەمێژووی سۆرشتی، نەتەوەیی و هەرێمی جێهانی دێرینە، ئاماژەی پێبکەین کە شوێنەواری نێگاتیڤی هێشتا لەڕۆژهەڵاتی ناوڕاستدا ماوەتەوە. ئەم کتێبە ئەفسانەی هخامەنشییەکان، بەتایبەت ئەو ئەفسانەگەلە کە"تەوەرەکەی کورشە" و ئەفسانەی کردەوە شیاوەکانی هەڵدەسەنگێنێ و ئێرانییەکان لەگەڵ مێژووی ڕاستەقینەی خۆیاندا کە مێژووی پێش لەهخامەنشییە-کانە، ئاشنا دەکات و پێکەوە دەیانلکێنێت. مێژووی ئێران و ڕۆژهەڵاتی ناوڕاستی پاش هخامەنشییەکان شایەتە کە دێڕەکانی ۲۰ تا ۲۲ی ئەستونی یەکەمی بەردە نووسراوەکەی داریوش لەبێستوندا کە ئەڵێ: داریوش شاە ئەێژی"هەرزەلامێک لەو وڵاتانە بەوەفادار بوو، ڕێزی لێ دەنێم، ئەوەی بێوەفا بوو بەسەختی سزای دەدەم" بەڕادەیەکی سەرسووڕ هێنەرە کەبوو بە ئولگوی

ڕێنموونی کردەوەیی ڕووبەڕوو بوونەوەیَ هەموو دەسەڵاتدارانی دووایی لە سەرتاسەری ڕۆژهەڵاتی ناوڕاست و پەیوەندییە نەتەوەییەکان، نە لەسەر بناغەیَ هاریکاری وهاوبیروڕایی، بەڵکو، بەرانبەر ئۆلگوەکەی داریوش وەکو پەیوەندی نێوان سەرکەوتوو و مل کەچ هەڵسوکەوتی لەگەڵدا کراوە، هەمیشە هەروەها بووە کە گوایە دەسەڵاتدار و پادشاکانی ئێران وڵاتەکەیَ خۆیان داگیر و نەتەوەکەیَ خۆیان بەدیل گرتووە و وەکو کویلە ڕووبەڕووی بوونەتەوە. ئەم سەکردانە یان بەدووای وەفادارانێکدا گەڕاون کە بیانکەن بەدارەدەست و دەسخوەشانەیان پێبدەن، یان بەدوایَ تاوانکارانێکدا کە ئەبێ سەرکوت بکرێن. ئەم شێوە بەڕێوەبەری کومەڵایەتییە، کە یەکەم جار هخامەنشییەکان دایانهێنا، هەمیشە هاریکاری نەتەوەی بۆیاری نەیاری و دوژمنایەتی گۆڕاوە.

داریوش لەسەر بەردە نووسراوەکەی هەوڵی نەتەوە بندەستەکانی بۆ ڕزگاربوون لەدەس بنەماڵەی هخامەنشی و گەیشتن بەسەربەخۆیی چەن جار دووپات کردووەتەوە. تێکستی نووسراوەکە بەبێ پێویستی بەهیچ جۆرە لێکدانەوەیەک ئەیژیَ: لەیەکەمین دەرفەتی مێژوویدا، واتا پاش مردنی کورش بەبێناوبەین، و کاتێ کەمبوجیە لەمیسر بوو، خەڵکانی ئێران و سەرتاسەری ڕۆژهەڵاتی ناوڕاستی دێرینە، دژی دەسەڵاتی هخامەنشییەکان سەریان هەڵدا و ئەوَ جۆرە کە داریوش دەنووسێ: "خەڵک لەژێر فرمانی دەرچوون، هەم لەپارس و هەم لەوڵاتانی دیکە"، سەرەتا ئیلامییەکان شوڕشیان کرد، دووایی بابۆلییەکان سەرپێچییان کرد، جارێکی تر پارس، خوزستان، مێدیا، ئاشور، پارت، مەروَڤ، ثتگوش و سکایید دژی هخامەنشییەکان شەڕیان کرد، دووبارە ئیلامییەکان لەبەرخۆیاندا، دیسان نورەیَ مێدیابوو، دووایی پێنج جارئەرمەنیا لەژێر ڕکێف دەرچوو، دیسانەوە سەرهەڵدانیان دەس پێکرد، ئەوجار نۆرەیَ سکارتییەکان گەیشت دووای پارتەکان و پاش ئەوان گورگانییەکان سەریان هەڵدا، جارێکی تر مەروَڤیەکان و پارسەکان ئاڵای ڕزگاریان هەڵگرت. سەرپێچی خەڵکانی وڕس بوو لەستەمی هخامەنشییەکان بەدەیان جار دوو پات بووەوە، سەردارێکی ئانشانی پارسەکان ڕەخجیەکان، بۆچەندەمین جار، بابۆلیەکان و دیسان ئیلامیەکان و سکا کڵاو تیژەکان.. و بەمجۆرە سەرتاسەری وڵاتی نەتەوە بندەستەکان سەریان هەڵدا و دیسانەوە بەزەبر و زەخت دامرکانەوە و پاش هەرکەوتنێک سەرهەڵدانێک

بۆ بەدەسهێنانی سەربەخۆیی ڕێکخرا بەڵام وڵامی داریوش بەهەمووی ئەوانە وەها بوو:

من هەم لووت و هەم گویچکەیّ و هەم زمانی ئەو (فرورتی سەرداری ئازادی خوازی مێدیا)م بری و چاوێکیم هەڵکۆڵی. (هەر بەو حاڵە) بەستم بەدەروازەی کوشکەکەوە تا هەمووان ببینن، دوایی لەهەمەداندا هەڵمواسی و هەمو هاوڕیّ هەڵکەوتووەکانیم لەناو قەڵاکەدا خنکاند" (شارپ فرمانهای شاهان هخامەنشی، کتیبەی بیستون ٢ بند١٣)

بەم جۆرەیّ کە لیستەکەی داریوش لە نووسراوەکەی بیستوندا، لەپێرستی بەردە نووسراوەکەیّ هۆڵی گشتی تەخت جە مشیددا، دیسانەوە کامڵتر ئەبیّ و مێدیایی، ئیلامی، هەراتی، میسری، بەڵخی، سگرتی، ئەرمەنیایی، بابۆلی، سوریایی، سکایی، گنداری، ستگیدی، سەغدی، خوارەزمی، لیدیایی کاپادوکیەی، ئیونی، زرنگی، رۆخجی، هیندی، تراکیەیی، عارەب، کاری، حەبەشی و بەواتای ڕاستتر هەموو نەتەوەکانی دانیشتووی ئێرانی کۆن و شارستانە دراوسێەکانی گرتەوە، کە تێکشکاوی تۆندی و تیژی بیّوچانی هۆزە باکووریەکان بوون. تێکشکانی بەپەلەی ئەو نەتەوانە نیشانەیەکی بەرچاو لە نەبوونی سازە و ڕێکخراوەیەکی چەکدارانە و هەبوونی دەروونی هێمن و خاترجەم و پێکەوەژیان، لەنێونەتەوەکانی ئێرانی کۆندا بەدی دەکات، کەتەنانەت نیوە داکۆکیەکیان لەخۆیان نەکردووە. تۆژینەوەی ڕاست و دوورستی بەردە نووسراوەکەیّ بێستوون لە خۆیەدەستەوە دانی سەرتاسەری هۆزە ڕەسەنەکانی ئێران بە هۆزە هێرشبەرەکان باس دەکات.

هەرچەن وشەیّ پارس وەکو نێوی هەرێمی و یا خێلّ و هۆزێکی ئێرانی لەمێژوو وجۆغرافیای ئێرانی پێش لە هخامەنشییەکان و داریوشدا ناناشنایە، بەڵام لێکدانەوەیّ ئەم سەردەمە گەورەترین هەڵە و کەمترخەمیە، کە پارس و هخامەنشییەکان وەکو ئێرانی دەناسێنن. چوونکە داریوش لە بەردە نووسراوەکەیّ بیستوندا باسی داگیرکردنی پارس دەکات و کۆڕەکەیّ پارسیش هەم لە نووسراوەکەی درگای باشووری کۆشکی سەد ستوون و هەم گڵکوەکەی نەقش ڕۆستەمدا، وەکو نەتەوە بندەتەکانی دیکە، تەختی پادشایی خەشایار شاە و داریوشیان ناوەتە سەرشان و داریوش ئەوّ هەموو ئاماژە بە شۆڕشی پارسەکان دەکات.

کاتێ کە من لەبابۆل بووم، ئەم وڵاتانە لەمن هەڵگەڕانەوە: پارس، خوزستان، مێدیا، لە ئاسور، میسر، پارت، مەروڤ، ثتگوش، سکاییدە". "داریوش شاه میگوید کەسێ لە پارس و مێدیا یا لە بنەماڵەی ئێمە نەبوو کە ئەم پادشاییە لە گۆماتەی مۆغ بستێنێتەو.

(داریوش، کتیبەی بیستون)

ئاماژەکانی نووسراوەکەی بیستون، دوودڵی ناهێڵێتەوە کە داریوش پەلاماری پارس و تەنانەت ئانشانیش داوە، کە بەرانبەر ووتەکانی کورش لەگەڵ نووسراوەکەی بابۆلدا، وڵاتی باب و باپیرانی بووە، وەکو وڵاتێکی داگیرکراو سەیری دەکات، نەوەک نیشتمانی خۆی. داریوش تەنانەت بنەماڵەکەی خۆشی لە پارس و مێدیا جیادەزانێ. بەمجۆرە لە ئێرانی دێرینەی پێش لە هخامەنشییە-کان، لەگەڵ هەبوونی زۆرتر لە ١٥ نەتەوە و شارستانیەتدا ڕووبەڕوو دەبینەوە کە ئەگەر گەشە پێدانە مێژووییەکەی بەشێوەیەکی ڕێکوپێک درێژەی هەبووایە، لەوانە بوو پێکهاتەیەکی پرهێزی لە یەکیەتی نەتەوە دراوسێکان لەهەرێمەکە سەری هەڵبدایە و بەپێشکەوتنی سۆرشتی و بێململانێ شارستانیەتێکی سەربەخۆی بنیات بنیایە. وەهاپێشکەوتنێک ئەگەر لەسەر بناغەی ڕەوتی دووهەزار ساڵەی پێش لە هخامەنشییەکان، تەنیا سۆرشتی نەتەوەیی، ئێتنیکی و جوغرافی، بۆ لەپێشچاو بگیریایە، بێگومان شارستانییەتی دێرینەی مێزوپۆتامیاش کە بەڕاستی دایکی فەرهەنگ و شارستەنیەتی جیهانە، لەلایەن هخامەنشییەوە هەڵنەدەپێچرا و ٥٠٠٠ ساڵ پێش لەئێستا یاسای کۆمەڵایەتی دەنووسی و لە گەشەکردنی دوواییدا، بناغەی فەلسەفە و حیکمەت و زانستی دادەڕشت و عەقڵی مرۆڤایەتی ناکەوتە دەستی ڕۆژئاوا.

ئەم کتێبە ڕایدەگەیێنێ کە ١٢٠٠ ساڵ سەردەستی هۆزە نەیارەکان بەسەر ئێرانی کۆندا، واتا سێ زنجیرەی نائێرانی هخامەنشی، ئەشکانی، و ساسانی، پێشکەوتنی نەتەوەیی لەم وڵاتەدا ڕاوەستاند. لەچوارچێوەی ئابووری ئەم سێ زنجیرەدا ئیلا دەسەڵاتی دسپوتیستی پادشاه بەسەر هەموو سامانی نەتەوەییدا نەبێ، شتێک نابینرێت، لەپەیکەری سیاسی هەرسێ ئیمپراتوریەکەدا، ئیلادیکتاتۆری بێسنوور ئیستێبدای بێبەزەیی نەبێ شتێک نابینرێت و چوارچێوەی فەرهەنگیەکەی بریتیە لە نزمبوونەوەی ئاستی فەرهەنگی دڕۆشاوەی هۆزە ئێرانیەکان. هونەری هخامەنشییەکان ئیلاپێکهاتێیەکی لەیەک بچڕاوی هونەری نەتەوەبندەستەکان نەبێ هیچ شتێکی دیکە نییە. هونەری

ئەشکانییەکان بەسەر لاسایی کردنەوەی هونەری یونانندا، هێشتا لەهونەری لۆرستان ئیلام و دانیشتووانی کەنارەکانی دەریای خەزەر گەلێک دوواکەوتووترە و دراوی ساسانییەکان لە کمترین استانداردی جیهانی و نیشانە هونەرییەکان بێبەرییە. پشکنینێکی ورد لە مێژووی ۱۲۰۰ساڵەیٔ ئێرانی، پێش لەهێرشی عارەبەکان، نیشان ئەدا کە لەسەرتاسەری ئەو سەردەمەدا هیچ شوێنەوارێک لە بیر و کردەوەی نەتەوەیی لەزەمینەی ئابووری، ڕامیاری و فەرهەنگی نابینرێت. خەڵکی ئێرانی کۆن لەم دەورانە دوور و درێژەدا بەگشتی ژیانێکی شاردراوەیان دەربازکردووە و بەم جۆرەیە کە ئێرانییەکان تا سەدەیٔ دووهەمی پاش هێرشی عارەبەکان، تەنانەت لەناساندنی کەسایەتیەکی جێهانی لە هەموو بوارەکانی حیکمەتی جێهانی دێرینەدا داماو بووە و بەڵگە فەرهەنگیەکانی جێهانی تەنانەت بەڵگەیەکی نووسراوە کە لەلایەن ئێرانییەکانەوە بە فەرهەنگی مرۆڤایەتی پیشکەش کرابی ناناسن. لەسەرتاسەری ۱۲ سەدەی ئاماژەپێکراودا خەڵکی ڕەسەن و شارستانیەتە سەرەتاییەکانی ئێران کۆن لەبێدەنگیدا ژیاون، بێدەنگیەک کە بەگویرەیٔ دوو سەدە بێدەنگی پاش پەلاماری مۆسڵمانان، گەلێک دور و درێژتر، بەربڵاوتر و قووڵتر و بناغەییتر بووە. لەڕاوەستانێکی کورت و پشکێنەرانە و دوور لەدەمارگرژی نیشانی ئەدا کە وەستانی فەرهەنگ، زانست و نووسین لە دوازدە سەدەیٔ پێش ئیسلام، بەڕادەیەک بەربەڵاو بووە کە دەتووانین بێژین ئیستا ئێرانیەکان هیچ میراتێکی دێرینەیان لەزەمینە جۆربەجۆرەکانی ژیانی نەتەوەیدا نییە. شوێنی بەتاڵی ئێرانیەکان لەخەباتی فەرهەنگی دنیای کۆندا، زیانێکی گەورەیە کە قۆرسایی خستووەتە سەر ئەم وڵاتە.

خوگرتن بەخوێندنەوەیٔ ڕوویەری بەڵگەنامە ونووسراوەکانی ئێران بەبیٔ تیٔڕوانینێکی ڕەخنەگرانە وئاکادمیک، بووە بەهۆیٔ ئەوە کەناوەڕۆکی هەموو ئەو بیرەوەرییانە ببێتە باوەڕێکی پیروز. ئەگەر بسپۆڕان و پشکێنەران و مێژووزانانی ئێران، بەجێگایٔ بیر و بۆچونی نەتەوەیٔ دەمارگرژانە، هێز و بلیمەتی خۆیان لەبواری پشکنین و بەدوواچوونی زانستانەدا بکار ببردایە، ئەوکاتە ڕوون ئەبووەوە کە هەوڵی ئێرانیەکان لەدەسپێکی سەدەیٔ سێهەمی کۆچیدا، بۆداهێنانی نووسراوەیٔ پەهلەوی وفەرهەنگ و تەنانەت ئایینی بریقەداری پێش لە ئیسلام، کە لە کاردانەوەکانی نەتەوەیی

بەرانبەر بە داگیرکەری عارەبەکان پاش بێ هیوایی ئێرانیەکان بوو، بەچ نیشانە و مەبستێکەوە ئەنجام دراوە. (١)

وەها دەرئەکەوێ کە مێژوونووسانی ئێرانی و تازی بۆ نووسینی بەرهەمەکانیان دەربارەێ ساسانییەکان، لەسەرچاوە ڕەسەنەکان بەهرەیان وەرگرتبێ. ئەم سەرچاوانە کامانەن؟ هەم "کارنامەک" کە بە پیرهێنانی بەشێک لەوە، ئەم کتێبەمان دەست پێکردو هەم "خوّدایی نامەک" کە بەهەوڵی مێژوونووسانی ئیسلامی زیندو کراێەوە و هەروەها چەن وەرگێڕاوێ لەنووسراوەکانی فارسی ناوەڕاست، لەوانە "نامەێ تەنسەر" کە تا ئێستا ماوەتەوە هەموویان لە ڕێچکە و لایەنێکی تایبەتدا نووسراون و مەبەستەکەیان لەو نووسراوانە ئەوەیە کە هەوڵ بدەن تاج و تەختی پادشاکانی ساسانی کە بەهۆێ شۆڕشی خەڵک لەسەدەی شەشەمی زایینیدا کەوتبووە مەترسی، پایدار و هەمیشەیی نیشانی بدەن. ئەم نووسراوانە کە داکۆکی لە یاساکانی دەسەڵاتی ساسانیە بە مەبەستەوە دەیلکێنن بە سەردەمەکانی کۆنەوە. (لوکونین، تمدن ایران ساسانی، ل٩)

ئێستا ئەرکی هەمووئەوزانایانەیە کە، بەجێگاێ دمارگرژی نەتەوەیی، بەشوێندا چوونێکی گورجوگوڵ دەس پی بکەن، ئاشکرایە کە ئیرانیەکان، پاش هخامەنشییەکان تا سەدە سەرەتاییەکانی کۆچی، لەبەر داگیرکەری هۆزە بەیانییەکان و نەبوونی حاڵو هەوای شیاو بو ڕاگەیاندنی بیر وئەندیشە، نەهاتنە نێو گۆڕەپانی نووسین و بڵاوکردنەوەێ حیکمەت وزانستی هەرێمی و نەتەوەیی، لە هیچ زەمەنێکی ئەم سەردەمە دوور و درێژەدا، ڕێچکەیەک لە هاریکاری هۆزە کۆنە ئێرانییەکان لەتەک دەسەڵاتی ناوەندی ئێراندا نابینرێت و داگیرکەرانی نائیرانی تا دووا هەناسە و تاکۆتایی ساسانیەکان، جگەلە لاوازکردن و تێکدانی توانایی هۆزە دێرینەکانی ئێران کۆن، نەقشێکیان بەجی نەهێنا و ئەوە کە ئەوان لەئێران و ئێرانی نیشانی جیهانیان دا، تەنیا ڕمی پارسی بوو کە بەداخەوە زور شوێنی تەنیەوە.

پەرەسەندنی نەیاری و دورکەوتنەوە لەنێوان نەتەوەبندەسەکانی ئێرانی کۆن و ئیمپراتورە داگیرکەرەکاندا بەڕادەیەک بوو کە بندەستەکان لەهەمووی ئەو دەورانە دوور و درێژەدا، تەنانەت بەرانبەرکی و بەڵام ڕووداوی وەها لە مێژووی پاش ئیسلام دا دووپات نەبووەتەوە. سەرەڕاێ خوێنڕشتن و زەبرو زەنگی مەغولەکان لە پەلامارەکەیاندا بۆسەر ئێران، چەندین جار لە گەڵ داکۆکی نەتەوەی، خەڵکی و تەنانەت کەسیدا ڕووبەڕووبوونەوە، بەڵام ئەسکەندەر بەسوپایکی کەمەوە سەرتاسەری (١).

لەکتێبی دووهەمدا بەخەستی لەمبارەوە باس دەکەین.

ئیمپراتوری بەڕواڵەت زەبەلاحی هخامەنشی، بەبێ ڕووبەڕوو بوونەوەی پارێزگاری نەتەوەیی، پێش لەڕووخاندنی ناوەندەکانی ئیمپراتوری داگیرکرد و پاتەختی هخامەنشیەکانیشی ئاگرتێ بەردا (١).

و هەروەها داگیرکەری عارەبەکان بە هێز و توانایی تاقیکردنەوەیەکی نزمی چەکداریەوە، ئیمپراتوری زلهێزی ساسانیەکان، دیسانەوە بەبێ ڕووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ داکۆکی خەڵکدا تێکشکاند.

بەم جۆرە پێویستە بەڕوانگەیەکی بێلایەنانە و دوور لە لوتبەرزی، سەیری دەورانی دوور و درێژی ١٢٠٠ساڵەی دەسەڵاتداریەتی خێڵە نەناسراو وناهەرێمی و نائێرانییەکان بکەین و ئەوە بزانین کە ئەو ماوەیە سەردەمێکی ڕاوەستاو و پشتگوێ خراوی مێژوویی بووە. سەردەمێک کە ئێران لە زۆر لایەنەوە تووشی نزمی و نەئامەت هات و لە داڕشتنی فەرهەنگی مرۆڤایەتیدا بێبەشە. تەنیا پاش ئیسلام و لەگەڵ تێکچوونی دووارژیمی زنجیرە نەیارەکانی ئێرانی کۆندا، نەتەوە بێدەنگ کراو و تێکشکاوەکانی ئێرانی، گیانیان تێدەکەوی و سەر ڕاست دەکەنەوە و لەکەمتر لەسێ سەدەدا، لە پانتاییە جوراوجۆرەکانی ڕامیاری، وێژەیی، ئابووری، زانستەکان و هونەردا، خاوەن ناوانی توانا پێشکەشی فەرهەنگی جیهان دەکەن. سەردارانی مەزن لەنێوان هۆزە ئێرانییەکاندا سەر هەلئەدەن کە ڕەگیان لە مێژووی پێش هخامەنشییەکان داکوتاوە. هەبوونی نەتەوەیی دەهروژێت وبەم جۆرە پردێک دروست دەکرێ کە دوو شارستانیەتی ئێرانی کۆن و پاش ئیسلام پێکەوە دەلکێنێت وحێماسەتی نەتەوەیی ئەمجارە بۆسرینەوەی ناخاوێنی هخامەنشی، عارەب، تورک و مەغول و لەکۆتاییدا ناخاوێنی ئیستیعمار و ئەمپریالیسم، دەگاتە لووتکە.

لەهەمان حاڵدا بەنرختریں ڕۆژهەڵات ناسانی ناونیشانداری جیهان، بەبۆنەی چەن هۆکارێکەوە کە لە کتێبەکەدا ئاماژەی پێدەکەم هەوڵیان داوە تا فەرهەنگی نەتەوەییمان بەزنجیرەیێک لەباوڕە بێبناغە ونا ڕاستەکان بتلێنینەوە و ناسنامەی ڕاستەقینەی ئێران و ئێرانی تا ئاستی وێنەی سەرکوڵەکەکانی تەختی جەمشید و نەقشی قاڵی و ناوکە فستق، نزم بکەنەوە (١).

هەوڵی ئامانجداری ڕوژهەڵات ناسان، ئێرانی کۆن بەئاگاداریەوە دەخەنە پشتگوێ و دەیخەنە ژێر تیشکی بپرهیزی ئەو پرژێکتۆرانە کە ڕوو بەئیمپراتوری هخامەنشی ڕایانگرتووە بەجۆرێ کە

١ـ وەکو ناسینی ئە امریکا بەپانتۆلی لی و ساندویجی مەکدۆناڵدە کە ناسینێکی نەخوێنەوارانەیە.

بەجۆرێ کە لە لاپەڕەکانی دووایی ئەم کتێبەدا پەنجەیێ بۆرادەکێشرێت ، ئەوانە نزیکەی ١٥٠ ساڵە بەقازانجی مەبەستە سیاسییەکانی سەردەم ، سوودیان وەرگرتووە تا مێژووی ئێران بۆ دەسپێکی "پڕ لەشانازی "هخامەنشییەکان بگوێزنەوە . ئەم کتێبە وێنەیەکی تەواو و شیاو لە بناغەی مێژووی ئێران و بەگشتی ڕۆژهەڵاتی ناوڕاست پێشکەش دەکات و لەوانەیە بتوانێت هۆکاری پڕۆڵاوی بەڕواڵەت بێچارەسەری نەتەوەکانی ئەم هەرێمە ڕۆشن بکاتەوە ، هەرێمێک کە ناوەندی سەرهەڵدانی شارستانییەتی مرۆڤایەتییە .

"پشکنینەکانی دێرینەناسینی تەپۆڵکەکانی مارلیک و بەرزاییەکانی چغازەنبیل ، چیرۆکی شارستانییەتیکی زۆر مەزنی حەفتهەزار ساڵە دەگێڕێنەوە . لەشووش دانیال و بەرزاییەکانی ئیلام (عیلام) پاتەختی ئاشوورییەکان و پارتەکان و خوزستان (جۆندی شاپور) پاتەختی یەکەمی هخامەنشی و هەروەها هەمەدان (ئیکباتان) پاتەختی فۆرمی مێدیا و پارسەکان و پاتەختی کاتیی هخامەنشییەکان و ئەشکانییەکان ، شوێنەواری گەلێک مەزن و کۆمەڵێک بازێر کە لە لایەنی هونەری ئەندازیی وشارسازیی ئەو سەردەمە بێوێنە بووە ، ماوەتەوە و ئەمانە گشت بەرهەمی خەباتی کورش و داریوش بوونە . بەرانبەر بەردەنووسراوەیەک کە لە کەلاوەکانی پاسارگاد دا (تەختی جەمشید) ماوەتەوە ، کورش ڕایگەیاندووە هەرکەس ئازادە کە لەسەر ئایین و بیر وباوەڕ و فەرهەنگی خۆی بمێنێتەوە و ماڵ و گیانی دەپارێزدرێت . هەموو ئەبێ دەست لەدەستی یەکتر بنین و ئێران ئاوەدان بکەینەوە تا بتوانین بەرانبەر بەشارستانیەتە گەورەکانی بابوڵ و میسر (مێزۆپۆتامیا) و یونان (روم) خۆمان بنوێنین . لەم کاتە بەدووا بەرزی و مەزنایەتی شارستانیەتی ئێران دەس پێدەکات و کەسانێک وەکو بوزەرجومێهر ، زەردەشت ، ئەرژەنگ ، مانی و ئارش کەمانگیر ، سەریان هەڵدا و بیر و باوەڕی ئایینی جۆربەجۆر لەدایک بوو و کورش بەدانانی زانکوی جۆندی شاپور ، کە یەکەمین زانکو بوو لە سێهەزارساڵ پێش لە ئیستاو کۆکردنەوەی زانایێنی هەڵکەوتووی ئەوکاتە لەبوارە جۆربەجۆرەکاندا گۆڕانکارییەکی گەورەی لە زەمینەی فەرهەنگ و شارستانییەتی ئێراندا پێکهێنا"

. (میر حسن رضوی ، معماری درایران زمین ، روزنامەی ایران ، شمارە ، ١٦١٧ ل١٢)

ئەم لێکدانەوە تێکڵاو و پێکڵاو و ناڕاستانە ، لەبنیاتی مێژووی ئێران ، لەڕۆژنامەی نیوە فۆرمی ئێران چاپ کراوە ، بەرهەمی چەن کتێبێ ڕاسپاردەیێ ، شڵەقاو و ناڕاستە کە ڕۆژهەڵات ناسانی وەکو هارولد لەمپ ، گریشمەن ، شاندور ، ویستهوفر و ریسپتی بەدیل و هاووێنە ئێرانییەکانی ئەوانەیە تا مێژووی بەرڵاوترین داگیرکەرییەکەی جیهان ، لەگەڵ مێژووی ڕەسەنی سەرزەوینی شیاوی شانازی ئێراندا بگوڕێنەوە . ئیستا ئەم کتێبە ، ئێرانییە ڕاستەقینەکان ، خەڵک و هۆزە دێرینە

و دانیشتووانی کۆنی ئەو سەرزەوینە ، خوێنکاران و پشکێنەرانی تا هەنوکە بێدەنگ کراوە بە پەرەپێدانی ئەم ووتووێژە ، بۆ هەڵخراندنی توانایە نەتەوەییە لەخشتەبراوەکانی ئێران بانگ لێدەکات .

## گەڕان بە دووای وڵاتدا

نووسەرانی مێژووی ئێران نەیاندەویست کە سەردەم و دێرینە ناسینی هخامەنشییەکان(١) جیدی بگرن. نرخاندنی کە من دەمەوی لەبناغەی مێژووی ئێراندا بیکەم ئەم کەماسییە قەرەبوو دەکاتەوە و لەبەرئەوە کە بەڵگەنامە مێژوویی‌یەکانی ئەوٚ سەردەمە بە پرسە سەرەکییەکان ئاماژە ناکات وگەلێک دەگمەن و نایاب و لە ئاستێکی زۆر نزمدان، ئەم نرخاندنە بە دەسمایەیەکی ئەوتۆ پێویستی نی‌یە و دیسان لەبەرئەوە کە پشکێنەران بە یارمەتی وەها بەڵگەگەلێک چوونەتە سەر مزاری هخامەنشی‌یەکان وەکو بناغەدانەرانی یەکەمین ئیمپراتوری جیهانی، لەنرخاندنی سەرهەڵدانی ئەم ئیمپراتوریەدا تووشی ڕوانگە و بۆچوونی جۆربەجۆر نابین.

بەم‌جۆرە و لەم حاڵەتەدا کە پێشتر بەشێوەیەکی نوێ سەیری پرسەکەمان کرد، دوو تێکست دەکەین بەنموونە، یەکی لەوانە نرخاندنەکەی ر. گیرشمەن دیرینەناسی پڕناو و دەنگی کۆنە، کە کتێبەکەی نێوی "ئێران لە دەسپێکەوە تا ئیسلامە"، ئیستا بەوردی ٥٠ ساڵ لە نووسینی دەرباز بووە و ئەوی دیکەیان "مێژووی ئیمپراتوری هخامەنشییەکان"، کاری مەزنی پرفیسور بریان، کە پێنج ساڵ پێش لە پاریس بڵاو بووەوە. هەروەها کارە تەمەن درێژەکەی ڕەحمەتی پیرنیا، "ئێرانی دێرینە" نووسراوەیەک کە ئیستا ٧٠ساڵەیە و لە دووابیدا کتێبە ڕاسپاردە بەڵام شایانی کەڵکوەرگرتنی ئاغای ع. شاپور شهبازی لەژێر ناو و نیشانی کورشی مەزندا، کە ٣٠ ساڵ پێش لە ئیستا چاپ‌کراوە، لەم نرخاندنەدا پشکنیومە. لەبەر ئەوە دەکرێ بوترێ کە ئامانجە سەرکیەکان لە ٧٠ ساڵ پێش لەئیستاوە لەم کتێبەدا باسی لێکراوە. هەرکام لەم چوار لێکدانەوە سەرەکیانە پاڵێ بە دەیان، یان سەدان لێکدانەوەی لاوکییەوە داوە ، دەتوانین بێژین هەمووئەوخاڵە گرنگانە

بۆ ئەئەندامانی خێڵێک کە دوایی لەسەردەمی داریوشدا خۆێ بەستەوە بە سەرکردەیەک بەنێوی هخامەنش و سەرزەوینێک بەنێوی ئێران و لەمێژووی سەردەمدا بە هخامەنشییەکان ناوبانگیان دەرکردوە، پیشتر ناونیشانێکیان لێ‌نازانین و دیار نی‌یە کاتی هاتنیان بۆ جۆغرافیای هەنووکەیی ئێران چناونیشانێکیان بوو. لەمە بەدوواوە بەناوکردنی ئەوان وەکو پارسی یان هخامەنشی لەناچاریدایە

و ئەندامانی خێڵێک کە دەبوا دەربارەیّ هخامەنشییەکانەوە بووترایّە لەپێش چاومان گرتووە . (١)

کتێبەکەیّ ماموستا بریان کە بەوپەڕی بوێری و لەهەمان حالیشدا لەپێش چاوگرتنی هەندێ شت نووسراوە، بەڵام بوگەڕان بەدووای هەندیّ مژاری ووردا ، دەوڵەمەندە، دەتووانیّ بوّباس کردن دەربارەیّ بناغەیّ مێژووی ئێرانەوە ، کومەڵێ قسەی سەردەمی پێبێت . سەرەڕایّ ئەمانە هەژاری بەڵگەنامەکان لەناسینی هخامەنشییەکاندا بەوڕادەیّە کە ٤٥ساڵ نێوان نووسینی کتێبەکەی گیرشمەن و بریان نەبووە بەهوّیّ جیاوازی ناوەروّکەکەیّان . هەڵبەت کتێبەکەیّ بریان ژمارەیّەکی زوّر تاقە پاراگرافی تێدایّە کە دەربارەی دەورانی (٢) هخامەنشیدا نووسراوە و شێوەیّ تیّڕوانینی لەو بارەوە نیشان ئەدات . ڕەوشتی بەیّانی ماموستا بریان لەو تیّڕوانینانەدا ، جوّرێکە کە ئەبیّ بەهوّکاری دوودلی و تەوەرەی سەلماندنی باسەکان ڕوشن نییە . بەڵام ئەم کەم وکووڕییە بوّ چەسپاندنی مێژووی هخامەنشییەکان ، دژواری هەموو مێژوونووسانە ، بەم بوّنەوە پێکرا بەناچاری هخامەنشییەکانیان وەکو کوّچبەرانی ئێرانی ناساندووە و لەڕێگا جوّربەجوّرەکانەوە ڕوو بە بەرزاییەکانی ئێران (نجد ایران) پاڵیان پێوە ناون . بەڵام چون دەکرێت کەهوّزێک پێش لەوەیّ هاتبێتنە ئێران ، بەئێرانی بەناو بکرێن ؟ .

تەشەنەیّ ئێرانییەکان ، لەدەسپێکی هەزارەیّ یەکەمی پێش زاینیدا بەشێوەیّەک بوو کە لەگەڵ هاتنی یەکەم جاریاندا جیاواز ، وکاریگەری زوّرتر بوو ، **هێرش بەرانی ئەم جارە بەزوّر و بەرە بەرە لەکوّمەڵانی پەیتا پەیتا خزانە نێو ئێرانەوە** و بەڕواڵەت هەمان دوو ڕێگایّان تیّپەڕکرد کەپێشرەوەکانیان بڕیبوویان ، واتا قەوقازو لایّ سەروی دوو رووباری سەیحون و جەیحون . . . پاش ئەم کوّچە یەک لەدووایّ یەکانە کە ماوەی چەن سەدەیّ خایّاند ، وەکو ئەربابی هەرێمەکە جێگیر بوون و دووایی کردیان بە بنکەیّ داگیرکەری و بوّبەدەس خستنی جێهان کەوتنە جموجوڵ . (ر . گیرشمەن ، ئێران لە دەسپێکیەوە تائیسلام ، ل ٦٦)

لەم ووتارەدا ئاغای گیرشمەن ، گرووپە کوّچبەرەکانی پێشرەو کە خوّیّ ناساندونی و ئەیژیّ

١ . کتێبەکەیّ ئاغای بریان ، بەرهەمی سەرچاوەیّەکە کە پێرستە سەرەکییەکەی ٦٠ لاپەڕە و ٢٠٠٠ ناو ونیشان پێکهاتووە .

٢ . لەوانەیّە: "ئانشان لەخوّلی مێدیا و هخامەنشیدا" بەرهەمی دوکتور ج ، هانتر مەن ، (مێژووی مێدیا ) دیاکونف ، بە پێداچوونەوەی بەرباڵاوی ناوبراو بەرهەمە پێشووەکەی "ئیلام" ، "ئەسکەندەر لە ئێراندا" بەرهەمی پرفیسور باویان ، "بەڵگەکانی خوّلی هخامەنشییەکان" ، بەرهەمی ئوێنهایم ، "سەرهەڵدان و ڕێکخراوی شاهەنشاهی هخامەنشی" بەرهەمی دوویلیو ، جی ، ڤوّگلسانگ ، "دەسەڵاتدارانی ناوەندی و ڕێکخستنەکانی دەور و بەری هخامەنشییەکان" ، "بەهەمی هێلن سان سینی و برنبورگ ، دێرینە ناسین ئیلام" ، بەرهەمی د . ت . بوتس و کەسانی دیکە .

۱۰۰۰ ساڵ پێشتر هاتوونەتە ئەم سەرزەوییە یان لەوێ لەم ووتارەدا ئاغای گیرشمەن، گروپە کۆچبەرەکانی پێشرەو کە خۆیّ ناساندونی و ئەیژیّ بەشێوەیەکی ئاشتیخوازانە نیشتەجیّ بوونە، ژیانیان بەڕێوە دەبرد و هەروەها کە دەزانین شارستانیەتی هەرێمی ئێرانیان دارِشت، ئێرانی بەناویان ناکات، بەڵام هێرش‌بەرەکانی گروپی دووەم، کە هخامەنشییەکانی دواییش هەر لەوان بوون و بەزۆر خۆیان کرد بەئەربابی ناوچەکە و دوواجار بەسەر جیهانی دێرینەدا داسەپان، بەئیرانیان دەیانناسێنێت!

گیرشمەن ڕێگای هاتنی هێرش‌بەرەکانی شەپۆلی دووهەم بۆئێران ڕێگای قەوقاز بۆ لایّ ژوورووی دوو ڕووبار و لەوێەوە بۆ ئێران دەس‌نیشان دەکات. لەم بارەوە هیچ ڕوانگەیەکی یەکگرتوو نابینرێت وکەسانیّ‌هەن کە ئەو کۆچبەرانە لە ڕۆژئاوایّ دەریای خەزەر، ڕۆژهەڵاتی دەریای خەزەر، ئاسیای ناوین، سەرزەوییەکانی ناوراستی ئەفغانستان و تەنانەت هیند، روو بەئەم لایەنە بەڕێە دەکەن. ناڕۆشنی شوێنی دەسپێکی ئەم کۆچبەرییە جۆرێک سەر لێشێواوی پێش‌هێناوە کە نووسەرانی مێژووی ئێران لەئاستێکی گرنگدا خۆیان لەپرسەکە دزیوەتەوە و باوەڕیان بەو چیروکە هەیە کە گوایە نەژادی نەناسراوی"ئاریا"لەجیهانی دێرینەدا خوڵقاندویە. ومن لەم کتێبە و لە کاتی خۆیدا وەکو پێویست رۆشنی دەکەمەوە.

ڕێگایّ هاتنی ئاریاکان بۆ بەرزاییە تەختەکانی ئێران بەتەواوی دیار نییە. ئاویستا نیشتمانی سەرەکی ئاریاکان، "ئێران واج" بەناو دەکات، واتا وڵاتی ئاریاکان و ئەڵێ وڵاتێک بووە‌ش ئاو و هەوا، خاوەنی کێڵگەی بەپیت، بەڵام ڕۆحی خراپ لەپڕ زەوییان سارد کردەوە و لەبەر ئەوە زەوی خواردنی دانیشتووانی پیّ‌نەدان، کۆچ‌کردن دەستی پیّ‌کرد. بەتەواوی ڕۆشن نییە کە مەبەست لە ئێران واج چییە ؟. (حسن پیرنیا، ایران باستان جلد اول، ل ١٥٦)

لەسەر ئەوّ باوەڕە ئاغای پیرنیا ئەڵی، بەرواڵەت ئێران واج سەر زەوییەکی لەبەهەشت چووی دیکە بەنێوی ئێران هەڵکەوتبوو، کە پاش قاتی و قری سورشتی دانیشتووانەکی بەناچاری ڕوویە ئێرانی ناحەزی ئیستاکۆچبەربوون! ئەم نووسراوانەیّ ئاویستا کەلەسەدەیّ پێنجەم و شەشەمی کۆچی لەنێوان پارسیەکانی هێند، و وەکو مێژووی کۆن، تاچرادەیەک بیّ‌نرخە، لەئەرک و بەرپرسەکانی دیاریکراوی ئەوّ کتێبەیە و بەجوانی ئاشکرایە. بێگومان پێداگرتن بۆ قایم‌کردن و

ڕوومەت پێدانی بەڵگەیەکی مێژوویی ئایینێک کە ٢٠٠٠ساڵ پاش سەرهەڵدانی پەیغەمبەرەکەی نووسرابێت ، و لەلەسەردەمی قەیرانی دووا گرووپی چکولە لە شوێنکەوتووەکانی ئەوئایینە خۆیّ نیشان ئەدات ، دەتوانێ لیوالێو بێت لە فانتازیا و خەیاڵی پیرۆز کە مێژوو هیچ نیشانەیەکی هەبوونی ڕاستەقینەیّ ئەوانەی لەبیر نی یە .

پرس و مژاری فراوان دەربارەیّ زەردەشت لەبەرانبەردییەکانماندا خۆیّ نیشان ئەدات . بەڕاستی جێگای نائومێدییە کە پاش ساڵانی دوور و درێژ هەڵسەنگاندنی ئەوّپرسانە ، هێشتا نازانین زەردەشت لەچ کاتێکدا ژیاوە و ئامۆژگارییەکانی بەووردی چیی بوون . . . پرسی ئاشکراکردنی بێدینی (کفر) لەئایینی زەردەشتدا پرسێکی پڕتەمچ و پێچە ، چوونکە ئەو سەرچاوە پەهلوییانە کە لەبەر دەستدان، پاش ئیسلام نووسراون، واتە کاتێک کە کۆمەڵە چکۆلەی ئایینیەکەی زەردەشت ، زۆرتر لە بیری ئافراندنی ئایین و باوەڕی ڕاستەقینەدا بوون، نە کاتی ساسانییەکان کە خۆیان دەسەڵاتداری پشتیووانی ئایین بوون. (ریچارد . ن . فرای میراث ایرانی، ل ٤٥ و ٣٥٥)

لەگەڵ ئەم هەموو خەباتە فراوانە بۆخاوێن و بیّ‌گەرد نیشاندانی مێژووی دێرینەی ئێمە ، لە هخامەنشییەکانەوە تا سەرهەڵدانی ئیسلام ، و گۆڕینی بۆخۆڵی شانازییە نەتەوەییەکان ، لە ناو نەتەوەیەکدا کە خولیای بەشداربوون لەسەرهەڵدانی شارستانییەتی مرۆڤایە تیدابیّ و هیچ دەس‌مایەیە-کیان بۆ نەهێشتبێتەوە ئیلا پشت دانن بە باپیرە نەناسراوەکەیەوە "(ئارییایی)" ، لەم لێکدانەوەیّ خوارەوەدا بە ئاشکرا دیارە . مێژوونووسانی سەردەم ، خودی و دەرەکی ، بەجێگای وورد بوونەوەیّ شارستانییەتی کۆنی هۆزە جۆربەجۆرەکانی ئێران ، پێش لەسەرهەڵدانی خامەنشییەکان ، هەندیّ مژاری هەست پیّ‌نەکراو و شاردەوە دادەهێنن کە جەوهەری ژیان و ناسنامەیّ ئێرانی بکەن بەئامانجی خڵەتاندن و سەرلیّ‌شێواوی . وەکو شتێک ئەمانە بیانەویّ ، یان بە ئەرکی خۆیان دەزانن کە ڕابوردوویّ هۆزە دێرینەکانی دانیشتووی‌ئێرانی پێش لە هخامەنشییەکان بەهەموو شێوە و فروفێڵێک بسڕنەوە و شارستانیەتەکانیان بەشاردراوەیی بهێڵنەوە و هخامەنشی ، ئەشکانی وساسانیەکان وەکو نوێنەرانی‌ئەو خەڵکانە کە ١٢٠٠ساڵ پێش لە ئیستابەجیهان بناسێنن .

بەهەرحاڵ کاتیّ کە ئارییایەکان هاتن بۆ بەرزاییەکانی ئێران ، خەڵکانێکیان پیّ چاوکەوت کە ناشیرین و لەلایەن ڕەگەز، نەریت، مۆراڵ وئایینەوە لە وان نزمتر بوون. چوونکە ئارییاکان خەڵکی هەرێمەکەیان بەدیو یان تور بەناو دەکرد. جگەلەوەش لەمازندەراندا چەن نموونەیەک دۆزراوەتەوە ، کەزۆر کۆنن و ئەو استییە دووپات تەکەنەوە .

هەڵسوکەوتی ئاریەکان لەگەڵ ئەم خەڵکە ناوچەییەدا وەکو هەڵسوکەوتی سەرکەوتوو و بندەستکراو بوو، بەتایبەت کە ئارییەکان ئەوانەیان نزمتر لەخۆیان دەزانی، کەوابوو، لەدەسپێکدا هیچ جۆرە مافێکیان بۆئەوان لەپێش چاو نەدەگرت، بەڵکو لەتەکیانا بەشەڕ دەهاتن و لەهەرشوێنێکدا ئاشکرا بوایەن دەیان کوشتن، بەڵام دوایی کە مەترسی ئەوانە بۆئاریەکان نزم بووەوە، کاری پڕزەحمەت وەکو :کشتوکاڵ، ئاژەڵ بەخێوکردن، خزمەتی ناوماڵیان لەکۆڵ خۆیان کردەوە و بەوانیان سپارد و بەم بۆنەوە پێداویستی ئەربابەکان بەوخەڵکە زۆرتر و بوون بەخاوەنی کۆمەڵێ ماف. وەکو مافی زەلام و ئافرەتی کۆیلە کە پێشتر لە ژێر چاودێری ئەربابەکاندا دەژیان. لەم کاتە بەدوواوە تێکڵاوی ئاریەکان و خەڵکی ڕەسەنی ناوچەکە دەستی پێکرد. شێوەی کۆچبەر بوونی ئاریەکان بۆئێران، لە چیرۆکە کۆنەکانی ئێران و تارادەیەک لە هەڵسەنگاندنی شێوەی کۆچبەربوونی خەڵکانی هیند و ئوروپییەوە وەرگیراوە. ئاریەکان بۆ نیشاندانی زەبر و زەخت نەهاتبوون بۆ ئێران، بەڵکو دەیانویست لەم وڵاتە نیشتەجێ ببن و بۆ ئەم مەبەستە ناچار بوون زەوییەکان لە خەڵکی ناوچەکە داگیربکەن ( ! ). بۆگەیشتن بەم مەبەستە، دەگەیشتنە هەرشوێنێک پاش شەڕ کردن لەگەڵ خەڵکی ئەو شوێنە، قەڵایەکیان دادەمەرزاند. هۆندڕی قەڵاکەیان دەکرد بەدوو بەشەوە، بەشێکیان تایبەتی گوزەرانی بنەماڵەکان وبەشەکەی دیکە بۆحەوانەوەی ئاژڵ وگیان لەبەرانی تر. شەوان لەم شوێنە ئاگریان دەکردەوە، مەبەستیان لەم کارەو بەم کارەیان دوو مەبەستیان هەبوو. یەکەم: بۆئەوە کە بنەماڵەکان سوودی لێ وەربگرن، دووەم: بۆئەوە کە ئەگەر دانیشتووانی ناوچەکە پەلاماریان دان، پارێزەرانی ئاگرەکە گەش بکەنەوە تا پیاوانی قەڵاکە دەرپەڕن و دوژمن لە خۆیان دوور بخەنەوە. دوایی قەڵاکان بوون بە گوند و شار. (پیرنیا، ایران باستان ل ١٥٧).

لێکدانەوەکەی ئاغای پیرنیا لە دانیشتووانی ئێرانی کۆن وەکو لێکدانەوەیەکە کە سناریست و دەرهێنەرەکانی ڕۆژئاوای تۆقێنەرە لە سووریپێستەکانی ئەتازونی (وڵاتە یەکگرتووەکانی ئامریکا) هەیانە. وەکو ئاغای پیرنیا ووتوویە، ئاریاییە نەناسراو و لێوالێو لە شارستیانەتەکان، کە لەوڵاتە خەیاڵاوی و بەهەشت‌نما بەڵام نادیارەکەیانەوە هەڵهاتن، کاتی گەیشتنیان بەئێرانی ئیستا، لە گەڵ دێو و درنجدا، واتا دانیشتووانی نزم و بێ‌شارستەنیەتی ئێرانی کۆندا ڕوو بەڕوو بوونەوە! مێژوونووسانی پڕناو و دەنگی دیکەش وەکو ئاغای پیرنیا ئەو چیرۆکە سایلۆحانەیان کردووە بەبناغەی لێکدانەوەی مێژووی نەتەوەیەی هەمیشە ماندگاری ئێران. بەڕواڵەت ئاغای پیرنیا کاتێ ئەو تێکستەی سەرەوەی نووسیوە، سەرنجی ناوەڕۆکی ڕستەکانی نەداوە. ئەگەر مەبەستی لەوئاریاییانە هخامەنشیەکانن، خۆ، بەردەنووسراوەی هۆڵە گشتییەکەی تەختی جەمشید نموونەی

درۆشاوەیٚ هەموو ئەو نەتەوانە و هونەر و پیشە و بەرهەمەکانیانە، بووە بەهۆیٚ ڕوومەت وناونیشانی ئیمپراتورییەکەی داریوش، نەدیو و ناشیرین بەڵکو پاڵوانانی ئوستورەیی شاهنامەن و هەرکە پێش لە داریوش تاقووڵایی مێژوو، لەم سەرزەوییەدا ژیابێت، ئاغایٚ پیرنیا بەدیو و ناشیرین ناوی ناوە. بەڵام ئەگەر مەبەستی دانیشتووانی ناوچەکەن کە پێش لەهاتنی هخامەنشییەکان دەیان ناوەندی شارستانیەت و کۆمەڵی پرشنگداریان لەم سەرزەوییەدا دامەرزاند، ئیتر دوور لە ژیرمەندییە کە بەهخامەنشییەکان بێژین ئێرانی، بەڵکو هێرش بەرانی توقێنەربوون کە ئەو شارستانیەتانەیان داگیرکرد.

لەگەڵ ئەوەشدا ڕێگایەکی دیاریکراو بۆ هاتنی ئەم ئاریاییانە نەدۆزراوەتەوە، بەتایبەت ئەو هۆزە کە دوواتر بەهۆی ڕێکەوتە مێژووییەکانەوە، بەپارسی و هخامەنشی ناوبانگیان دەرکرد.

پارسەکان خەڵکانیٚ بوون ئاریایی نەژاد کە دیارنی‌یە چ کاتیٚ بۆ بەرزاییەکانی ئێران کۆچبەر بوون. لەبەردە نووسراوەکانی ئاشوری سەدەیٚ نوهەمی پێش زایینی‌دا لە خەڵکانی بەنێوی"پارسواش" ناو براوە کە لەلایەیی دەریاچەیٚ ئورومیە ژیاون. هەندیٚ لەزانایان، وەکو راولین سون و هوٚم‌مێل و پراشک لەوٚ باوەڕەدان کەخەڵکی پارسواش هەمان پارسەکان بوون بەڵام ئیستا لێکدانەوەیٚ ئەو ڕاستیە دژوارە. دووایی پادشاکانی ئاشوری تا ساڵی ٦٩١ی پێش زایینی ناویٚ پارس نابەن و لەو ساڵەدا ڕایدەگەیەنن کە لە شەڕی خولەدا پارسواش، ئانزان وئالی‌پی یارمەتی ئیلامیەکانیان داوە. کەوابوو، هەندیٚ لەزانایان وەکو پراشک باوەڕیان وایە کە خەڵکی پارسوا لەباکوورەوە کوچبەری باشووربوون و لەوڵاتێکدا کە دووایی بەبۆنەیٚ ناوونیشانە پێشوەکەیەوە بە پارسوا ناویانگی دەرکرد، دامەرزان. بەهەر حاڵ نووسراوەکانی ئاشوری نیشانی ئەدات کە لەسەردەمی سەلمانسەر (٧٣١ـ٧١٣ پێش زایینی) وئەسەرحەدون‌دا (٦٦٢ پێش زایینی) پادشا یان دەسەڵاتدارانی پارسواش لەژێر دەسەڵاتی ئاشور دابوون. هەروەها کەلەمێژووی مێدیادا نووسراوە، پاش ئەوە فرەوەرتیش (٦٥٥ـ٦٣٣) پارسی هێنایە ژێر دەسەڵاتی خوٚی. (حسن پیر نیا، ایران باستان، ل ٢٢٦ و ٢٢٧).

نموونە ووتاری سەرەوە بەجوانی ڕۆشنی دەکاتەوە کە ئاماژەیٚ ڕەحمەتی پیرنیا بەئارییە(١) پرشارستانیەتەکان، کەبۆبڵاوکردنەوەیٚ شارستانیەتەکەیان، خەڵکانی توقێنەری ناوچەکەیان دەکوشت، هخامەنشیەکان بوون. دەتووانین بوٚئاشنایی بەڕادەیٚ توقێنەری ئەو خەڵکانە، بروانینە بەردە نووسراوەیٚ هوٚڵە گشتییەکەیٚ تەختی جەمشید و موزەکانی ئێران و وڵاتانی دیکە، مێژووی

ـەیە کە لەلاپەڕەی ٤٤٧ی نووسراوە پڕنرخەکەی ئاغای صادق ملک شهمیرزادی وەرگیراوە و
ی (ئیران پیش‌از تاریخ)ە، و بەرهەمی پشکنینی درێژخایەن، بەڵام نەبەڕادەی پێویست قووڵ و شیاو،
دێرینەناسینی پێش لەمێژووی ئێرانە کە زۆرتر ئەم پرسە دیاری دەکات، نیشتەجێبوونی کۆمەڵە ژیارەکانی
هیچ نەبی لەسەردەمی نوێ بەردینەوە، واتا ۷۰۰۰ساڵ پێشتر لەهەرێمەکەدا دامەرزاوە و پێویستییەکی
ری کۆچبەربوون بەئامانجی دابین‌کردنی ناوەندی ژیان ، یان ئاڵوگۆڕێکی شارستانییانە نەبووە. ئەم
بەجوانی نیشانی ئەدات کە لەسەردەمی سەرهەڵدانی ئەو هۆزە کەدواتر بەهخامەنشییەکان ناوبانگیان
هیچ شوێنێکی بێ‌دانیشتووی نەبووە کەلەگەڵ پێوەری دێرینە ناسینی ناشارستانییانەدا لەیەک بدرێتەوە،
ڵاییەکانی کەویری لوت و دەریای خوێ نەبێت کەسەرتاسەری ڕۆژهەڵاتی ئێرانی پێک دەهێنا.
کێشە کەهۆزەڕەسەنەکانی ئێران لەهەمان شوێن و بەهەمان ناونیشانەوە، پاش سێ‌هەزارساڵ بەش‌مەینەتی
، لەسەر شوێنی خۆیان ماونەتەوە. لەوانەیە مەبەستی ڕەحمەتی پیرنیا و کەسانی دیکە لە خەڵکانی دیو
بن، کە هخامەنشییەکان بەشێوەی خزمەتکار و کۆیلە دەیانچەوساندن ، یان بەکەمەڵ دەیانکوشت.

١ ـ لەلاپەڕەکانی دواییدا لەگەڵ چەن ڕوانگەی نوێ لە وشەێ نەژادی (ئاری) دا ئاشنا دەبین. زۆر گرنگە کە لاپەڕەێ ٤٤٧ی کتێبە پڕنرخەکەێ ئاغای دکتور سادق مەلیک شەمیرزادی بەنێوی (ایران پیش ازتاریخ) بخوێنینەوە. ئەم کتێبە بەرهەمی پشکنینی درێژخایەنی دێرینەناسی پێش لەمێژووی ئێرانە کە بەجوانی شێوەی نیشتەجێبوونی کۆمەڵە مرۆڤیە ژینەوەرەکانی ئێرانی دێرینە، لایکەمی، لەسەردەمی نوێ بەردینەوە (٧٠٠٠ساڵ پێش لەئیستا)، دەس‌نیشان دەکات. و نیشانی ئەدا کە هیچ پێداویستیەک بۆ سەرهەڵدانی کۆچبەربوون بۆ هەڵپەڕاندنی ناوەندی ژیانێکی شارنشینی نەبووە. نەقشەیەک کەلەلاپەڕەێ ناوبراودا چاپکراوە بەجوانی نیشانی ئەدا کە لە دەوروبەری هاتنی ئەوهۆزە کە دوایی ناویان نرا هخامەنشی سەرزەوی ئێران، شوێنی نانیشتەجێ و چۆڵایی تێدا نەبووە کە بەپێوەرە دێرینەناسیەکان پێوانە بکرێت، مەگەر ناوچە کەویریەکان جێگای سەرسوورمانە کە هۆزەدێرینەکانی نیشتەجێ ئەو سنوورانە بەپێچەوانەێ ئەو هەموو کوێرەوەریە مێژوویەوە و پاش ٣٠٠٠ ساڵ، هێشتا ناوبانگە دێرینەکەیان پاراستووە. لەوانەیە کە مەبەستی ڕەحمەتی ئاغای پیرنیا لەخەڵکانی دێو و ناشیرین هەمان هۆزە دێرینەکانی ئێران و ئەو نیشتەجێیانە بووبێتن کە هخامەنشیەکان دەیانکردن بە نوکەر و کڵفەت و دەیانکوشتن!.

**ئێران و ئورارتو و مێدیا بخوێنینەوە تا دەسکەوتە زانستی و پیشەیی و فەرهەنگییەکانی ئەو خەڵکە شیاوی کۆمەڵ‌کوژیە ببینین. تا بزانین کە چۆن ڕمی هخامەنشییان بەناوی سەختەێ ڕمی پارسیەوە بەکار دەبرا و زۆرینەی مارلیکەکانی باکوور و سیەلکەکانی ناوەند و ڕەخجیەکانی باشووری ئێرانی دێرینەیان لەگۆڕەپانی مێژوودا سریەوە!**

**بەهەرحاڵ گواستنەوە و دووپاتکردنەوەی ئەو هەموو ووتارانە کە دەربارەێ کۆچبەر و کۆچەریدا ووتراوە، لەم دەرفەتە تەسک و بەپەلەدا دەس نادات، بەڵام دەتووانین بەیارمەتی چەن گریمانە وگومان دەس‌نیشانی بکەین کە بەڕاستی هیچ کەس لە لەکات و شوێنی ئەم کۆچبەریە ئاگادار نی‌یە.**

لەڕوانگەێ ئێمەوە هێرشی هەموو ئەوهۆزە کۆچبەرانە کە هەمووجارێک لەدەروازەکانی دەریای خەزەر و دەشتە بەرزەکانی پامیرەوە هاتوونەتە نێو ئێران و باشووری ڕۆژئاوای ئاسیایان داوەتە بەر پەلاماری تاڵان و داگیرکەری، تەنیا لەسەر شایەتیەکی زۆرگۆمان لێکراوی هێرودیت، سەبارت بەهێرشی سکاکان بڵاوبووەتەوە، بەدوور لەڕاستییە. سەرەڕای ئەوەش دڵنیاین لەوە کە کۆچبەرانی نیستێپەکانی ڤۆڵگا و دێن بەدرێژایی مێژووپەیتا پەیتا هێرشیان کردووەتە سەر هەرێمی ژوورووی قەوقاز و ئەوێ شوێنەیان تاڵان‌کردووە، **بەڵام گرنگ ئەوەیە کە ڕووداوی وەها هیچکاتێک نیشانەێ ئەوە نیە کە بووبێتە پێشەکی بۆ وەها کۆچبەر بوونێک.** (توین بی، تاریخ تمدن، جلدهفتم، ل ٦٠٦، پانویس سوم، متن اصلی)

**توین بی لەم وتووێژەدا هەوڵ ئەدا کە ڕوانگە پێشنیارکراوەکەێ ئاغاێ گیرشمەن، دەربارەێ ڕێگاێ**

هاتنی کۆچبەرەکان بۆ ئێران، بەناڕاست بناسێنێ، بەڵام لە ئیدامەیَ قسەکانیدا هەمان ڕێگا بەدوور نازانێت . پارسەکان خەڵکانی ئاریایی نەژاد بوون، کە مێژووی هاتنیان بۆ ئێران دیار نی یە . لە نووسراوەیَ ئاشوورییەکانی سەدەیَ نووهەم پێش زایینی دا، لەخەڵکانێ نێو دەبرێت بەنێوی پارسواش، و هەروەها پێشتروتمان لەدەور و بەری دەریاچەیَ ئورومیە یان کرماشاندا ژیاون . بەبڕوای زانایانێ وەکو راولین سون و هومل و پراشک خەلکی پارسواش هەمان پارسەکان بوون . (دکتر محمد جواد مشکور، ایران درعهد باستان، جلد اول ل ١٦٤ ).

هەرچەن لەدوو دەهەیَ ئەم دووایییەدا باوەڕی مێژوونووسان لایەنی ڕەتکردنەوەیَ پەیوەندی نێوان "پارسواش" و "پارسوا" لەگەڵ پارسەکاندا ڕچاوَ دەکات . و لەدەرفەتێکی دیکەدا بەم ڕتکردنەوانە ئاماژە دەکەم، بەڵام ڕەحمەتی دکتر مشکور و زۆربەیَ ڕۆژهەڵاتناسان و مێژوو نووسانی مێژووی ئێران، ئیلا ئەم دوو ئاماژە بەبەڵگە ئاشوورییەکان نەبیَ باسێکی تازەیان بۆووتن نی یە .

ئەوانە هیچ جۆرە ڕەخنەیەکیان لەم بەڵگانە بەدەستەوە نی یە و هەروەها لەئاشوورییەکانن سوپاس دەکەن کە ئەو دوو وشە بەنرخەیان لەبارەیَ پارسەکانەوە خستووەتە سەرزاری خەڵک و پەیتا پەیتا دووپاتی دەکەنەوە و بەم جۆرە بناغەیَ ناساندنی ناسنامەیَ هخامەنشییەکانیان داڕشتووە . بەڵام ئاغای شهبازی لەپاڵ بەپیرەوە چوونی ئەو دوو وشەدا، ڕێگایەکی جیاوازی گرتووەتە پێش تا هۆکارێکی جیاواز بۆ کۆچبەربوونی پارسەکان پێشنیار بکات .

ئەم دەسکەوتە کەگوایە پارسەکان [ و مێدیاکان] لە ئێرانی ڕۆژهەڵاتەوە سەریان هەڵداوە، بۆ مێژووی هخامەنشییەکان گرنگی زۆری هەیە و بەتایبەت بەم دژوارییە سەرەکییە وەڵام دەداتەوە کە ئایینی زەردەشتی لە چ ڕێگایەکەوە گەیشتووەتە پارسەکان و بۆچی ئایینی هخامەنشی لەگەڵ ئایینی گاتەکاند جیاوازی هەیە؟ .
ئارثورکریستن سن لەیەکی لەنووسین پڕ ناوەڕۆکەکانیدا سەلماندویە کە ئایینی زەردەشتی لە هەزار ساڵ پێش زایینی لە ئێرانی ڕۆژهەڵاتدا پیَ گرت و پارسەکان و مێدیاکان پێش لە کۆچبەربوونیان بۆ ڕۆژئاوا، بەوَ ئایینە ئاشنا بوون و لەگەڵ خۆیاندا هێنایان . بەڵام دووایی لەبەرهۆکاری دووری و بەشدارنەبوون لە گەشەپێدان و پەرەسەندنیدا (بەشێوەیَ ئایینی مەزدایی یەشتەکان ) و بەم جۆرە لەگەڵ تێپەربوونی زەمەندا جیاوازی کەوتە نێوان زەردەشتییەکانی ڕۆژئاوا و ڕۆژهەڵات . ئاکامی دیکەیَ ئەوَ بیرۆکە کە هخامەنشییەکان لەئێرانی ڕۆژئاواوە هاتوون، ڕۆشن کردنەوەیَ ئەوَ مژاریَە کە بۆچی پارسەکان ڕادەیەکی زۆرتر باجیان لە هۆزە میسری بابۆلی لودیەیی، هێندیەکان، دەسەند، تا خوارەزمی، و سەغدی، بەڵخی، سکا وئێرانییە ڕۆژهەڵاتییەکانی دیکە، کە ماڵ و سامانی کەمتریان لەوانەیَ تر نەبوو؟ . ئەم پرسە دەگەڕێتەوە بۆ پێشینەی خزمایەتی ئەوانە . دیسان هەر بەم بۆنەوەیە کە پارسەکان

بۆ پاراستنی وڵات و فەرهەنگەکەیان، زۆرترین هیوایان بە پاڵپشتی ئێرانییە ڕۆژهەڵاتییەکان هەبوو و کاتێ تێدەشکان، بەڵخی و سەغدی و خوارەزمییەکان شەڕیان تا ساڵانی دووایی درێژە پێداو لە ئێران داکۆکیان کرد.
(شاپور شهبازی، ارجنامه ایرج، جلد اول ل ٦١٣).

بۆچوونی ئاغای شهبازی لەسەربناغەی زنجیرە چیایەک لە گریمانەی زمان ناسین، هەندێ جار خۆشحاڵکەر، وەکو ڕیشەی وشەی دەروێش لە نووسینەکانی ناوبراودا بەشێوەیەکی دیار، هاتنی هۆزە کۆچەرەکان بۆ دەشتە بەرزەکانی ئێران خۆی دەنوێنێ. ڕێگایەک کە بەڕێزیان دەیناسێنێ، زۆرتر ئاسیای ناوین، واتا باکووری ڕۆژهەڵاتی ئێرانە. ناوبراو کە خوێندکاری مری بویس خانم بووە، بەتەواوی داکۆکی لە زەردەشتی بوونی هخامەنشییەکان دەکات و ڕێگای دەربازبوونی پارسەکان کە لە ڕوژهەڵاتەوە، لەڕاستیدا جادەیەکە کە بۆهاتنی زەردەشت بۆباکوور و ڕۆژئاوای ئێران هەمواری دەکات و کاناڵێکە بۆ بەخزمەت گەیشتنی" باپیرە هخامەنشییەکانی" خۆی.

کەسانێ کە ئەمرۆ بنەڕەتی مێژووی زەردەشت پەیوەند ئەدەن بە ئایینی زەردەشت ڕۆژئاوای ئێرانەوە، هەمیشە دەزانن کە تەواکەری بیروباوەڕی مۆغە زەردەشتییەکانن و لەم بارەوە خۆیان پاشماوەی مۆغەکانن. بەڵام کاتێک کە زەردەشت پایەبەرزی ئەشرافیمان بۆ دەکێشێ، و نیشانی ئەدات کە بەچ شێوەیەک لەکۆڕی گەورە پیاوانی کۆمەڵگای هخامەنشیدا سەری هەڵداوە و دەوروبەری نەیاران و هاوڕێکانی کە ژمارەیان لەسەرتاسەری وڵاتدا زۆر بوو، گەمارۆیان دابوو، تائەو شوێنە دەچنە پێشەوە کە زەردەشتییەکانی ڕۆژئاوا بیریان لێ نەکردووەتەوە. **چونکە زەردەشتیەکانی ڕۆژئاوایان هیچکاتێ بە هخامەنشییەکانەوە پەیوەند نەداوە.**
(ساموئل نیبرگ، دین‌های ایران باستان، ل ٤٠٣)

بەدوواچوونی ڕوانگەکانی تر، دەربارەی ڕێگای هاتنەناوی کومەڵی دووایی هخامەنشییەکان بۆ ئێران، بەو پەڕی سەرسووڕمانەوە، لەلای بەناوبانگترین ڕۆژهەڵاتناسانەوە، هەندێجار تەنانەت تا ئاستی نووسراوەیەکی جێدی کە لە شێوەیەکی شیاو پەیڕەوی بکات حیسابی بۆناکرێت (١).

١_ بەدڵنیاییەوە بیروڕایەک کە باوەڕەکانی بەپاڵدانەوە بەڕاستیەمێژووییەکانەوە بەیان ئەکات، خاوەن نرخ وڕوومەت و شیاوی باوەڕکردنە. ئیستا ئیتر تەنانەت کۆمەڵە کتێبە مێژووییەکەی کەمبریج کە دەربارەی مێژووی ئێرانەوە نووسراوە بۆزۆر کەس جێگای متمانە نی یە. دۆستێکو کە لەکاری وەرگەڕاندنی ئەوکۆمەڵە کتێبەدا خەباتی دەکرد، بەڕادەیەک لەدۆزینەوەی هەڵسەنگاندنێکی شیاودا تووشی نائۆمێدی بوو کە لە ئیدامەی کارەکە چاوپۆشی کرد.

پێشینەیٚ ئیمپراتوری پارس پڕە لە پرس و گومانەیٚ دژبەیەک . ئیستا کە زۆربەیٚ پشکێنەران و زانایان ڕوانگەکانی کایلر یانگ (CAH IV 4ch.1) پەسەن دەکەن کە ئەڵێ: ئێرانییەکان لەدەسپێکدا ڕەوکدارانیٚ بوون کە بەدرێژایی دەورەیەکی مێژوویی لە ئاسیای ناوینەوە بۆ ئێران کۆچبەر بوون . لەوانەیە هەندێکیان لەگەڵ دەسەڵاتە ناوچەییەکانی زاگروس و فارسدا تێکڵاو و لەشوێنی یەکەم (زاگروس) مێدیاکان و شوێنی دووهەم (فارس) پارسەکانیان پێکهێناوە . لێرەدایە کە سەرچاوە ئاشورییەکان لەسەدەی نۆهەم تاهەفتەم بەهەبوونی ئەوانە ئاماژە دەکەن . مێدیاکان کە لە هەرێمی هەمەدان ـ کرماشاندا نیشتەجیٚ بوون و لەتێکستە ئاشورییەکاندا بەبۆنەی هێرش بردن بۆسەر ناوچەکانی زاگروس لەلایەن ئاشورەوە ، وەکو گروپێکی ناسراوتر نێویان دەبەن . (آملی کورت ، هخامنشیان ل ۲۷ )

خانمی کورت هم ، ئێرانییەکان وەکو دانیشتووانی ڕەسەنی ئەو وڵاتە ناناسێت بەڵکو پارسەکان بە کۆمەڵیٚ ئاژەڵدار دەزانێت کە لە ئاسیای ناوینەوە هاتوون و درێژەیٚ قسەکانی بەشێوەیەکە کە لەگەڵ هیچ بریارێکی دیاریکراوی مێژووییدا ناگونجیٚ و دیار نییە ناوبراو لە چ شوێنێکەوە لەگەڵ ئەم پارسانە کە ڕاستەخۆ لە ئاسیای ناوینەوە دەیانهێنی بۆ پارسی هەنووکەیی ، ئاشنا بووە . ناوبراو ئاماژەکەی یانگی قبوڵە کە گوایە پێشتر پشکێنەران و زانایانیش ئەو ئاماژەیان پەژراندووە . ڕێگای کۆچبەرووونێک کە ئاغای یانگ نیشانی ئەدات هەمان ڕێگایە کە ئاغای شهبازی پێشنیاری کردووە . سەرەڕایٚ ئەوەکە لە چەن دەهە پێشترەوە لە نووسراوە وێژەیی وئەدەبییەکاندا ئەم پرسیارە دەکرێت کە مێدیا و پارسەکان لە چ کاتێکەوە هاتوونەتە نێو بەرزاییەکانی ئێران ، بەڵام هێشتا وەڵامێک بەم پرسە نەدراوەتەوە . تا لەم دووایەدا هەندی لە زانایان ڕایانگەیاندووە کە سەرزەویی سەرەکی ئێرانییەکان لە ئاسیای ناویندا هەڵکەوتووە و لەنێوان سەدەکانی نوهەم و هەشتەمدا لەوٚ شوێنەوەوە هەندیٚ لە خێڵەکان بەڵام هاتوونەتە نێو ئێرانەوە . بەڵام هێشتا کومەڵێکی دیکە باوڕیان وایە کە ئەوانە لەئێستێپەکانی ڕوسیا و لەڕێگایٚ قەوقازەوە ڕوویە باشووڕ هاتوون . (م .آ . دندا مایف . تاریخ تمدن‌های آسیای مرکزی ، بخش اول ازجلد دوم ، ل ۱۷ )

بۆچوونەکەیٚ ئاغایٚ (دندایف) ش زۆرتر بو نمایشی سەرلێشواوی مێژوو نووسان و نیشاندانی ڕێگای کۆچبەران بۆ خاکی ئێران باشترە . جێگای سەرنجە کە هەمووی ئەو بەڕێزانە خێڵە باکووڕییە کوچبەرەکان کە دەیانەویٚ لەیەکی لە ڕێگا لەپێش چاو گیراوەکانەوە بیانهێنن بۆ ئێران ، هەموویان خێلەکانی باکووڕین بەڵام کاتیٚ دێنە سەرزەوینیٚ کە خاوەنی کۆمەڵگا و شارستانیەتی کۆنن ، پێشتر

دەبن بەئێرانی و پێیان ئەیژن پارس . ئەم ئاغا و خانمانە وەکو شتێک پێش لەهەزارەی یەکەمی زایینی کۆمەڵگا و شارستانیەتێکیان لەم سەرزەبینەدا نەدۆزییێتەوە، بە بوێری و جەسارەتەوە، کە زۆرتر بەگەمژەیی و سایلوحییەوە نزیکە، بەڕاشکاوی دەنووسن : تەنیا لەسەدەکانی نۆهەم و هەشتەمدا لەئاسیای ناوینەوە هاتوون و بەم جۆرە هەمووئەو ئێرانییە هەڵکەوتووانە کەبناغەی بەشێک لەشارستانیەتی ڕۆژهەڵاتیان داڕشتوە، دەیانخەنە پشت گوێ . بەم زووانە ئەیژم کە تەواوی ئەو باسانەکە پێ ئەیژن مێژووی پڕلە شانازی ئێران و هخامەنشی، و ترنجاونەتە نێو مێشکی ڕوناکبیری ئێرانی، و لەوێەوە، بەتایبەت لەڕێگای کتێبە دەرسییەکان و هەڵسەنگاندنی لەنموونەی "کورش مەزن" داویانە بەخۆردی ئێرانییەکان، لەچ سەرچاوەیەکەوە هەڵقوڵیوە .

جێگای سەرنج و سەرسووڕمانی زۆر ئەوەیە کە هەر مێژوونووسێکی ڕۆژهەڵاتناسی بێلایەنیش، ئاگادارانە گوێ بەهەبوونی هۆزە پڕژمارە دێرینەکانی دانیشتووی ئێران نادەن کە پێش لەهخانەنشییە-کان، هیچ نەبێ دوو هەزارە لەئێران جێگیربوون و پەرەسەندن و پێشکەوتنیان تاقی کردوەتەوە .

ئێران ناسان و زانایانی مێژووی ئێران هەوڵ ئەدەن کە لەدایکبوونی ئیمپراتوری هخامەنشی لەگەڵ مێژووی ئێراندا هاوکات بزانن و بەقەس لەئاستی ئەو ڕاستییە چاو وگوێی خۆیان دەگرن . وێنە و پێشکەشییە دەسکردەکانی ئەوخەڵکانە لەبەردە نووسراوەکەی هوڵی گشتی تەخت جەمشیددا میلەتانی داگیرکراو نیشان ئەدا کە چاوەڕوانی گەیشتن بەخزمەتی داریوشن . واتا پادشای خێڵێکی داگیرکەر و تازەگەیشتوو کە تەنیا ١٥ ساڵ لەتەمەنی داگیرکەریەکەیان تێپەڕ کردووە .

زانایانی ناوبراو ئەو خاڵەیان نەبینیوە کەهەمووئەو کەرەسە دەستکردەانە کەبەنێوی هخامەنشییەوە ناسراون، تەنانەت تەخت جەمشیدیش، شانوێەکی گەشەکردوو لە فەرهەنگ، پیشەسازی و ئەندیشەی بیرمەندان و هونەرمەندانی پێش لەهخامەنشییەکانە .

ئەم مێژوونووسە بناغەناسانەی مێژووی ئێرانە، بەشێوەیەی جۆربەجۆر و بەنەزانم کاری ئاگاهانەوە هەوڵ ئەدەن ئاسەوارەکانی سەردەمی هخامەنشی بەنێوی هۆزێکەوە تاپۆ بکەن کە بچوکترین نەقشیان لەئافراندنی ئەوانەدا نەبووە . مێژوونووسانی ناوبراو تەنانەت ئەوخاڵەش ئاشکرا ناکەن یان لەبیری خۆیانی دەبنەوە کە هەرچی لەمێژووی ئێراندا ماوەتەوە بەڕۆشنی وئامێکی شیاوە بۆ

هەوڵە نەزانانەکەیانە کە هێرشبەرانی هخامەنشی، ئەشکانی و ساسانی، پاش تێکشکاندنیان لەلایەن ئەسکەندەر و عارەبەکانەوە ، وەکو بۆ ئاسمان هەڵهاتبێتن هیچ شوێنەوارێکیان بەنێوی نەتەوە و مێلەت لەخۆیانەوە لەم وڵاتەدا بەجێ نەهێشت. پێکهاتەی ئیتنیکی ئێرانی ئەم سەردەمە هەمان پێکهاتەیە کە وێنەکەی لەبەردە نووسراوەکەی تەختی جەمشیددا دەیبینین بەهەمان ناو و نیشانەوە، لەحاڵێکدا ناونیشانی ئەو هۆزە هێرشبەرانە کە ئیمپراتورییەکانی ئێرانی کۆنیان پێکهێنا بەدەستەوەنییە و ئەمە باشترین نیشانەیە کە ئەوانە ئێرانی نەبوون(١).

وەها بەدی دەکرێت کە هاتنی ئاریاکان بۆسەرزەوییە پرفەرهەنگەکەی مێزۆپۆتامیا لە چیاکانی ڕۆژهەڵاتەوە ئەنجام بووبێت. بەڵام ئاشکرا نییە و هەروەها نییە کە ئەوانە لەکام لایەنی باکوورەوە تەشنەیان کردووەتە نێو دەشتە بەرزەکانی ئێران. لەقەوقازەوە، یان لەئاسیای ناوین، یان لە هەردوو لاوە و لەوانەیە کەلە دوو ڕێگاوە (واتا ئاسیای ناوین). (ریچارد . ن . فرای، میراث باستانی ایران، ل ٣٧)

بەمجۆرە و بۆئەوەی کە نزیکەی بەهیچ ووتارێکی تازە نابینین کە ئاماژەی بەسەرهەڵدانی هۆزی

١ . بێگومان هێزە ئێرانییەکانی پێش لە هخامەنشی و شارستانییە کۆنەکانی دیکەی مرۆڤایەتی، لە ڕێگای زیادبوونی ژمارەیی و لە سەردەمەکانی دێرینە بەردی و نوێ بەردیدا، یەکیان گرتووە و کۆمەڵەکانی ئەوکاتەیان پێکهێناوە، هەروەها کەلەنەقشەی ڕووبەڕوودا دەبینین، نە لە ڕێگای کۆچبەربوونەوە. ئیلا کوچبەربوونی ئایینی و سیاسی سەردەمی دێرینە وەکو کوچبەری یەهودی و موسڵمان نەبێ، ئەوانەی دیکە واتا ئەو کۆچبەر بوونانە کە بۆدرێژەپێدانی ژیانی ڕۆژانەبوون، خولقێنەری شارستانیەت نەبوون، بگرە ڕووخێنەریش بوون، چوونکە ئەگەر پێداویستییەکانی ئافراندنی شارستانییەت لەهەرێمێکدا ئامادەبێ، ئیدی کۆچبەربوونی دانیشتووانی ئەو شوێنە پاساوێکی نییە. هاتنی هخامەنشییەکان بۆ مێزۆپۆتامیا کە لە هەرێمێکی نالەباری باکوورەوە سەرەوخواربوونەوە، نەیدەتووانی خوڵقێنەری چ جۆرە شارستانیەتێک لە ئێرانی کۆندا بێت، کەپێش لەوان سەرتاسر پڕبوو لە ناوەندی شارتانییەتی جورێەجۆر. وێنەی لاپەڕەی ڕووبەڕوو کە لە کتێبەکەی ئاغای گیرشمەن (ئیران لە دەسپێکەو تائیسلام) گیراوە، بەشێک لە شارستانیەتی سیەلکە لەسەردەمی نوێ بەردی لەئێران و سیەلک، خشڵی خۆرازانەوە وهەندی ئامرازی چکۆلە وەکو دروێشیان لە مسی پەتی دۆرست دەکرد و بۆ ئەم کارەش لەڕەوشتی چەکوشکاری سوودیان دەبرد. ئەم شتانە لەگەڵ تێپەڕبوونی زەمەندا جۆرێەجۆر و پێشکەوتووتر و لەلایەنی قەبارە و بیچم و بەکاربردنەوە تێهەلچووتر بوو. یەکەم شتی دۆرستکراو بەشێوەی تواندنەوەی مەتاڵەکان و دارشتن لە قاڵبدا وەکو ئامرازی تەشوی دەمپان و پێمەڕە، دەور و بەری ٤٥٠٠ پێش زاینی لە سیەلک و تەپەی قەبرستان و باشووری تل ئیبلیس‌دا سەری هەڵدا، **کە ڕێکەوتێکی گرنگ لە گەشەکردنی شارستانییەتی مرۆڤایەتیدا دەژمێردرێت.** (ژان گلین، پیش ازتاریخ، فصل هفتم بەقلم سرژ کلو زیو، ل ٩٦٠ متن اصلی)ڕوژهەڵات ناسان، هخامەنشییەکان بە ئێرانی نێو دەبەن کە تائیستا زانایی و بلیمەتی دۆرستکردنی سوورویەکی مل گوێدرێژیان پێ نییە و دۆزراوەکانی هەنوکەیی دەرزییەکی پیش گەیشتنی ئەوانە بە ئیمپراتوری تێدا نابینرێت. و خەڵکانی ئێرانی کۆن کە شارستانیەتی سیەلک دروشاوەترین نموونەکانیەتی، ناوچەیی ناشیرین و دێو و شیاوی کوشتن دەزانن.

کۆچەری پارس لەئێراندا کردبێ . و ناچارین بگەرینەوە بۆهەمان تێکستە کۆنەکەی گیرشمەن ، و مامۆستا بریان . لەگەڵ ئەوەشدا هەوڵ ئەدەم کە تیشکێکی تازە بخەمەسەر هەندێ لەبەڵگەکان ، بەڕوانگەیەکی جیاوازتر لەوانەی گیرشمەن و بریان .

سەرجەم بەڵگەنامەکان وەها لەیەک ئەدرێتەوە کە هۆزی هخامەنشی لەئایەندەی ئەوکاتەدا بەڕادەی هۆز و نەتەوەکانی پیشتری ئێرانی کۆن ، تازەهاتووترن و بەزمانێکی دیکە ، دەتووانین ئەوانە بە دوواکۆچەران و تەنانەت تەنیا خێڵی کوچەر لەمیانەی سەدەی شەشەمی پێش زاینی بزانین ، بەڵام ئەگەر ووتەی ئێران ناسان بەئامازەی پارسوا و بەڵگە ئاشورییەکانەوە پەیوەند بدەین و بە پارسیان بزانین ، تەنیا بەو هۆکارە کە یەکەم جار لە دەوروبەری ئورومیە و رووباری ئارازدا بینراون ، زۆر پیدەچێ کە لە ئیستێپەکانی باشووری روسیا و لە ڕێگای قەوقازەوە کۆچبەری ئێران بووبێتن . بێ گومان ئەگەر بمانەوێ سەرنجی ووتەکانی دیکە و لەوانە ، ئاغای شهبازی بدەین کە پیێدادەگری و ئەڵێ: ئەوانە لەدوورترین خاڵی ڕۆژهەڵاتەوە هاتوونەتە نێو ئێرانەوە ، لەوحاڵەدا سەرتاسەری ڕێگاکەیان تا دەوروبەری ئورومیە ، هەروەها کە لە نەقشەکەشدا دیارە ، لەلایەن نەتەوەی جۆربەجۆر و وەکو پێویست پرهێز ، داگیرکرابوو و ئەمە دوور لەباوەڕە کە کاتی دەربازبوون لە هەرێمی هۆزە دێرینەکانەوە شوێنەوارو ناونیشانێکیان لەخۆیانەوە بەجێ نەهێشتبێت و بەگشتی بەشێوەیەکی ئاشتیخوازانە لەو ڕێگاوە دەرباز بووبێتن . هەروەها کە مێژوو شایەتی ئەدا ، دەربازبوونی سکاکان لەم ڕێگاوە و لەهەمان کاتدا تێپەڕکرد وبەبهای دژوارێکی زۆر و شەڕ و پێکدادان لەگەڵ هوزە نیشتەجێ بووەکاندا بەڕێوە چوو .

مێژووی سکاکان هاوبەشی زۆر نزیکیان لەگەڵ کۆچبەر بوونی خێلە نیشتەجی یەکانی دراوسێ چین دا هەیە . ئەوانە لەژێر زەختی یوا ـ چی یەکاندا ناچاربوون کە هەرێمەکەیان بەجێ بهێلن و بۆلایەن باشوور ڕێکەون و ڕۆژئاوا و بەڵخ بگرنە ژێردەسەڵاتی خۆیان . لەکابوڵ "هیند و یونانی یەکان" لە پێشڕەوی زۆرتری سکاکان بەرگرییان کرد و ناچاربوون کە بولایەنی ڕوژئاوا و هێڵی هەرات و دووای سیستان بایێبدنەوە . لەکوتاییدا ئەم ناوچەیە بەنێوی ئەوانەوە بەسیستان ناوبانگی دەرکرد . لەو کاتەدا پارتەکانیش وەکو بەرگرێک بۆ هەرجۆرە کۆچبەربوونێک لەلایەن ئاسیای ناوینەوە هەڵسوکەوتیان کردو بەم جۆرە ڕێگای کۆچبەر بوون بۆهێلێکی دیکە گۆردراو سکاکان ناچاربوون ڕێگای سێندی خوارو (هێندوسیت) بگرنە پێش . (ب . ن . پوری ، تاریخ تمدن‌های آسیای

مرکزی، جلد دوم، ل ٢٤٥)
لەحاڵێکدا کە سکا بەدەسەڵاتەکان، لە هێڵی کۆچکردندا ملیان ئەنا و بۆ لایەنی ڕۆژئاوا کەوتبوونە ڕێ و ڕوویە ئێران دەچوون، نائومێد و ناچار بەگۆڕینی ڕێگاکەیان بۆباشوور، هۆزێکی کەم ژمارە وەکو هخامەنشی کە پێش گەیشتن بەئێران هیچ ناوونیشانێکیان نەبوو، نەیانەدەتوانی بەئاسانی لەدوورترین خاڵی ڕۆژهەڵاتەوە خۆیان بگەیەنە ئورارتو، بەڵام ئەگەر ناوەندی سەرەکی ئەوانە ئیستێپەکانی ناوڕاستی روسیا دابین بکەین، دەکرێ شوێنەواری سەرهەڵدانی دوایی ئەوانە کەنارەکانی دەریاچەی ئورومیە، و نێوی پارسوا بێت کە لەبەڵگەنامەکانی ئاشوریدا ئاماژە کراوە. چوونکە هەروەها کە لەسۆرشتی باکووڕەوە دیارە، ئەوانە تانزیکی رووباری ئاراز لەگەڵ داکۆکی پرهێزێکدا ڕووبەڕوو نەبوونەتەوە کە پێش بەکۆچبەرییەکەیان بگرێت و دیارە کە نەیانتووانیووە لەگەڵ هۆزی ئورارتوردا بەرانبەرکی بکەن و لە پراوێزی ئەواندا نیشتەجێ بوون.
سەرەڕای ئەوەش لەبەر ئەوە کە ئێمە بەشوێن مژاری هخامەنشییەکانەوەین، کۆمەڵێک ڕوانگە و نیشانەمان هەلبژاردوە کە نیشانی ئەدەن: یەکەم لەگەڵ هەوەڵی نموونەی سەرهەڵدانی پارسەکانی ئەم دووایییەدا، تەنیا لەسەدەی هەشتەمی پێش زایینیدا ڕووبەڕوو دەبینەوە. دووهەم: بێگومان ئەوانە تەنیا دەتووانن لەڕێگای قەوقازی باکووڕەوە کۆچبەری ئێران، یا هەڵهاتبێتن.
ئەم دوو پرسە، پێش لەهەرشتێک دەیسەلمێنێت کە یەکەم: هۆزێک کە نێوی پارسبووە لەهۆزە ڕەسەنەکانی ئێران نەبووە و لەبەر ئەوە کە نەتەوەکانی ئێرانی دێرینە نە کۆچبەر، بەڵکو وەکو نەتەوەکانی دانیشتووی مێزوپۆتامیا و ناوەندی کۆمەڵ و شارستانییەتەکانی دیکەی جێهان گەشە کردووی یەکەمی کۆمەڵەکانی سەردەمی بەردی ناوڕاست و نوێ بەردییە. سۆرشتییە کە هخامەنشییە- کان تەنیا هۆزی کۆچبەر بۆئەم وڵاتە بزانین کە کاتی سەرهەڵدانی ئەوانە لەئێراندا، هاوکاتی جێگیر بوونی شارستانیەتی کۆن و ناوەندی بەرهەمهێنانی خەڵکانی خاوەن شارستانییەت و فەرهەنگی بەرز بووە. بەشێوەیەک کە ئاکامی باسەکە ئاشکرای دەکات، هەر بەم بۆنەوە جێگایەکیان بۆ نیشتەجێ وون نەبینیەوە. بەم جۆرە دەتووانین بۆ ئاماژەکەی گیرشمەن بگەڕینەوە کە بەڕاستی باوەڕی هەیە، کۆچبەرەکان ناچار بوون کە وەکو سەربازانی بەکرێگیراو لەخزمەت سەرکرد ناوچەییە- کاندا بن.
دابەشبوونی ناوچە کە بە بەشی چکۆل، چکۆلە و جۆربەجۆر لە نیشتەجێبووندا یارمەتی دان. زۆرینەی **ئەوانە**

**لە گەڵ گروپە سوارەکانیاندا چوونە خزمەتی سرکردە ناوچەیەکان. ئەوانە زەلامانێک بوون کە لەڕێگای شمشێرەکانیان و وەکو سەربازی بەکرێگیراو ژیانیان بەڕێوە دەبرد** .(ر . گیرشمەن ، ایران ازآغاز تا اسلام، ل ٧٠) .

گریشمەن هەوڵ ئەدا کە هاتنی ئورارتوەکان، دوواگروپی پارسەکان و مێدیاکان بۆ ئێران ، هاوکات و لەدسپێکی هەزارەیٚ ئەوەڵی پێش‌زاینی بزانێت . ئەم وێنەیە پەسەند ناکرێت، چوونکە ئەگەر ئەم سیٚ‌هۆزە هاوکات کۆچبەری ئێران بووایەن ، ئەیٚ بۆچی کاتیٚ کە پارسەکان لەدەوروبەری دەریاچەیٚ ئورومیەدا ، وکو هۆزێکی نەناس و بی‌وڵات سەرهەڵئەدەن، ئورارتو و مێدیاکان خاوەنی وڵات و پاتەخت و ناسنامەیٚ نەتەوەیی و ئەرتەش و بەرهەم و فەرهەنگی سەربەخۆ بوون، بەڵام پارسەکان ئاخرگروپ وەکو پراوێزێک لەمێدیاکان بەبیٚ نیشانەیەکی‌فۆرمی ، لەدەورو بەری کرماشاندا دەژیان و لەسەرهەڵدانی ئەوانە هیچ‌نیشانە و شوێنەوارێک لە ناوەندی شارستانییەت بەدەستەوە نی‌یە ئیلا ئاماژە بە وشەیەک لەبەڵگەنامەکانی ئاشوریدا نەبیٚ؟ . ئەم وشەش دەتووانی هیچ‌جۆرە پەیوەندییەکی بەوانەوە نەبێت . کەوابوو پێویستە مێدیاکان و ئورارتوەکان لەدەسەڵاتە ناوچەییەکان دێرینەتر بزانین و یا مل بۆ ئەو ڕاستییە دانەوێنین کەپارسەکان لەڕوانگەی ژمارە و دەسەڵاتەوە بەڕادەیەک لاواز بوون کە لە نیشتەجیٚ‌بوون لە شوێنێکی جوغرافی‌دا لەدوو هۆزەکەی دیکە دوواکەوتووتر بوون .

ئاشورییەکان لەساڵ ٨٤٤ی پێش زاینی‌دا، پارسەکان (پارسوا) ولە٨٣٦ دا مێدیاکان (مادای) بەناو دەکەن . بەڵام ئەوە نیشانەیٚ ئەوە نی‌یە وەها بیربکەینەوە کە هۆزی‌پارس پێشترلە مێدیاکان هاتوونەتە نێو ئێرانەوە . ئەگەر وتەیٚ نووسەر ئاشورییەکانمان قبوڵ بێت، لەم سەردەمەدا پارسەکان لەباشووری ڕۆژئاوا و دەریاچەیٚ ئورومیە و مێدیاکان لە باشووری ڕۆژهەڵات نزیکی هەمەداندا نیشتەجیٚ بوون . **بەهەرحاڵ وەها نی‌یە کە ئەم ناوانەیٚ ــ پارسوا و مادای ــ بە واتایٚ نەژادی و ئێتنیکی بەکار برابێت، بەڵکو لەوانەیە زۆرتر لەوە بیربکرێتەوە کە ئەم ناوانە بە تۆخییٚ بوتریٚ کە ئەوٚ هۆزانە لە نیوەی سەدەیٚ نوهەمی پێش زاینیەوە تێدا نیشتەجیٚ بووبێتن.** (ر . گریشمەن، ایران از آغاز تا اسلام، ل٧٧ و ٧٨)

گریشمەن دیسانەوە لەقەس ئاماژە بەم خاڵە بناغەییە ناکات کە هێنانی نێوی مێدیاکان لە

بەڵگەنامەیْ ئاشورییەکاندابریتیە لە سەرزەونیْ کە دانیشتووانەکەیْ هیچ نەبیْ، پاتەختێک بە مەزنایەتی هەمەدانیان پێک هێنابوو و هێنانی نێوی پارسوا دەتووانیْ تەنیا بەتاکە ناوێک ئاماژە بکات و هیچ نێوێکی واتاداری فەرهەنگی و مادی نی‌یە. گریشمەن هەوڵی داوە ئەوە بسەلمێنێت کە نێوی پارسوا نە بەهۆزی پارس بەڵکو بە جوگرافیای ناوچە کە ئاماژە دەکات.

هەست بەوە ناکرێت کە مانەوەی پارسەکان لەباکووری ڕۆژئاوای ئێراندا ماوەیێکی زۆری خایاندبێت. گواستنەوەیْ ئەوان یا ئاکامی شەڕ لەگەڵ ئاشورییەکاندا بووە و یا بەهۆیْ وشاری ئورارتو یا هێزێکی دیکەیْ ناوچەکە. ڕاستییەکەیْ ئەوەیە کە لەسەدەیْ هەشتەمی پێش زایینی‌دا ئەوانە لە حاڵی جموجوڵ و پێشڕەوی ئارام ڕوویە باشووری ڕۆژهەڵاتی ئێران و داوێنەکانی زاگروس‌دا بوون. و لەوانەیە دەور و بەری ٧٠٠ی پێش زایینی لە لایەنی ڕۆژئاوایْ چیای بەختیاری تا ڕۆژهەڵاتی بازێری نویْ شوشتەر، لە شوێنێک کە خوێیان پارسواش، پارسوماش نێویان ناوە - گرسابێتنەوە. نێوی پارسوا لە ساڵنامەکانی ئاشوردا نووسراوە. **ئەوْ جۆرە کە لەوْ خولەدا زۆرجار ڕێکەوتووە، خێڵەکان نێوی خۆشیان بە شوێنیْ کە لێەوە هاتبوون و هەم بە شارە گەورەکانەوە لکاندوە.** (ر، گریشمەن، ایران از آغاز تا اسلام، ل ٨٩).

بەڵام ئاغای گریشمەن لەوْ دەربرینەی سەرەوەدا بەتەواوی لە باوەڕە پێشوەکەی کە چەن لاپەڕە ئەولاتر ووتویە، دوور دەکەوێتەوە و ئەڵیْ سەرزەوینی پارسواش نێوەکەیْ لە دانیشتووانەکەیەوە وەرگرتووە! بەڵام زۆربەی مێژوونووسان لە ڕوونکردنەوەیْ ساڵانی وەها دوور و بۆداهێنانی بزاوی مێژوویی، لەمجۆرە پژوێڵاو ووتنانە ناچارن. بەمجۆرە لەحاڵێکدا هاوڕێنەکانی پارسەکان لەئورارتو و مێدیادا نیشتەجی بوون و ڕێکخراوە کۆمەڵایەتییەکانیان پێکهێناوە، پارسەکان کە بەوردی دیار نی‌یە لە چ شوێنێک نیشتەجێن، بەپاڵدانەوە بە ئاماژەی نووسەرانی ئاشوری، لە باکووری دەریاچەیْ ئورومیە، ڕوویە باشووری ناوچەیەکی خوزستان سەروخوار دەکاتەوە و دەیگوێزێتەوە بۆ شوشتەر. ئەگەر ئاماژەیْ یەکەمی نووسەرانی ئاشوری بە"پارسواش"لەدەوروبەری ئورومیە و ئاماژەی دووەمیان بە"پارسوا" لە دەوروبەری شوشتر، بەپارسەکانی دووابیەوە گرێبدەین، ناڕاستەخۆ قبوڵمان کردووە کە ئەوانە هۆزێکی بچوک و کەم دەسەڵات بوون کە لەڕێگایْ کۆچکردنەکەیاندا تەنیا بە خزمەتکردن و یارمەتی وەرگرتنی هۆزە نیشتەجێەکان ژیانی خیلەکی خۆیان بەڕێەە بردووە و ئەگەر ئەم شوێنەوارەش بەهی ئەوان نەزانین، ئەوکاتە تا سەرهەڵدانی

کورش مێژوو و جوگرافیای ئێران بەبێ نیشانە دەمێنێتەوە و هەبوونی مێژوویی پارسەکان بێبەری لە هەرجۆرە پێشینەیەکە.(١)

ئەڵبەتە من بۆ هەبوونی ئەم هۆزە لەڕۆژهەڵاتی ناوڕاستدا گریمانەی خۆم دیتوەتەوە کە لە بەشەکانی دووایبدا ئاشکرای دەکەم، بەڵام بەبێ سەرنج بەو گریمانەش، لەوانەیە کە کۆچبەربوونی ئەم هۆزە لە ئاڵوگۆڕەکانی هەرێمەکە و لە گەرماگەرم و دەنگ و هەرای تێهەڵچوونە پەیتا پەیتای هۆزەکانی مێزوپوتامیادا لەگەڵ خۆی و خەڵکانی ڕۆژئاوای ئێران، تەنیا لە دەوروبەری ٦٥٠ی پێش زایینی و ئەوەش لە ئیستیپەکانی باشووری ڕوسیاوە و لەڕێگای سنوورەکانی ڕۆژئاوای ئێرانی هەنوکەیەوە زۆر ڕاستتر ئەنوێنێت. پێدەچێ کە یەکی لە شارستانیەتەکانی ناوچەکە ئەوانەی لە ئیستێپەکانی ناوەندی ڕوسیاوە بۆیارمەتی بانگێش کردبێت و وەکو بەکرێگیراوکەڵکی لێوەرگرتوون، و پاش کۆتایی شەڕ لە کۆچبەربوونێکی بێ هۆکاردا ڕوویە باشووررِاویان ناون. بەم جۆرە شارەزایی و گۆزەرانی ئەم خێڵە، هەروەها کە چەن جار ئاماژەی پێکراوە و شێوەی دەسەڵاتی ئەوانە بەسەر ناوچەکەدا، بریار ئەدا کە تەنیا توانویان لە ڕێگای شەڕاشۆیی و تاڵانەوە لە ژیانێک کۆچبەریدا ژیابێتن. بەپێچەوانەوە ئەگەر قبوڵی بکەین کە لە دەسپێکی هەزارەی یەکەمی پێش زایینییەوە لەم سەرزەوییەدا نیشتەجێ بوون، چۆن دەتووانین نەبوونی تەواوی نیشانە فەرهەنگی و مادییەکانی

١. ئەڵبەتە زانیاری و لێکدانەوەی ئێمە لە بەڵگەنامەکانی مێزوپۆتامیا، بەئاشوری و بابۆلی و سومەرییەوە لە دەربڕینی ڕۆژهەڵاتناسانەوە سەرچاوە دەگرێت کە سەرنجی ئەم کتێبە لەسەر ئاماژەکانی دووایی، دەتوانێ بەتەواوی بەدرۆێ بخاتەوە، و تەنانەت بە سەختەکاری بزانێت و بۆ ئەوەی کە هیچ کام لە ئێمە سودێکی ڕاستەخۆ لەو بەڵگەنامانە نابەین، نازانین کە لەڕاستیدا بەڵگەکانی ئاشوری و ئەوانەی دیکەش، هەڵگری چ باسێکن. لەوانەشە ڕۆژهەڵاتناسان و مێژوو نووسانی ئێرانی و نائێرانی لە خوڵقاندن و قبوڵکردنی ئەوە کە"پارسواش" و"پارسوا"ی ناوبراو لە ساڵنامەکانی ئاشوری، و ئەڵبەتە بەبێ هێچ نیشانەیەکی شیاو ناچارن ئاماژەیەک بە پارسەکان و هخامەنشییەکانی ئەم دووایییە بکەن. چوونک پێچەوانەی ئەمە، هۆکارێکی ئیمپرایورییەکەیان پێش لە کورش و داریوش لە بناغەدا بێ ناونیشان دەمێنێتەوە، سەسوورهێنەرە کە تا سەد ساڵ پێش لە ئیستا، لە هیچ بەڵگەیەکی نەتەوییمان و تەنانەت لە شاهنامەشدا، نێوی ئەم ئیمپراتورییە نەبراوە و هیچ ئیرانیەک، ئەم ڕۆژهەڵاتناس و بناغەدانەرانەی مێژووی ئێرانە ناس ناکەن. ئایا سەرسووڕهێنەر نی‌یە کە"ئیبن بەڵخی"لە سەدەی پێنجەمی کۆچیدا"لە فارس‌نامە"هیچ شتێک لە هخامەنشییەکان نازانێت و ناوی ئەوانە نابات؟.

ئەوانە لە ناوچەکەدا پاسا بکەین . بەدڵنیاییەوە ناتوانین هیچ نموونەیەکی دیکە لەکۆمەڵانی مرۆڤ بدوزینەوە کە پیش گەیشتن بە دەسەڵات وەکو پارسەکان بێناونیشان وناسنامە بووبێتن . بەمجۆرە توێژینەوەی ووردتر و دوودڵانەیٔ مێژوو لە دیسان ناساندنی ئەم هۆزە ، بۆپشکێنەرانی مێژووی ئێران ، یەکجار پێویستتر لە ڕۆشنکردنەوەی نەقشەکانی پاسارگاد ، تەخت جەمشید و شوشە ، کە هەمووی ئەوانە بەرهەمی هونەر و دەسمایەکانی ئیرانی ۲۰۰۰ پێشتر لە هخامەنشییەکانن .

مێدیاکان و پارسەکان یەکەمین جار لەساڵنامەیٔ ئاشورییەکاندا ئاماژەیان پێکراوە . کاتیٔ کە لە ۸۳٦ پێش زاینی شەلمانسەری دووەم لە پادشاکانی "پارسوا" ڕۆژئاوایٔ ئورومیە باجی سەند و گەیشتە باشووری ڕۆژئاوای ئاوەکانی مێدیا . لەوەبەدووا ئەم دوو خەڵکە هەمیشە نێوی براوە . نزیکەی ۸۲۰ی پێش زاینی ، شمشی ئادادی پێنجەم ئەوانە یٔ لەشوێنیکدا کە ئیستا پیٔئەڵێن پارسواش بۆلایەنی کرماشانی ئیریکردووس ، لە۷۳۷ی پێش زاینیدا (کتلات پیلصر سوم؟) پەلاماری ناوەندی پارسواشی دا و لە سەرکردەکانی مێدیا باجی سەند . (اومستد ، تاریخ شاهنشاهی هخامنشی ، ۳۱)

وەکو اومستد ئەڵی لەنێوان ساڵەکانی ۸۳٦ تا ۷۳۷ی پێش زاینیدا ، واتا بەدرێژای سەد ساڵ پادشاە و سەرکردەکانی ئاشوری ، پارسەکانیان لەسیٔ ناوچەیٔ جۆروبەجۆردا بینیوەتەوە کەئەو سیٔ ناوچە گەلێک دوورتر لەناوەندی دووایی ئەوانە ، ئانشان و پارسە هەڵکەوتوون . بەم جۆرەیە کە کۆچبەرە باکوورییەکان کە وەکو ئەڵێن ، لەدەسپێکی هەزارەی یەکەم پێش زاینی هاتوونەتە نێو خاکی ئێرانەوە ، پاش ۲٦۰ ساڵ هێشتا هەر ئاوارە و نیشتمانێکی بیٔخاوەنیان نەدیتوەتەوە ، تا وەکو ئورارتو ، مێدیا و ئیلام تێدا بحەسێنەوە . ئایا وەها ئاوارەییەکی دوور و درێژ کە هێشتا پێویستە دوو سەدەیٔ دیکە بخایەنێت ، بەچشێوەیەک ئەبیٔ لەیەک بدرێتەوە ، ئیلا ئەوە نەبیٔ کە یا پارسوا و پارسواش لەبناغەدا هیچ جۆرە پەیوەندییەکیان بەپارسەکانی دووابییەوە نییە و یا ئەم ئیمپراتورانەیٔ داهاتوو پاش تەشریف هێنانیان بۆ پادەشتە بەرزەکانی ئێران تا چەندین سەدە هیچ حیسابێکیان بۆ نەکراوە و هەڵتۆقینی ئەوانە بۆ دەسەڵات ، وەکو خەڵکی ئاسایی ئەڵی ، یەک شەوە و بەبیٔ ئامادەکاری مێژوویی ئەنجام بووە .

بەهەرحاڵ گیرشمەن پاش نیشتەجیٔبوونی ئەم هۆزە لەباشووری کرماشاندا ئیتر ناویان نابات و لە لاپەڕەکانی دووایی کتێبەکەیدا ئەچێتە سەرباسی سکاکان ، ئورارتوەکان ، مێدیاکان و کورتە

باسیک لەمیژووی بابوڵ. بەڵام لەپڕ و بێ هیچ پێشەکییەک، پارسەکان دێنێتەوە گۆڕەپانی مێژوو و ئەوانەتادەسەڵاتداری هەمووجیهان سەر دەخات، ئەو پارسانە کە لە سنووری شارستانییەتی ئیلامدا، واتا دەورویەری شوشتەر بەجێ هێشتبوون!.

نەبونید خۆی بۆ داکوکی بەرانبەر بە ئاستیاکس ئامادەدەکرد و زیرەکانە لەگەڵ کورش دووەم پادشای پارسەکان، کە حەزی دەکرد جادەی گەورەی بازرگانی هەمەدان بگرێتە ژێرچاودێری، یەکیتیەکیان پێکهێنا. نەیاری تازە، پادشاهی پارس کەئەوکاتە لە ڕادەی پێگەیشتندا بوو، هاتە گۆڕپانی بەبەرەکانی هۆزی گەنج و پڕهێزی پارس بەنۆرەی خۆی لەژێر فرمانداری پادشاکەیدا، کە یەکی لەبوێرترین پێشوایانی دنیای کۆنبوو، بۆ بەدەس‌خستنی جیهان هەوڵیان ئەدا. (گیرشمەن، ایران از آغاز تا اسلام، ل ١١٨)

سەردەمی دەسەڵاتداری نەبونید (٥٣٩ـ٥٥٦ پ. ز) و لەگەڵ سەرهەڵدانی کورش‌دا هاوکا وەکو گیرشمەن ئەڵێ، نزیکەی چوار سەدە لەکۆچبەربوونی پارسەکانی سریەی دوایی بۆئێران و ١٥٠ ساڵ لەنیشتەجێبوونیان لەباشووری شوشتەر، تێپەڕی کردووە. بەڵام ئاغای گیرشمەن نایێژێ کە ئەم خێڵە ئاوارە، چۆن لەم مەجاڵەدا پێگەیشتن و بەهێز بوون، چوونکە مێژوو هیچ‌جۆرە نیشانەیەک لەم پێگەیشتنە بەبیر ناهێنێتەوە: دووا کومەڵی پارسەکان هێشتا شاریان نی‌یە، لەبەرهەم و بەرهەمهێنانیانەوە هیچ‌نیشانەیەک بەدەستەوەنی‌یە و فەرهەنگی نەتەوەیی پیتی نووسین، نەقش و ڕەنگێک پێش لە هەڵهاتنی ئیمپراتورییەکەیان بەنێویانەوە تاپۆ نەکراوە.

گیرشمەن کە وێنەی ووردی گەشەکردن لەنێوان ئورارتو و مێدیاکان، بەو جۆرە کە لە سیەلک بینیمان، لەکتێبەکەیدا خستویەتە پێش‌چاو، بێ‌ئەوە کە بەبناغەی دەسەڵاتی مادی، هونەری و کۆمەڵایەتی پارسەکان ئاماژە بکات، هەوڵ ئەدا کە لەم خێڵەبێ‌ناونیشانە، ئیمپراتورییەک کە پێویستی پی‌یە بیخوڵقێنێ.

بەڵام دەربارەی پارسەکان، ئەبێ بوترێ کە دەورویەری ساڵی ٧٠٠ ی پـز. ئەوانە لەکیوە لاوکیەکانی زنجیرە چیای بەختیاری، لەڕۆژهەڵاتی شوشتەر، ناوچەیەکی هەڵکەوتوو لەدوو قەراخی ڕووباری کارون، نزیکی کەمانەی بڵاوی ئەم ڕووبارە، پێش لەوەی کەبگەڕێتەوە بۆباشوور، نیشتەجێ بوون. ئەوکاتە ئیلام ئیتر دەسەڵاتی ئەوەی نەبوو تا لەنیشتەجێبونی ئەوانە بەرگری بکات. هەر ئەم ناوچەیە بەشێ لەوڵاتی ئیلام بوو و لەوانەیە پارسەکان دانیان بەوڕاستیەدا نابێت. پارسەکان لەژێر دەسەڵاتی هخامەنش‌دا حکوومەتێکی بچووکیان بنیات نا کەرێکەوت وابوو زور گەورە ببێتەوە و نێوی خۆیان پێوە نا. (ر. گیرشمەن، ایران از آغاز تا اسلام).

تەنانەت کورشیش شوێنێک بەنێوی پارس و بناغەدانەرێک بەنێوی هخامەنشی نەدەناسی، بەڵام گیرشمەن بەراگەیاندنی ئەم ئادرەسم پۆستییە لەپارسەکان باوەڕی هەیە کە لەدەسپێکی سەدەی حەفتەمی پ-ز، ئیلامیەکان توانایی بەرانبەرکێیان لەگەڵ حکوومەتە خەیاڵی، بێناونیشان و بچووکی پارسەکاندا نەبووە! ئەو بەپێویستی نازانی کە بۆراگەیاندنەکەی شایەتێک لەمێژوو بهێنێتەوە، چوونکە هەروەها کە دەزانین، یەکەمجار داریوش بوو کە باسی هخامەنشی کرد. گیرشمەن کە نێوی هخامەنشی لەبەردە نووسراوەکەی بیستون هەڵگرت و بۆدەسپێکی سەدەی حەفتەم پ-ز گواستیەوە، بۆدانانی دەسەڵاتی پارسەکان پێویستی بە لاوازی ئیلامیەکان هەبوو. بێچارەیی گیرشمەن بۆ بەیانی وەها ڕاگەیێندنیک لەفرەبێژی و دەسکردە هەست پێدەکرێت. چوونکە ئەگەرلەڕاستیدا ئیلامیەکانی ئەوکاتە بێدەسەڵات بووایەن، بێگومان گیرشمەن شوێنێکی دیکەی بۆ نیشتەجێبوونی پارسەکان و دۆخێکی دیکەی بۆسەرهەڵدانی هخامەنش نابینیەوە و ئیمپراتورەکانی بەرێزیان لەمێژوودا بزر دەبوون (١).

شوتروک-ناخونتەی دووەم (٦٩٩-٧١٧) برازا و جێنشینی هوبان ئوگاش پادشای ئیلام بوو. شانسی ئەم شازادە بۆگەیشتن بەپادشایی ئیلام لەوەدا بووکە ناوبراو کوڕی هوبان ئیمنەپادشای مەزنی ئیلام و شوش بوو. نازانین کەچماوەیەک لەسەر تەختی پادشاهی حوکمی کردووە، نووسەرەکەی ڕایدەگەیەنێ کە کاتێ بەیارمەتی خوداوەندەکەی ئینشوشیناک بوو بەپادشای وڵاتی ئانزان و شوش، نوێژخانەیەکی (مزگەوت) بۆ ئەم خوداوەندە بەرپاکرد. . . .کۆمەڵێک نووسراوەی دیکە لەهەرێمی ژێردەسەڵاتی ئیلام دۆزراوەتەوە کە ئەبێ بەهی سەردەمی پادشاهی شوتروک ناخونتەی دووەم بزانین. لەیەکی لەم نووسراوانە کە براستی لەشوشدا دۆزراوەتەوە، ولەمێژەوە بە پێشەوای پشتیوانی شوترور پەیوەندی ئەدەن، باس لەهەبوونی زۆرتر لە سی پەیکەر دەکات کە کاتی خۆیَ لە زۆربەی شارەکانی وڵاتی ئیلامدا دانراوە. نووسراوەگەلێ دیکەش کە لەسەربەرد هەڵکنرابوون، لە دەشتە دوور کەوتووەکانی ڕۆژهەڵاتی شوش و نزیکی دەشتێک کە ئیستا ماڵمیری پێ ئەیژن و لەباشووری ڕووباری کارون هەڵکەوتووە دۆزراونەتەوە. ماوەیەکی دوور و درێژ پێش لە شوتروک ناخونتە، ئەم دەشتە شوێنەواری گرنگی سەردەمی ئیلامیەکانی تێدابوو، بەڵگەنامەی بازرگانی سەرەتاکانی مێژوو و هەروەها تەپۆڵکە، پیتی نووسین و زمان و وێنەکان دەیسەلمێنن کە نەقشەبەرجەستە و نووسراوەکانی هانی، کوڕی تاخیهی شازادەی شازادەی

١ لەڕاستیدا پێشتر ڕۆژهەڵاتناسان و مێژوونووسان، لەبەرئەوە کە لەتوێژینەوەی مێژووی ئێران بێدەسەڵات، یا ئەمدەس و ئەودەسیان دەکرد، تەنیا هەوڵیانداوە کەڕووداوە بەرچاوەکان بەشێوەیەک بسەلمێنن و بۆئەم کارە ناچارن لەخەیاڵ و وەهم یارمەتی بخوازن کەئەم شێوەش لەڕوانگەی مێژوونووسی ئەمسەردەمەوە زۆر منداڵانە دەنوێنێ.

یا پیر هی سەردەمی کوتایی زنجیرە پادشاکانی ئیلامە .

ئەمانە گشت ڕووداوی سەردەمێکن کە ئاغایێ گریشمەن ڕایدەگەیەنی ، هخامەنش ناوێک بناغەیێ دەسەلاتی پارسەکانی لە شوشتەر ، قەراخی شوش ، داڕشت . بەلام ووتەیێ سەرەوە و شایەتیە مێژووییەکانی دیکە چیرۆکی دەسەلاتی جیاواز و تایبەتی ئیلام لە دەسپێکی سەدەی حەفتەمی پ ـ ز دا دەگێرنەوە کە ئاوێنەیێکی ڕۆشنە لە شەڕەکانی نێوان ئیلام و ئاشور ، ئیلام و بابۆل و سەردەستی بێوێنەیێ ئیلام لەو سەردەمەدا . پەرەستنگەی مەزن ، باژێری بەربڵاو و هونەری کەم هاوتایێ ئیلامی لە دەسەلاتی بێئەملا و ئەولایێ ئەوولاتە لە سەرانسەری باشوور تا ئانشانی دێرینە حەکایەت دەکات . تەنانەت ئەوەیێ کە لە بەردەنووسراوەکەی تەختی جەمشید ، لە ئیلامییە تێکشکاوەکەیێ دەستی هخامەنشییەکانەوە هەلکنراوە ، و ژمارەیێ زۆری نووسەرە ئیلامییەکان ، و کەلکوەرگرتن لە پیتی نووسین و هونەری ئیلامی ، بەگشتی شایەتییەکی ڕوشنن کە ئیلامییەکان نەتەنیا ئەوکاتە کە گیرشمەن ئاماژەیێ بۆدەکات ، بەلکو تا ماوەیەکی زۆر پاش داگیرکردنی شوش هەر خاوەنی سەروەری لە هەرێمەکەدا بووە . پاشتر ڕوونی دەکەمەوەکە چۆن و بۆچی هەموو مێژوونووسان هەولێ ئەدەن ئیلام و ئاشور بەرلەبوورە و بەر لە دەسەلاتی هخامەنشییەکان لەمێژووی مێزوپۆتامیا و لە مێژودا گسک بدەن .

خەزێنەیێ پادشاکانی ئیلام ، کە لەدەسکەوتی شەڕەکانی پێشتر لێوالێو بوو ، کەوتە دەستی ئاشورییەکان . زێڕ و زیوێ کە بابۆل کاتی یەکیتیەکە پێشکەشی ئیلامی کردبوو ، لەگەلێ پەیکەرەکان ، کەرەسەی پڕبەها و بەنرخی پەرەستنگەکانی ئیلام و هەرشتێکی بەنرخ و نایاب لەخانووەکاندا بوو ، هەمووی بۆنەینەوا گواسترایەوە . ئاشورییەکان بەکوشتن و تالانکردنیش ڕازی نەبوون ، ئێسک و پروسکی پادشاکانی ئیلام و گەورپیاوانی ناونیشانداریشیان لە گۆڕستان دەرهێنا و بۆنەینەوا بەرێیانکرد . کردەوەیێ ئاشورییەکان لە ئیلامدا وەهابوو ، کە حەزقیال نەبی ئەلێ : ئەمەیە ئیلام و هەموو دانیشتووانەکەی لەدەوروبەری گۆڕستانەکەیدا ، هەموویان هاتنە کوشتن و هەموویان بوون بەنەچیری شمشێر . پەیکەری "ننە "خۆداوەندی "ئەرەخ " کە ۱٦۳٥ سالێ لەکن ئیلامیەکان بوو ، پادشای ئاشور دەستی بەسەردا گرت و بۆشاری ئەرەخ گەڕاندیەوە .(۱) ئاشورییەکان پاش کوشتاری زۆر ، تالانکردنی شارەکان و گواستنەوەی هەرچی سامان و دارایی ئیلام لە شارەکەدا بوو ، دیلانی زۆرلەشاری شوش و باژێرەکانی دیکە ، هەموویانی بۆئاشور بەرێکرد . خومبان کالداش دووا پادشایێ ئیلام ، کە هەلهاتبوو ، پاش چەن رۆژ دەس بەسەر بوو و ئاشور بانیپالێ ناوبراو و تام ماریتو پادشایێ پێشووی ئیلامی کرد

بەئەسپی ئەرابەکەی و ناچاریکردن تا پەرەستنگەی ئاشور و ئیشتار ڕایکێشن . ئەمەیە وەرگێڕاوی نووسراوەکەی بانی پاڵ، دەربارەی سەرکەوتنەکانی لەئیلامدا : خاکی شاری شوشان، شاری ماداکتۆ و چەن شاری تر، هەموویانم بۆ ئاشورگواستەوە و لەماوەی یەک مانگ و یەک ڕۆژدا پانتایی خاکی ئیلامم بەتەواوی گسک دا . من ئاژەڵ و چوارپێیانی ئەم وڵاتەم لەهاتووچو و دەنگی موسیقا بێبەش کرد وبە گیان لەبەرانی خوێنخۆر و مار و میلورە و ئاسکی چۆڵاییەکان ئیجازەم دا کەداگیری بکەن . لەکۆتاییدا ئەگەر ئیلام ئەژنۆی شکا و تێکچوو، بەبوونەشەڕی نێوخۆیی و بنەماڵەییەوە بوو . بەهەرحاڵ لەساڵ ٦٤٥ ی پ-ز، دەوڵەتی ئیلام لەڕووپەلی جیهان سڕایە و ڕابووردەکەی ووردە ووردە لە بیرەوەرییەکاندا کوژایەوە،

بەشێوەیەک تەنانەت مێژوو نووسان و نووسەرانی سەردەمی کۆنیش شتێک لەم بارەوە نازانن . (حسن پیرنیا، ایران باستان، ل ١٣٩ـ١٤١)

ئەگەر ئیلامییەکان بەوشێوە لەبەین چوون ، کە ئاغای پیرنیا ئەیژی ، ئەی ئەو ئیلامیانە کە لەبەردە

(١) حەزقیال لەتەوراتدا هیچ باسێک دەربارەی ڕووخاندنی ئیلام لەلایەن ئاشوریانیپاڵەوە ناخاتە بەردەس . جێگای داخ و سەرنجی فراوانە کە بەرێزانی وەکو ڕەحمەتی ئاغای پیرنیا باسە گرنگە مێژوویەکانی وەها سەروکلک براو و دەس و پێ شکاو ڕاگەیاندووە لەکتێبەکەی حەزقیالدا زنجیرەیەک پێشگۆیی وەکو ئاگاکردنەوە لەبارەی هەبوونی هەموو ژیار و شارستانیەتەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوڕاست خۆدی ئاشور و هەروەها ئیسراییلییەکان کراوە . ناوبراو دژی ئورشلیم ، دژی هۆزی عمون ، دژی هۆزی موآب ، دژی هۆزی ادوم دژی فلستینییەکان ، دژی میسر ، دژی صور ، دژی صیدون ، دژی وڵاتی نەناسراوی یاجوج و ماجوج و لەکۆتاییدا دژی ئیلام پێشگۆیی کردووە . تەنانەت پێشگۆیی حەقیال دژی ئاشور لەگەڵ پێشگۆیی ناوبراو بەرانبەر بەئیلام وەکویەک کراون و بەو جۆرە نی یە کە ئاغای پیرنیا ڕایگەیاندوە ، کە ئامازەیەک لەڕووخاندنی ئیلام بەدەستی ئاشورییەکان . گەورە پیاوانی ئاشور لەو شوێنە نووستوون و گۆڕستانی خەڵکی ئاشور کە هەموویان بەشمشێرەوە کوژراون ، لەدەور و بەریاندایە . گۆڕەکانیان لەقووڵایی دنیای مردوەکان و هاوپەیمانەکانیان لە کێلەکی ئەواندا نێژراون . ئەم مردوانە کە سەردەمێک خۆڕەیان دەخستە دڵی زۆرکەسەوە ، هەنووکە مردوون گەورەپیاوانی ئیلام لەولاترەوە نووستوون و گۆڕی خەڵکانی ئیلام کە بەشمشێرەوە کوژراون ، لەدەور و بەری ئەواندایە . ئەم زەلامانە کە کاتی ژیانیان هۆکاری دڵڕاوکێ نەتەوەکان بوون ، ئیستا بەشەرمەساریی و ڕیسواییەوە چوونەتە قووڵایی دنیای مردووەکان ، لەکێلک کوژراوەکاندا نێژراون . گەورەپیاوانی ماشک و ئوباڵ لەو شوێنە نووستوون و :ۆری مردووەکانیانلەدەور و بەریاندایە ئەم زەلامانە کە سەردەمێک ترس و دڵەڕاوکێیان لەدڵی هەمواندا دەخوڵقاند ، ئیستا بەبەدناوییەوە مردوون . (عهد عتیق ، حزقیال ، ٢٦ـ٢٢ : ٣٢)

نووسراوەکەی هۆڵی گشتی بارگای تەخت جەمشیددا ، ڕازاوە و پڕوپۆشتە بەجل وبەرگی هاوتای پادشاە و خاوەن دەسەڵاتان و دەستی پڕ لە گەنجینەی پڕنرخ و بەها کە نیشانەی بەربڵاویی و فراوانی سامان و پێشکەوتنی هونەر لە کومەڵگاکەیاندایە ، و ڕوو بە بارگاکەی داریوش ڕێکەوتوون ،

## لەکویەوە سەریان هەڵداوە؟ (١)

دەربارەی تێکستە کلاسیکەکانی پەیوەندیدار بەڕووخاندنی ئیمپراتوری ئاشوریش پێویستە بەپارێزی تەواوەوە تیٚبروانین . لەسەر بناغەی نووسراوەکەی کەتسیاس (کە دیودور لەکتێبی دووەم ، ٢٣ ، ٢٨ ) دا ئاماژەی پێدەکات ، "نزمبوونەوەی ئیخلاقی" سەردانایال (ئاشوربانیپاڵ) ، ئەرباکس مێدیایی هەڵخراند تا ئاڵای شۆڕش دژی ئاشور هەڵبکات و یەکیتی چوارلایەنە بە هاوبەشی بابوڵ (بەسەرکەردەیی بێلزیس) ، پادشای عارەبەکان (هۆزەکانی مێزۆپۆتامیای سەرو) و پارسەکان بوئازادی پێکبهێنن . جگەلەوەش کە ئارباکس ئێوێکی نەناسراوە تایبەتمەندی سەرسووڕهێنەری ڕاگەیاندنەکەی جێگای سەرنجە ، چوونکە لەحاڵێکدا کە دەبینین پارسەکان لەئاستێکی بەرانبەر بەمێدیایی ، بابوڵی و عارەبەکانی (مێزوپۆتامیا) لەژێر دەسەڵاتی پشتشکێنی ئاشورییەکاندا بوون! لەوانەیە بەبیرهێنانی کە نووسەرێکی هێلێنی بەنێوی ئامینتاس و (ئێنتە لە کتێبی دوازدەهەم ، ٥٢٩ ئاماژەی پێکردووە) وبەپاڵدانەوە بەهەبوونی دیوارەکانی نەینەوا(کە بیناکەی بە سەردانا پاڵەوە گریٚئەدەن) ،

کاتی دوڵپێچ کردنی شارەکە بەدەستی کورش کاول کراوە ، هەر بەوشێوە جێگای سەرسووڕمانە . ڕاگەیاندنەکانی تێکشکانی ئاشورییەکان روانگەیەکی مێدیا ناوەندی (مدوسانتریک) واتای نەقشی داگیرکەرانەی ئارباکس و پارسی ناوەندی (پرسوسانتریک) واتایٚنەقشی پارس و کورشی هەیە ، کە بەرانبەر بەوە مێژوو نووس ئیلا سەرنج

(١) زۆربەی مێژوونووسان ئاشوربانیپاڵیان بەهۆکاری وەها بەسەرهاتێکی شەڕ بۆ ئیلام دەزانی ئاشووربانیپاڵ ل ەمێزوپۆتامیادا کەسایەتی و پرنسیبێکی فەرهەنگی بەرزی هەیە کە یەکەمین کتێبخانەی مێژووی خوڵقاندووە و دەسکەوتە هونەری و فەرهەنگییە بەجیٚماوەکەی لەگەڵ وەها لێکدانەوەیەکی مێژوویيدا ، کە ناوبراو وەکو تۆقێنەر و ترسناک دەناسێنیٚ ، ناسازگارە . ڕۆژهەڵات ناسان بەئەنقەس و تەنیا بەپالدانەوە بەنووسراوەیەکی بەردینە و نیشانەیەک کەلە بەشی کۆتایی ئەم کتێبەدا ئاماژەی پیٚدەکەم ، هەوڵیان داوە لەئاشور بانیپاڵ وێنەیەکی هاوتای کورش دۆرست بکەن . بۆئەوە کە بەهیچ شێوەیەک هێرشی ئاشوری و تەنانەت هخامەنشییەکانیش بەکۆتای دەسەڵاتی ئیلام نازانین ، بەشی گرنگی ئەم کتێبە بۆهەڵسەنگاندنی مێژووی ئیلام لە سەردەمی سلوکی ، ئەشکانی و ساسانییەکان تەرخان دەکەین و هیواداریـن خوێنەریەوە بزانێت کە هێرشی ئاشوربانی پاڵ و سەرهەڵدانی هخامەنشییەکان کۆتایی چیروکی پادشایی ئیلام نییە و تەنانەت لە دەورەی ئەشکانیشدا ئیلامییەکان بۆگەڕانەوەی سەربەخویی وڵاتەکەیان لەگەڵ داگیکەراندا بەشەڕ هاتوون . (د . ت . پوتس ، باستان شناسی عیلام ، مقدمە ، ل ٢ ازانتشارات دانشگاە کمبویج ، سال ١٩٩٩) هەوڵدانی گشتی مێژوونووسان بەم ەبەستی ڕوخاندنی بەپەلە و پێشوەختی ئاشور و ئیلام و فەوتاندنی تەواوی ئەوانە ، بەرلە سەرهەڵدانی هخامەنشییەکان ، و بەوڕوانگەوە کە کورش خوٚی بە پادشای سومەر و ئەکەد زانیووە و داریوش لە بەردە نووسراوەکانیدا لە سەر دەسەڵاتداری خوٚی بەسەر ئاشور و ئیلامدا ، پیٚدادەگریٚ ، زەمینەی مێژوویی بڕواپێکراوی نییە . ئەم هەوڵانە بۆشاردنەوەی بەرپرسایەتی ڕاستەخوٚی هخامەنشییەکان لەڕووخاندنی ئەم دوو شارستانییەتیە دروٚشاوە و دێرینەیە . ڕووبەڕوو بوونەوەی ئەم مێژوونووسانە بەرانبەر بە ڕووخاندنی بابوڵ ، پالدانەوە بە گڵە نووسراوەیەک کە ئیلاخۆهەڵکێشانی یەک ئیمپراتور تازە پێگەیشتوو نەبیٚ ، هیچیتر ییە ، تەنیا ئەبێتە هوٚی شاردنەوەی ڕاستیە مێژووییەکان . هیچ ئیشارەتێکیان بەڕەوڵی شۆڕشەکانی دوایی بابوڵییەکاندا و کورش بەئازادکەری ئەو وڵاتە دەزانن . ئەگەر بەتێکچوونی شوش و نەینەوا بەدەستی هخامەنشییەکان بزانن کەلەگەڵ ئەو تیئورییە کە ئەوەرەکەی کورش و سەرچاوەکەی ئەوراتە ، دەکەوێتە دژەرییەوە .

و دوودڵی لەڕاستی باسەکەنبێ، کارێکی دیکەیٚ پێ ناکرێت (بریان، تاریخ امپراتوری هخامنشیان ل ۸۷ ـ ۸۸)

ئیستا ئێمە لەپلەیەکدا ڕاوەستاوین کە دەتوانین دەربارەیٚ هەموو داسەپاندنەکانی ڕۆژهەڵات ناساندا دوودڵ بین و گشت ئەو ووتانە کە دەربارەی ڕۆژهەڵاتی ناوڕاستەوە لە ٥٠ ساڵی پێشدا بڵاویان کردووەـ تەوە، بەپەیڕەوێک لە سیاسەتی چەوسێنەرانەیٚ ئوروپا و لەو پاش زەمینە سازکردنەوە بۆ پاساکردنی داگیرکەری وڵاتی فلستینی بزانین کە بەشێوەیٚ ئەنجام دراوی هەنووکەیی، پاسایەکی مێژوویی نی‌یە. ئەم پرسیارە کە ئایا داگیرکردنی وڵاتی ئیلام لەلایەن نەبوکەد نزارەوە، ئاکامی ئەم هەڵسوکەوتە نادوستانە بووە، پرسیارێکە کە ئیستا ناتووانین وڵامی بدەینەوە. تێکستە پڕوبڵاو و ناتەواوەکان هاوکات لەشوشەوە ڕایدەگەیەنن کە ئەوکاتە شوش لەژێردەسەڵاتی بابۆلدا بووە. بەڵام هەربەوشێوە کە پێشتر کەوتە پێش چاو داگیرکردنی شوش هیچ جۆرە پەیوەندییەکی بەبەشەکانی دیکەی ئیلامەوە نەبووە وماوەیٚ داگیرکەری و چۆنیەتی دەسەڵاتی بابۆل بەسەرشوش‌دا دیاری ناکات. لەڕاستیدا لەبەر ئەوە کە لەوانەیە ئەو تێکستانەیٚ سەرەوە هی هخامەنشییەکان وُ لە پەیوەندی داگیرکردنی شوش لەلایەن ئەوانەوە بێت، تەنانەت داگیرکردنی شوش لەلایەن بابۆلیشەوە ئەوەندە جێیٚ باوەڕ نی‌یە. لەناوڕاستی سەدەی شەشەمی پ ـ ز بەتەمەنی چەندین بەرە بەشگەلیٚ لەڕۆژهەڵاتی ئیلام بەدەس هخامەنشییەکانەوە بوو. کورش مەزن (٥٥٩ ـ ٥٣٠ پ ـ ز) لەڕاگەیاندنە بەناوبانگەکەیدا خۆدی خۆیٚ بە" پادشایٚ ئانشان" نێودەنیٚ. لەم کاتەوە تاسەردەمی داریوش مەزن هخامەنشی (٥٢٢ ـ ٤٨٦ پ ز) بەڵگەیەک لەڕووداوە سیاسییەکانی ئیلام بەدەستەوە نی‌یە. دوو نموونە لەوٚ سەرهەڵدانانەکە داریوش لەیەکەمین ساڵی پادشاهییەکەیدا سەرکوتی کرد، دوو ڕووداوی پشت سەریەک لە پەیوەندی داواکەرانی تاج وتەختی ئیلام‌دا بوو. سێهەمین و دووا سەرهەڵدان لەهەمان ساڵی یەکەمی پادشاهی داریوش‌دا قوّما و ئەمجارەش داریوش هێزێکی نیزامی پارسی بۆسەرکوتکردنی ئەوە بەڕیٚ کرد. پشتی پادشاهی داریوش بەدوواوە، مێژووی ئیلام سەرانسەری ڕۆژهەڵاتی ناوڕاست لەگەڵ مێژووی هخامەنشییەکاندا کۆ ئەبێتەوە. وڵاتی ئیلام و ناوەندەکەیٚ شوش بوو بە یەک "شارەوانی" "ساترپ"و نێویان نیا"هوج" کە وشەیەکی فارسی بوو. لەشوش‌دا کۆشک و تەلاری پڕرازاوەیٚ هخامەنشی دۆرست کرا و ئەم شارە بوو بەشوێنی نیشتەجیٚ بوونی گرنگی شاە. (یوسف مجیدزادە، تاریخ و تمدن ایلام، ل۲۲).

دەبینین کە پاش ئاشور بانی‌پاڵ ئیلام بەڕادەیەک دلڕفێن بوو کە بابۆلییەکانی بۆ داگیرکردنی ئەوٚ وڵاتە هەڵخراند و ئەبینین کە ئیلام نەتەنیا لە (٦٤٥ پ ـ ز) دا لەسەر زەووی نەسراوەتەوە، بەڵکو

لەژیانە درۆشاوەکەشی، کاتی پادشاهی داریوش بەشێوەی جۆرواجۆر ئاگادارین. بەتەنیا داریوشە کە شوش، ئەم پاڵەوانبازێرەی ئێرانی دێرینە بۆکاولبوون پاڵی پێوە دەنێ وهەر ئەوە کە پاش کورش دەس بەسەردا گرتنی ئەم شارە، وەکو مێدیا و ئاشور و بابوڵ بەتەواوی بەئەنجام دەگەیەنێ.

بەهەرحاڵ ئێمە لە ناچارییەکەی گیرشمەن بۆ ترنجاندنی خێڵی بچووکی پارس لە دڵی ئیلامدا کە ناوبراو وەکو وڵاتێکی لاواز پێویستی مێژوویی پێیە، تێدەگەین، بەڵام برپڵاوتر کردنی لەرادە بەدەری ئەم خێڵە بچووکە تا ئاستی پارسە، پێگەیشتوو کردن و خۆڵقاندنی زنجیرەیەکی پرهێز وەکو هخامەنش، بۆ ئەوانە، شیاوی لێبوردن نی‌یە، لەحاڵێکدا بەرێزیان دان بەوەدا دەنێ کە تاسەدەی حەفتەمی پ ـ ز خاکێکیان بۆنیشتەجێبوون نەبووە، چوونکە نەتەنیا سنووری جوغرافیای ئەم پارسە نادیارە، بەڵکو لەڕاستیدا نازانین کە پارسەکان بە چ شێوەیەک بڵاو بوونەتەوە: بەشەڕ یاخۆد، لەڕێگای ئاشتیخوازانەوە؟ ئەگەر بۆ نیشتەجێبوونی بەربڵاویان لە ئانشان و پارسدا، لەگەڵ ئیلامییەکان بەشەڕ هاتوون، ئەم شەڕە لە چ کات و شوێنێکدا و لەکاتی دەسەڵاتدار- یەتی چ فرمانڕەوایەکدا ڕێکەوتووە و ئەگەر بڵاو بوونەوەیان لە قووڵایی خاکی ئیلامدا ئاشتیخوازانە بووە، بۆچی ئەبێ ئیلامییەکان، وڵاتە ئاوەدان و پان‌وبەرینەکەیان بە خێڵێکی بێهێز و بێناونیشان، وەکو پارسەکانی گرووپی دووەم پێشکەش کردبێو لەکۆتاییدا ئەم پارسە کە ناوی دەبرێت، لەو کاتەدا نێوی چ هەرێمێکی جوغرافیە؟.

پاش مردنی چیش‌پیش، پادشاهی پارس بریتی بوو لە ناوچەی پارسوماش کە ئانشان و پارسەش خرایە سەر ئەو هەرێمە. ئەو وڵاتەکەی وەکو پادشاکانی مرونزی لەنێوان دوو کوڕەکەیدا دابەش کرد: ئاریا رەمنە کە لە ناز و نێعمەتدا لەدایک بووبوو(!) (٦٤٠ ـ ٥٩٠ پ ـ ز) و کورش یەکەم( دەورویەری ٦٤ ـ ٦٠٠ پ ـ ز) کە بوو بە پادشای مەزنی پارسوماش، ڕێکەوتی بەڵگەیەکی زێرینە لە هەمەداندا دۆزراوەتەوە و بەپیتی بزماری و زمانی پارسی دێرینە چەمکی ئاریارەمنە لەسەری نووسراوە. پادشای ناوبراو ئەڵێ: "ئەم وڵاتەی پارسەکان کەمن خاوەنیم، ئەسپانی چاک و زەلامانی چاکی هەیە، خوای مەزن ئەهورا مەزدا ئەوەی بەمن داوە. من پادشای ئەم وڵاتەم". ئەم بەڵگە کۆنترین شتە کە لە سەردەمی هخامەنشییەکانەوە تا ئیستا ناسراوە، و ئەم بەڵگەیە ئەو پێشکەوتنە زۆرە کە لە سەدەی حەفتەمدا کردبوویان، نیشانی ئەدا، لە حاڵێکدا کە خێڵی ناوبراو تازە

**لە شێوە ژیانی نیوە خێوەت نشینی بۆ حاڵەتی خێڵێکی نیشتەجێ گۆڕدرابوون** . پیتینووسین ئەوانە کە پیتی بزماری بوو ، **نیشانەیٚ پێشکەوتنی ڕاستەقینە لەپیت و دەنگە نووسراوەکانی ئاشور و ئیلامە کە هێشتا لە داهێنانی ئەو پیتەدا کەڵکی لیٚوەردەگیرا. پارسەکان لە دەسپێکی مێژووی خۆیاندا، ئەوکاتە کە دەسەڵاتە چکۆلەکەیان هێشتا گەشەیٚ نەکردبوو، کارێکیان کرد کە وەها دەکەوتە پێش چاو، خەڵکانی ڕەسەنی ئێرانی دێرینە بە درێژایی چەندین سەدەدا ئەنجامیان نەداوە و لەهەمان وەزعەدا کە پارسەکان لەۆ وڵاتە نیشتەجیٚ بوون، زبانەکەیان بە پیتی خۆیان بەیان دەکرد.**

دووایی دەبینین کە بەڵگەکەیٚ ئاریارەمنە- تەنیا بەڵگە لەۆجۆرە نەبوو- هەروەها کە بەڕادەیەک سەرسووڕ هێنەرە کەهەندیٚ لەزانایان لەقبوڵکردنی وەکو بەڵگەیەکی ڕەسەن خۆیان دەپارێزن. (گیرشمەن ، ایران ازآغاز تا اسلام، ل ۱۲۵)

لەڕاستیدا بەوبۆنەوە کە گیرشمەن لەتێکستی سەرەوەدا ۸۰۰ ساڵ پێشتر"لەپادشاهی کورش، پارسیەکان، بە نیوی ڕەشماڵ نشین دە ناسێنیٚ، ئیتر باس کردن لە"بەڵگەی زێڕین"و"پادشایٚ مەزن لەنێوان خێڵێکدا کە هێشتا خاوەنی هەرێم و شوێنی نیشتەجیٚ نین، بۆخۆڵخواردن لە بازنەیٚ خەیاڵدا دەگۆڕدرێت. بێگومان مێژوونووسان هیچکام ئەو داواکارییانە ناپەژرێنن و هەرچی کە دەربارەیٚ هەزار ساڵ پێشینەکەیان و داهێنانی پیتی نووسینشدا ئەیژن، لەنەزانیندا نیٚیە و نەیاری و فێڵێکی ئاشکرایە کە دەرحەقی ژیار و شارستانیەتی خەڵکانی ڕەسەنی هەرێمەکە و دانیشتوانی مێزوپۆتامیادا دەیکەن، وەها ئاشکارا ئەۆ داواکارییە دەخەنە ڕوو کە گوایە پیتی بزماری پارسی دێرینە هۆکاری پێش بەچوونی شێوە نووسینی ئیلامی و بابۆلی بووە. ئەم نیشانانەش بۆسەلماندنی وەها باسێک کە ئەڵێم ڕۆژهەڵات ناسان هەوڵیان داوە تا لە هەر ڕێگایەکەوە شارستانیەتی پێش لە هخامەنشییەکان لەڕۆژهەڵاتی نزیکدا پووچەڵ یان هیچ نەبیٚ بەرانبەر بە هخامەنشییەکان بەسەرەتایی بنرخێنن. لەگەڵ هەموو ئەمانەدا، وەکو ئاغایٚ گیرشمەن ئەڵیٚ: پارسەکان پێش لە هێرش بۆسەر دراوسێیەکان، لانی کەمی ۱۵۰ ساڵ لە سنوورێکدا کە پارسوماش و ئانشان و وڵاتی نەناسراوی پارسەیٚ لەبەر دەگرت، نیشتەجیٚ بوون و لەوشوێنانە بەشێوەیٚ دەوارنشین یا نیوە نیشتەجی حوکمیان کردووە. بەڵام ئێمە لەم هۆزە هەلبژاردەیٚ بەرێزیان لە سنوورێکدا کە نێوی

دەبا، هیچ بیرەوەریەکی بەرچاوی مێژوویمان نەبینیەوە، لەحاڵێکدا کە ئورارتو و مێدیاکانمان دیتەوە کە لەدانان و بنیات کردنی وڵاتێکی دیاریکراو و شارستانیەتێکی نەفەوتاودا سەرکەوتوون، هەر ئەوانە کە ئاغای گیرشمەن پێمان ئەڵێ هاوڕێیانی سەرەتایی پارسەکان! ئەو پارسانە کە نەتەنیا هیچ نیشانێ لە نیشتمان، شار و قەبارەی دەسەڵاتەکەیان بەدەستەوە نییە بەڵکو گۆڕێکی کاولبوو لە باب و باپیرانی ئەو هۆزە نە دۆزراوەتەوە کە لە سەر ئیسکو پروسک و ئەوشتانە لە گۆڕەکەدا گۆمانی هەبوونی لێ دەکرێ، لێکولینەوە بکەین وبۆمان ڕوون ببێتەوە کەبە چ چەکێ شەڕیان کردووە و ئەوانەیان لەکوێ بەرهەم هێناوە (١).

سەرەڕای ئەوەش، لەحاڵێکدا هۆزەکانی دیکەی هاوڕێ و هاوکاتی هخامەنشیەکان گەنجینەگەلی پڕژمارە لە کەرەسەی خۆرازاندنەوە، نەقش و کەرسەی نیزامی، شێوەی جلوبەرگی نەتەوەیی، سواڵەت و پێداویستی ڕۆژانە و هەزاران نیشانە کە ناسنامەی هەر هۆز و نەتەوەیەک لە سەرانسەری جیهانداڕە دەس نیشان دەکات، لەشوێن خۆیانەوە بەجێ هێشتووە. چونە کەتاپێش لە گۆڕینی ئەم هۆزە کۆچبەر و بێناونیشانە بۆ ئیمپراتوری هخامەنشی، و سەرەڕای هەبوونێکی وەها دوور و درێژ، لەو ناوچە بەپیت و بەرەکەتەدا کە ئاغای گیرشمەن پەنجەی بۆڕادەکێشی، تەنانەت بەردە نووسراوەیەک، پەرستنگەیەک و یا جامۆڵکەیەکی شەراب خواردنەوەی گڵی لەوانە نەدۆزراوەتەوە کە لەسەر یان نیشانەیەکی دیاریکراو لە ژیار و شارستانیەتی هخامەنشیەکان هەڵکنرابێت و ئەمە لەحاڵێکدایە کە لەڕوانگەی ئاغای گیرشمەنەوە گوایە ئەوانە وەها هۆزێکی پێشکەوتوو بوون، کە هاوکات لەسەر لاپەڕەی زێرین خۆیان بەجیهان دەناساند !؟.

١ـ لەوانەیە کە ئاغای شهبازی، خانمی مری بویس و یان کەسێکی دیکە وەڵام بدەنەوە کە باپیرانی کورشیش زەردەشتی بوون و نەریتی ناشتنی مردوەکانیان بەڕێوە نەبردووە. ئەوکات پرسیار دەکەین ئەی چونە کە داریوش و کورش و ئیمپراتورەکانی دیکەی ئەم زنجیرەیە، کاتێ کە بەزۆر سواری توانایی و شارستانیەتی ڕۆژهەڵاتی ناوڕاست بوون، گۆڕ و گڵکۆی وەها بەرچاویان بۆ خۆیان قنج کردەوە؟ دیسان لەوانەیە، هەروەها کە خانمی بویس لە کتێبەکەیدا (مێژووی ئایینی زەردەشت)، **ئاماژەی** پێ کردووە وپێکهاتەکەی لە گاڵتەیەکی مێژوویی دەچێ، بێژن کە تەرمی پادشاکانی دوایی لەسەر زناری بەردین و خاڵە بەرزەکان دەنێژران بۆ ئەوی زەردەشتییەکان بڕوایان بەوە بوو کە ناشتنی مردووەکان لە نزیکی گوند و بازێڕەکاندا دەبوون بە هۆی پیس کردنی ژینگە. لەم حاڵەتەشدا دیارە کە هخامەنشییەکان تاکاتێ کەسامان و هونەری خەڵکانی دیکەیان داگیر نەکرد، تەنانەت دەسەڵاتی ناشتنی پادشا ئیدعاییەکانی خۆیان لەسەر بەرزاییەکان دا نەبووە.

جێگری ئاریارەمنە کوڕەکەیَ بەنێوی ئەرشامە بوو و ماوێەکی زۆر نییە کە بەڵگەیەکی زێرنیان لەناویراویش دیتووەتەوە و لەوانەیە کە ئەم بەڵگەیەش وەکو بەڵگە زێرینەکەیَ بابی لەهەمان کات و هەمان شوێن (هەمەدان) دا دۆزرابێتەوە . ئەرشامەش وەکو بابی خۆیَ بەپادشایَ مەزن ، پادشایَ پادشایان ، پادشای پارسە ، کوڕی ئاریارەمنە دەناسێنیَ . (ر . گیرشمەن ، ایران از آغاز تا ئیسلام ل ۱۳۱)

لەبەشی دواییدا ئاشکرایَ دەکەم کە سەختەبوونی ئەو دوو بەڵگە زێرینە پەیوەندی داری ئاریارەمە و ئەرشامە چۆنچۆنیَ یارمەتیمان ئەدا کە باسەکەمان بۆ بیَناسنامە بوونی هخامەنشییەکان بسەلمێنم . ەئەمجۆرە ئاغایَ گیرشمەن بەبیَئەوەیَ هێشتا هخامەنشییەکان لە ناوچەیەکی تایبەتدا ڕاوەستێنیَ ، تا بەر دەروازەیَ ئیمپراتوری پاڵی پێوە دەنیَ . لەگەلَ ئەوەشدا ئەم خەون وخەیاڵە گەورەیە بەرهەمێکی دیاریکراوی مێژوویی بۆئێمە ، هێشتووەتەوە ، واتا دیاری دەکات کە هیچ کاتێک لە جوغرافیای ئێرانی دێرینەدا شوێنێکی جێگیر بەنێوی پارس یا پارسە هەبوونی نەبووە . و ئەوەیَ کە لە هونراوە و دۆزراوەیَ ڕۆژهەڵات ناساندا لەیەکی ئەدەینەوە ئەو نێوە بووە کە هۆزێکی کۆچبەر لەباکووری ڕۆژهەڵات ، باکووری ڕۆژئاوا ، و یا تەنانەت وەکو ئاغایَ شهبازی ئەڵیَ: لەڕۆژهەڵاتەوە هاتوون ، بەو وڵاتانەیان ووتووە کە مێژوونووسان ئەوانەیان لەوسەرزەوییانە نیشتەجیَکردووە . قەراخەکانی دەریاچەیَ ئورومیە ، باشووری چیاکانی زاگروس و لەکۆتاییدا وەکو ئەم سەردەمە ئەیژن: فارسی هەنووکەیی ! ؟ ئەمانە گشت هێشتا لە حاڵێکدایە کە ئێمە نێودانان و ئاماژەیَ وەکو پارسواش و پارسەمان بەم هۆز و خێڵەوە نەلکاندووە .

زانستی زمان ناسین پیَلەسەر ئەوە دادەگرێت کە وشەی "پارس" هی هۆزە باکوورییەکان بێت ، کە وابوو ناکرێت ئەم کۆچبەرانەیَ ئێمە لە دەسپێکی کۆچبەربوونیان بۆ بەرزاییەکانی ئێرانی دێرینە ئەم نێوەیان لەگەلَ خۆیان هێنابێت ئەمە نێو نییە بەڵکو نازناوێکە کە شارستانیە کۆن وخانەخۆیەکانی ئەم هۆزە کوچبەرە پێیان بەخشیون و من لەبەشەکانی کۆتایی ئەم کتێبەدا ئاماژەیَ پێدەکەم .

# ئاکام :

١ ـ لەسەربناغەیٚ ئەو شتە کە مێژووی ئێران نووسان هەوڵ ئەدەن بیسەلمێنن و لەبەر نەبوونی نیشانەیٚ پێویست و شیاو لێیان وەرناگیردرێت، کە هۆزێک پاش کۆچبەربوونی لەلایەن نەتەوە ڕەسەنەکانی ئێران و مێزوپۆتامیاوە ناوبانگی پارسیان پێدرا، لە دەسپێکی هەزارەیٚ یەکەمی پێش زایینیدا، واتا ٤٠٠ ساڵ پاش سەرهەڵدانی لە مێژوودا وەکو ئیمپراتورانی مەزنی ڕۆژهەڵات، بە کرێگیراوی و شمشیروانی بۆ نەتەوەی گەورە، خاوەن شارستانیەتی دێرینی ئورارتو لە پراوێزی ڕۆژهەڵاتی دریاچەیٚ ئورومیەدا، دەرفەتی نیشتەجێبوونی بەدەس هێنابیٚ.

٢ ـ ئەم هۆزە لە ئاژاوە و کێشەکانی نێوان ئاشور و ئورارتودا ناچار ئەبی کە هانا بباتە بەر مێدیاکان و بەرانبەر بە خزمەتی نێزامی کە لە شەڕی بابوڵ و مێدیا دژی ئاشور سەری هەڵدا بوو، وەکو بە کرێگیراو و شمشێروان مەجالی نیشتەجێبوونی لە باشووری هەرێمی مێدیادا پیٚدرابێت.

٣ ـ پاش تێکشکانی ئاشور و سەقامگیربوونی مێدیا، ئەم هۆزە کوچبەر و سەرلیٚشێواوە چووە خزمەتی ئیلامییەکان کە بەلاوازبوونی ئاشورجارێکیتر دەسەڵاتی پێشووی بەدەس دەهێناوە. لەم پەیوەندییە نوێیەدا ئەوانە بۆ دەوروبەری ئانشان گواسترانەوە و ئەمە دووا شوێنێکە کە تا پێش لە سەرهەڵدانی ئیمپراتورە گەورەکەیان، مێژوونووسانی ناوەکی و ڕۆژهەڵاتناسان وەکو شوێنی جیٚگیربوون، پێیانیان بەخشیوە. بەڵام تەنانەت ئەگەر ئەم بریارانەش ڕاستبێت، بریارگەلی تازە ئاشکرا دەبێت کە شیاوی ووتنە.

ئەلف. ئەم هۆزە ناتووانیٚ پڕژمارە بوویٚ، چوونکە ژیانی خێڵەکی نیوە نیشتەجیٚ توانایی بەخێوکردنی گرووپێکی زۆرتر لە سیٚ هەزار کەسی و ئەوپەڕی، پێنج سەد بنەماڵەیٚ نییە.

ب. هیچ نیشانەیەکی فەرهەنگی و نەتەوەیی لە بناغەدانەرانی ئیمپراتوریەک هەبوونی مێژوویی ئەم هوزە لەمێژوودا لەیادەکاندا نەماوە. ئەوانە ئایینیان نییە، خانووبەرە و پەرەستنگەیەکیان نەبووە و هیچ دەسکردێکی هونەری تەنانەت دروستکردنی سواڵەتێکی ساکاریشیان لیٚ نەدۆزراوەتەوە. ئەم مژارانە لەهەمان حاڵدا کە سەرسووڕهێنەرە، بۆهۆزێک کەهەمیشەیٚ مێژوو کلکی دەسەڵاتدارە

ناوچەییەکان بووە ، لەپراوێزی ئەواندا ژیاوە ، و ناچاربووە پەیڕەوی لە فەرهەنگی خاوەن ئەختیارەکەی خۆی بکات ، زۆر ئاسایی دەنوێنێت .

ئەم هۆزە تەنانەت پشتی بەدەس گرتنی دەسەڵات و داگیرکردنی شارستانیەتەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوڕاست و ئێران ، بەبۆنەی نەبوونی پێشینە و نەریتی نەتەوەی ، نەیتووانی هیچ نەقش ونیشانەیەکی ئیتنیکی سەربەخۆ بخاتە بەردەس و نموونەی هێزو توانابیەکانی دواییان لەزەمینەی ئەندازیاری ، پیتی نووسین ، ئامێری شەڕکردن ، خشڵ و کەرەسەی خۆڕازانەوە و پێداویستییەکانی دیکەی ژیان ، وەکو دەفرە سواڵەتی و مەتاڵیەکان ، لەفەرهەنگی نەتەوە بەزیو و بندەستەکانەوە لاسایی بکەنەوە .

پ ـ هەبوون و سەرهەڵدان و گەشەکردنی ئەوانە بۆ پلەی بناغە دانەرانی ئیمپراتوری ، بەبی هیچ پیشەکییەک بەئەنجام گەیشت و ڕوانگەیەکی دیار و شیاو دەربارەی هۆکارەکانی هاتنی ئەوانە بو هەرێمێک کە پڕە لە دەسەڵاتە دێرینەکان ، بەدەستەوە نییە . لە دووا تۆژینەوەدا ، ئەوپەڕی دەتووانین بێژین کەئەم خێڵە لەڕوانگەی مێژووەوە نەناسراو و لەڕوانگەی جوغرافیاوە سەرلێشێواو ، نزیکەی سەد ساڵ پێش لەسەرهەڵدانی کورش ، لەلایەن یەکی لە چوار دەسەڵاتی ئاشور ، مێدیا ، بابوڵ و ئیلامەوە وەکو بەکرێگیراوانی شمشێر بەدەس ، لەئیستێپەکانی ناوڕاستی روسیاوە بەکری گیران و بەکەڵکوەرگرتن لە کیشە و ئاژاوەی ناوچەکەدا ، بە شێوەیەکی تۆقێنەرانە پڕ لە زەبر و زەنگی نیزامی وبەکرێگیراوانەدا بەکاربران و لەکۆتاییدا پاش شەڕوپێکدادان لە جوغرافیایەکی نادیاری دەوروبەری باشووری ئیران ، لەوانەیە دیسان بەهاودڵی ئیلامەوە ، نیشتەجێ بوویێتن .

٤ . لەڕاستی دا هیچ جۆرە بەڵگەیەکی نەتەوەیی و دێرینە دەربارەی هخامەنشییەکانەوە بەدەستەوە نییە و مێژوونووسانی دێرینەی خۆدی لەناساندنی ئەوانەدا بێدەنگن . فیردوسی کەتەنانەت ئەفسانەکانی پێش لەمێژوو لەکۆمەڵە هۆنراوەکانیدا وەکو مێژووی لەیەکنەبچراوی ئێران کۆی کردووەتەوە ، کەمترین ئاگاداری لە سەرهەڵدان و تێکشکانی هخامەنشییەکان نییە .

تەمەنی مێژوو نووسین دەربارەی هخامەنشییەکان کە متر لەسەد ساڵی تێپەڕ کردوە و خوێندنەوەی بەردەنووسراوەکەی بی ستونیش دەگەڕێتەوە بۆ سەدوپە نجا ساڵ پێش لەئیستا . دوو بەڵگەی ڕەسەنی دەرەکی هەیە کە چ ئامارەیەکی بۆ رەگەزێک بەنێوی هخامەنشییەکان نەکردووە ، تەنیا باسی دەورانی

کورش تا داریوش و ئەردەشێر دەکات، تەورات و مێژووەکەی هێرودێتە. ئەم کتێبە لەبەر چەن هۆکارێک کە ڕایدەگەیەنم، مێژووەکەی هێرودێت وەکو بەڵگە ڕەت دەکاتەوە، و ئاماژەکانی تەورات هەڵدەسەنگێنێت، ئاگادارییەکانی ئەم سەردەمە لەم بارەوە بەدەسکرد وکوکردنەوەی ڕۆژهەڵاتناسانی خاوەن مەبەستی دەزانم و دەکەومە دووای ئەوپرسیارە سەرەکیە کەڕاستی هەبوون وهاتنی هخامەنشییەکان ڕۆشن دەکاتەوە: بەچشێوەیەک دەکرێ لەنێو هۆز وخێڵێکی نەناسراودا کە لە هەر جۆرە پەیوەندییەکی هەرێمی، نیشانەی مادی و پاشەکەوتی عەقڵی و فەرهەنگی بێبەری بێت ولەپڕ سەرکردەیەکی وەکو کورشی تێدا هەڵکەوەی کە لەکاتێکی کورتدا لە هیچەوە بگاتە بناغەدانەری ئیمپراتورییەکی پڕ دەسەڵات لە ڕۆژهەڵاتی ناوڕاستدا، ئیمپراتورییەک کە پێش لەکورش خاوەنی سامان و دەسەڵات و ژیانی دێرینەی ئیمپراتورانی کۆنتر بوو؟.

# گەڕیان بەشوێن ناسنامەدا

بیرکردنەوە لە مێژوی ئێران ، هەمیشە مێژوونووس لەپلەی دەسەڵاتداری داریوشدا ڕادەوەستێنێ . نەتەنیا شێوەی جێ گیربوونی ئەو لە ئیمپراتورییەکی تازەدانراودا ، بەڵکو هەوڵەکانی ناوبراو لە دروستکردنی پەیوەندی لەگەڵ مێژوودا ، قەبارەیەکی مەزن لەبەڵگەنامە و زانیاری دیمانەیی ، کە تەنانەت نیشاندانی ئەو وێنانە مدێرن بوون و پیشکەوتوی سەردەمی خۆیان دەنوێنن ، مێژوو نووس تووشی سەرسووڕمان دەکات . پێداگرتنی داریوش بۆڕوشن کردنەوەی کارەکانی بەڕادەیەک وردبینانەیە کە وەکو کاردانەوەی بەڕێوەبەرانی ئەو کۆمەڵگا سیاسییانەیە کەپشتی ئەنجامی هەر تاوانێکی نائاسایی و نەگونجاو و گەورە ، هەمیشە دەکەونە حاڵەتی پاساکردن و خۆپاراستن .
لەم ڕوانگەوە بێگومان داریوش یەکی لەو بناغەدانەرانەیە کە هەمیشە بۆ پاساکردنی کارە ناڕەواکانی ، ڕووکەشی فەرهەنگی دۆرست کردووە .

لەیەک یان دوو دەهەی ئەم دووایەدا ، سەرنج لەسەر نووسراوە خەستوخۆڵەکەی داریوش لەبیستون ، لەسەرنج وتی ڕوانینێکی ڕووت تێپەڕی کردووە و گەیشتووەتە ئاستی لێکۆڵینەوەی ڕەخنەگرانە . بەردە نووسراوەکەی بێستون یەکی لەکلیلە سەرەکییەکان بۆ کردنەوەی ڕووداوە پڕ پێچوقەمچەکانی سەرهەڵدانی هخامەنشییەکان و گرنگترینی ئەوانەیە .

پشکنینی ئێمە لەم نووسراوە و ئەم بەشەدا ، دەگەڕێتەوە بۆ دۆزینەوەی ناسنامە و ڕەچەڵەکناسی هخانەنشییەکان ،، کەلەوە تەنیا دوو بەڵگەی سەرەتایی و دوورلەدڵنیایی مان بەدەستەوەیە ، گلە نووسراوەکەی بابۆل و بەردە نووسراوەکەی داریوش لەبێستون کە بەم جۆرەی خوارەوە ڕایدەگەیەنێ :

"منم داریوش ، پادشای مەزن . پادشای پادشایان ، پادشا لە پارس ، پادشای وڵاتان ، کوڕی ویشتاسپ نەوەی ئەرشام هخامەنشی . داریوش شاە ئەڵێ: بابی من ویشتاسپ ، بابی ویشتاسپ ئەرشام ، بابی ئەرشام ئاریا رەمن ، بابی ئایارەمن چیش پیش ، بابی چیش پیش هخامەنش . داریوش شاە ئەڵێ : لەبەرئەوە ناوبانگی ئێمە هخامەنشییە . ئێمە لەمێژەوە ڕگەزێکی ڕەسەنین . لەمێژەوە تۆخمی ئێمە پادشا بوون . داریوش شاە ئەڵێ : ٨ (کەس) لە (تۆخمە = پێشێنیان)ی ئێمە پادشاە بوون . من نۆهەمینم . ئێمە ٩ (کەس) پشتاوپشت پادشاین" .

(داریوش ، نووسراوەی بێستون ، ستون اول ، سطرهای اول تادهم)

ئەمە ڕەگەزنامەی داریوشە لە بەردەنووسراوەکەی بیستوندا ، کە ئەمڕۆ بەگشتی بەدرۆ دەخرێتەوە و نیشانەیەک لە کێشە وکەلێنی ئیمپراتورییە تازە دانراوەکەیە ، و بەتۆزێ ووردبوونەوە لەو ڕەگەزنامەدا ، گشت ئەو داواکارییانە پووچەڵ دەبێتەوە . داریوش دووایی ئەم پێشێنیان و بنەماڵە دۆرست کردنەی ، بە پەیوەندکردنی نەتەوەیی و بەڕواڵەت ڕەگەزیی قایم تر دەکات .

"من داریوش شاهی مەزن ، شاە شاهان ، شای وڵاتانێک کەهەمەجۆرە خەڵکی تێدا دەژی ، شاە ئەم سەرزەویە دوور و درێژە ، کوڕی ویشتاسپ هخامەنش ، پارسی کوڕی پارسی ، ئاریایی خاوەنی نەژادی ئاریایی" .

(نووسراوەی داریوش درنقش رستەم DNa و نووسراوەی داریوش درشوش Dsa) لەڕوانگەی مێژوو نووسەوە هەرسێ پەیوەندییەکەی بە هخامەنش ، بە پارس ، و بە نەژادی ئاریاشەوە ، بەگشتی تازەیە . ئەم وشانە ، وشەی خۆداوەندی "ئورمەزد"ش ، کە تا ئیستا بە هەڵە و بە ئەنقەس بۆ " ئەهورا مەزدا" گۆردراوە ، یەکەمین جار لە زمانی ئەم دەسەڵاتدارەوە خراپە نێو وشەنامەی مێژوو و کێشەیەکی سەرسووڕهێنەری لە ڕۆشن کردنەوەی مێژوودا هروژاند .هەرچەندە گەڕان

بەدووایْ هۆکاری ئەم شێوە وشەخوڵقاندنە و ڕیشەکانی، پێویستی بە لێکۆڵینەوە و پشکنینی دوور و درێژ هەیە بەڵام من ناچارم لەم مەجالەوە ئاماژەیەکی کورت و بەپەلەیْ پیْ بکەم .

## ئەلف. پارسە، پارس و هخامەنش:

لەبارەیْ پارسە، پارس و هخامەنش و سەرچاوەیْ سەرهەڵدانیْ ئەم وشانە لەبەشی کوتایی ئەم کتێبە وەکو پێویست ڕۆشنی دەکەمەوە .

## ب. ئاریا

هیچ ڕچە و شوێنەوارێک لەم وشەیە، بەواتای نەژادییەکەی، پیش لە هەڵکەندنی بەردەکەیْ بێستون بەدی نەکراوە . تەنانەت دیارنی‌یەکە مەبەستی داریوش لەم وشەیە ئاماژە بە واتا نەژادییەکەیْ بوویێت . ئەم نێوە کە بەڕاشکاوی پێکهاتە و پەسنێکە و وەکو هخامەنشی زۆر تازە و تەنانەت ئیمرۆژیش دەنوێنێت، پێش لەداریوش بەکار نەبراوە و بەڵگەنامەکانی مێزوپۆتامیا و زنجیرە پادشاکانی پاش هخامەنشییەکان بەوردی سەرنجیان نەچووەتە سەری . من لەبەشی کۆتایی ئەم کتێبەدا بەواتای وشەیی و فورمییەکەی ئاماژە دەکەم، بەڵام لەبەرئەوە کە زۆربەیْ زاناێان ئیشارە بەواتا نەژادییەکەیْ دەکەن و گریمانەیْ ناڕاستی زۆر لەدەور و بەریدا لەیەک ئەدەنەوە ، سەرەتا بەپێویستی دەزانم کە بۆ پێش‌چاوخستنی ئەو نهێنییانە کەداریوش بەوشەی ئاریا بردوویەتە ناخی مێژووەوە . تیشکێک بخەمە سەر کۆمەڵیْ لەو لێکدانەوانە .

مژاری کۆچبەری لە جێهانی دێرینەدا ، سەرهەڵدان و تێکچوونی شارستانییەتە کۆنەکان و بەگشتی هێزی گرنگی بزوێنەری مێژوو، هەمیشە لەکن زاناێان و پشکێنەران پرسی زۆری لەسەر بووە، بێگومان هێشتا وێنەیەکی ڕۆشن لەجیْبەجیْ بوونی هوزەکان لەدەستماندا نی‌یە، دەرباریْ پرسی کۆچبەری شتێک نازانین و لەنقشی کۆچبەری لەبنیات‌نان و تێکدانی شارستانیەتەکان و بەگشتی کاردانەوەیْ ئەوانە لەسەر پێشبەچوونی مێژووی شارستانیەت ئاگادار نین .

نێو دانانەکان و هەست پێکردنەکان ، لەسنووری گریمانە و وابزانم ، ئەولاتر ناچن ، ئەوەش لەسەر بناغەی کۆمەڵیْ بەڵگەنامەیْ بروا پیْ‌نەکراو، و ئاماژە و ئەفسانە . بەناوبانگ‌ترین و بەهەمان ڕێژە بیْ‌نیشان‌ترینی ئەو هەست پێکردنانە چەمکی "ئاریایی" و پێکهاتەیْ "هیند و ئوروپییە،"

"هێند و ئێرانی" ، و "هێند و ژرمەنی" یە ، کە سەرەڕایْ دووسەدە گەڕان و پشکنین ، هێشتا لە پشتوانەیْ مێژوویی ، جۆغرافی ، و زمان ناسین بیْبەرییە و بەشێک لە چاوەڕوانیی کەسانیْ کە بەم وشانەوە سەرقاڵن ، بەراورد ناکات .

مژاری شوێنی سەرهەڵدانی ئارییاییەکان و کۆچبەربوون و پاش ئەوە نیشتەجیْبوونیان لە ئێران و هێند و ئوروپادا ، هۆکاری دەستیوەردانی زۆر و جۆر بەجۆر بووە کە سەرەڕای دەیان ساڵ پشکنینی بیْوچان و لە دووا پلەیْ ئەو پشکنینانەدا هێشتا هیچ سەرکەوتنێکی شیاوی داکۆکی کردن بەدەست نەهاتووە . یەکەمین تێزێک کە لەسەر تەوەری ئارییاییەوە دەچەرخێت ، ئەڵیْ : لە کاتێکی نادیار و هەرێمێکی نادیاری باکوور ، سیْ گروپ لە هۆزە ئارییاییەکان ڕوویە هێند و ئێران و ئوروپا کۆچبەر بوون ، بەڵام ئەم ڕوانگەیە ڕۆشنی ناکاتەوە کەوەها گروپێکی چروپر ، چۆن لە ناوچەیەکی نەشیاو وەکو باکووردا کۆ بوونەوە ، پێش لە کۆچبەربوونیان لە چ باروودۆخێکی گەشەکردنی مێژووییدا دەژیان ، بۆچی و لە چ کاتێکدا ناچار بەکۆچبەری بوون و گرنگتر لە هەرشتێک ، کاتی کۆچبەربوونی ئەم هۆزە باکوورییانە ، سەرزەویی هێند و ئێران و ئوروپا خاوەنی چ جۆر دانیشتووانێک بوون و لە چ پلەیەکی گەشەکردنی مێژوویی‌دا دەژیان ؟

وڵامدانەوەیْ ورد بەم پرسیارانە بەم جۆرەیە : یەکەم کۆبوونەوەی وەها کۆمەڵێک لە کۆچبەران ، لە ناوچەیْ ئاماژە پێکراوی "ئاریا خوڵقێنەراندا" هیچ کاتێک ڕیْناکەوێت ، دووەم ڕۆشن ئەبێتەوە کە ئەگەر ئەو هۆزانەش مادییەتیان هەبووبێت ، لەحاڵەتی داڕشتنی بنەڕەتی هونەر و فەرهەنگی پێویست بۆ پەرەپێدانی شارستانیەت و لە کۆتاییدا نیشانی ئەدەن کە سەرزەوییەکانی باکووری هێند ، بەرزاییەکانی ئێران ، میزۆپۆتامیاو ناوەند و باشووری ئوروپا ، لەمێژەوە لەلایەن خەڵکانی ڕەسەن و یەکگرتوو و پیشکەوتووەوە داگیرکرابوو ، و کۆچبەرانی خەیاڵی هۆزی ئاریا نەیاندەتوانی بەئاسانی ئەوانە دەرپەڕێنن و شوێنی ئەوانە پڕبکەنەوە و شارستانیەت و ناونیشانی خۆیان بکەن بەجێگری شارستانیەتی بەناوبانگی ئەوانە . هەر ئەم ناڕۆشنییانە ئەبیْ بەهۆیْ ئەوە کە لە سیْدەهەیْ دووایدا ، دووپاتکردنەوەیْ وشەیْ ئاریایی ببیْ بە مەبەستی ناسینی نەژادێکی دیاریکراو و جیاواز لە نووسینەکانی هەر مێژوونووسێک ، کە نیشانەیەکی کۆنەپەرەستی پێوە دیاربێت . یەکەم

یونانی زمانێک کە هاتە نێو خاکی ئەمڕۆیْ یونانەوە ، لەڕووی سواڵەتە خۆڵەمێشی یان زەردی "چەرخی سواڵەت"

که بەبەرهەمی ئەوانە دەناسرا و نێویان "مین یان" ، و ناوبانگەکەشیان هەر "مین یان" بوو . بەڵام ئیستا دەزانین کە ئەم سواڵەتانە نە بەرهەمێکی تازەهێنراوی یونانی زمانە "هێرشبەرە" خەیاڵییەکان ، بەڵکو بەرهەمی ئاڵوگۆڕێکی پەیتاپەیتای "تەکنولۆژیای سواڵتگەری" ناوچەییە و هیچ نیشانێکی لەئاڵوگوری "ناکاو و لەپڕ" «شێوەیٚ خوڵقاندنی سواڵەتدا نییە و ساکارانە بەهاتنی کۆچبەرانەوە دەیلکێنن .

تەنانەت **بەگشتی ئیدعا کراوە کە "شەڕکەرە" هێند وئورووپیەکان، دەوروبەری ۲۰۰۰ ساڵ پ ــ ز لە هەرێمێکی فرە دوورکەوتووەوە کۆچبەری یونان بوون، بەڵام بچووکترین شایەتی دێرینەناسینی وەها کۆچبەرییەکی دوور و درێژمان پێ نیشان نادات** و بەرواڵەت تازەهاتووەکانی یونانی زمان ، ئەوپەڕی ، لەناوچەیٚ پاڵدەستی "ب ، ئوسی" بۆ ئاتیک کۆچبەر بوون . (نانسی دماند ، استاد دانشگاه ئیندیانا ، تاریخ یونان باستان ، متن اصلی ، ل ۲۰ )

ئەوجۆرە کە ج ، پ . مالوری لەنووسراوەیەکی بەنرخدا (مێژوولکەیٚ پشکنینی پرسی هێند و ئوروپی ) بەدوواٚی پرسەکەدا دەچیٚ ، شوێنی سەرهەڵدانی ئارياييەکان بەرادەیەک پژوێڵاوە کە لەگەمە و سەرقاڵییەوە نزیکە . ریشەیٚ بیری سەرهەڵدانی شارستانیەت ، بەهێز و توواناٚی "تاکە هۆز" ، لەراستیدا سەرچاوەکەیٚ لەمژاری نوّح وکوڕەکانی و باهۆزە مەزنەکەیەوە هەڵدەقوڵێت ، کە پەیوەندی بە یەک "مرۆڤی بلیمەتی" هەڵبژاردە و پاڵوێردراو "خوداوەندی هەرێمی" زەویی خۆشحاڵ دەکات . لەسەر ئەم باوڕە ڕۆڵەی تاوانکارانی ئازادکراوی پێشتر لەلایەن خوداوەندەوە یارمەتی دەدرێت و تەمەن درێژ و هێزی لەشی زۆرتر و قۆرسایی جەستەی فراوانتر و دیمەنێکی جوانتر و دەتووانیٚ تۆخم و تووویٚ زۆرتر لەشوێن خوٚیٚ بخاتەوە . لەبیری زۆرینەیٚ خەڵک و نەتەوەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوراست و ئوروپادا پەیوەندی بەوەها بنەماڵەیەکەوە ، بوٚ خۆشەویستی و سەرقاڵی دەروونی و دڵرفێنی گۆڕدراوە وهەروەها کە دەزانین خەڵک و شارستانیەتی ڕۆژهەڵاتی ناوراست بەنەوە و وەچەکانی نوّح دەزانن .

**تایبەتمەندییە فەرهەنگی وشارستانیەتی ئارياکان:** هەندی مرۆڤی زانا و پشکێنەر لەو باوڕەدان کە هۆزە ئارییەکان خەڵکانی چەق و پرتووانا وقایم کردەوە ڕاست وملکەچی یاسا و خوڵقێنەری خاوەن شرافت و بەبڕیار بوون . **شوێنەواری فەرهەنگی و شارستانی کە لەوانە بەجیٚ ماوە** ، دان بەوەدا دەنیٚ کە لە گەشەخوازی یاسا ناسین و نەریت دۆستی کۆمەڵایەتی گەیشتبوونە پلەیەکی بەرز . بەجەرگی و بوێری لەنێو

ئەوانەدا جێگای ڕێز و نرخی تایبەت بووە و ڕۆحی پاڵەوانی و دوژمن بەزاندن و خۆپاراستن بەرانبەر بە ڕووداوە کوتووپڕییەکان گەشە کردووە بنەماڵە و خێزان و خێڵ و هۆزیان لەلا زۆر خۆشەویست بوو و بۆ ڕاگرتنی دەسکەوتەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی ئامادەگییان هەبوو. لەپێش چاوگرتنی زنجیرە پلەکانی کۆمەڵ و بڕوا کردن بە سیستەمی حکوومەتی و هەست بەبەرپرسایەتی کردن، لە ئەرکە بەردەوامەکانی ڕۆژانەیان بوو و لەبەر دژواری فراوانی ژیانی ڕۆژانە و بیری دوژمنانی هەمیشەیی، بیری ڕاگرتنی یەکیتی و یەکگرتوویی کۆمەڵایەتی، یەکی لەهۆکارە حاشاهەڵنەگرەکانی نهێنی مانەوەی ئەوانە بوو... ئەوەی کە لەخەبات و هەوڵدانی ئەوانە، لە دەسپێکی مێژووی سەرهەڵدانی ئارییاییەکان لەئاسیای ڕۆژئاوا و ناوچە جۆربەجۆرەکانی ئێران ئیستادا ماوەتەوە، ئاشکرای دەکەن کە ئارییاییەکان هەمیشە لەپێناوی ئیخلاق و ئایین دا ژیاون و تەنانەت لە سەردەمە هەرە دژوارەکانی ژیاندا پێیان لەسەر مەزنی خۆپاراستنی دەروونی و شەرەف و پیاوەتی بەرانبەری و مرۆڤایەتی داگرتووە. (دکتر رضا شعبانی، مبانی تاریخ اجتماعی ایران، ل٢٣)

**خۆزگە ئاغای شعبانی تەنانەت یەک نموونە لەشوێنەوارە مادیی و فەرهەنگی و شارستانیەتی بەجێ ماو لەئارییەکانی بناساندایە کە لانیکەمی ڕۆشنی بکردایەتەوە ئەوانە لەچ سەرزەوییەک ژیاون و شارستانییەت، بەرهەم و پەیوەندە کۆمەڵایەتییەکانیان لەچ ئاستێکدا بووە!**

**بێگومان هۆنینەوەی کۆمەڵێ هەست و سۆزی بەم جۆرە، کە بەداخەوە بەڵگەنامەی پەروەردەی ناوەندی زانکۆکانی ئێمەی پێکهێناوە و هاوێنەی ووتاری ڕادیویی جەژنە نەتەوەییەکانی لەمەوپێشی ئێرانە، دەربارەی بنەڕەتی مێژوو بەگشتی و دەربارەی مێژووی ئێران، بەتایبەتی، لەبازنەی "ئاریا پەرەستیدا" دەدوێ و نە کەلێنە مێژووییەکانمان پڕ دەکاتەوە و نە بەکەڵکی هیچ جۆرە پشکنینێکی مێژوویی دێت. بانگەوازچییەکانی حێماسەتی نەتەوەیی کە لەسەرترەوە باسمان کرد، ئەم جیاوازییە موقەدەس و مەلەکووتی و هەمیشەییە لەبارەی هۆزێکەوە ئەچڕێ کە خۆدی خۆی دانی پێدادەنێ، و کەسێکی دیکە لێ تێ ناگات.**

"شوێنی کۆبوونەوەی سەرەتایی هۆزە ئارییاییەکان بە لایەنە جۆربەجۆرەکانی وەکو ئاسیای ناوین، باکووری قەوقاز، نیوەدوورگەی کریمە، ئوروپای باکوورو هەندی لە ناوچە باکوورییەکان نیوەی باکووری زەوییەوە گرێ ئەدەن و هێشتاش بەدڵنیاییەوە ناتوانرێت دابین بکرێت کە ئەوانە لەچ کاتێکەوە کۆچ کردنیان دەس پێکردووە و لەیەکتر جیابوونەتەوە؛ لەگەڵ ئەوەشدا زۆرینەی زانایان شوێنی ئێران ویج بە دەوروبەری خوارەزم دەزانن و وکو شوێنێک کە هەموو ئارییایە ڕۆژهەڵاتی و هیند و ئێرانییەکان دڵخۆشیان پێیە، بیری لێ دەکەنەوە. ئەم بەهەشتە زێڕینە گۆڕەپانی فرمانرەوایی باب سالارانەی جەمشید، پادشای ئەفسانەیی و توندڕەوی ئەوانە، و بیرەوەرییە

میژوییه‌کان بوو ، و له‌وانه‌یه که ڕانه مه‌ڕ و ماڵاته‌که‌یان ئامرازی سه‌ره‌کی ژیان و خۆبه‌خێوکردنیان بووبێ" .
(هه‌مان ، لاپه‌ڕه‌ی ١٧)
ئاگاتان لێیه که ئارییاییه‌کانی ئاغای شعبانی ، ته‌نانه‌ت شوێنی جوغرافیای دیاریکراویان نی‌یه تا له‌و خاڵه‌وه بێنه نێو مێژووه‌وه . وه‌ها خۆهه‌ڵکێشانێکی خه‌ڵک خڵه‌تێن ، دوواکه‌وتوو ، ناڕاست ، ڕگه‌زپه‌ره‌ستانه و پووچه‌ڵ ده‌رباره‌ی "هۆزی ئاریا" هه‌میشه له‌ژێر کۆگایه‌ک له هه‌وڵدانی پشکێنه‌رانه و جێدی‌دا داشاردراوه ، و تاڕاده‌یه‌ک که بۆده‌سمایه‌ی سیاسه‌تچیه هه‌ڵپه‌ره‌سته‌کان ، ڕۆشنبیرانی ئاژاوه‌چی ، مێژوونووسانی خاوه‌ن هه‌ڵوێست و بێژه‌رانی مێهره‌جانه فۆرمییه‌کان دابه‌زیووه .
پێرستێک که مالوری هه‌ڵیده‌سه‌نگێنێ له‌هه‌ندێ لایه‌نه‌وه زۆر شایسته‌یه بۆخوێندن .
ناوبراو مێژوولکه‌ی پشکنین و ده‌سکه‌وتی پشکێنه‌رانێک ده‌خاته به‌رده‌ست که‌بۆ هاتنه نێو درگای کۆچبه‌ر بوون و سه‌ر لێشێواوییه‌کانی جیهانی دێرین و دۆزینه‌وه‌ی شوێنێک که ئارییاییه‌کانی لێوه هاتوون ، هه‌وڵیان داوه . ئاشنابوون له‌گه‌ل هه‌ڵبژارده‌یه‌ک له‌م ڕوانگانه ، بێ‌به‌رهه‌می وه‌ها هه‌وڵدانێک له‌بواره مێژینه‌کانه‌وه تا سه‌رده‌می ئێمه ئاشکرا ده‌کات:
" سرویلیام جونز سالی١٧٨٦ ڕاێگه‌یاند که‌زمانه‌کانی سانسکریت ، لاتین و یونانی له‌یه‌ک ڕیشه‌ن به‌ڵام ڕیشه‌هاوبه‌شه‌که‌یان وون بووه" ، "فردریک شلگل له‌ساڵی ١٨٠٠دا دژه‌ریی خۆی به‌رانبه‌ر به‌و بیروباوه‌ڕی ئه‌و کاته‌دا ده‌ربری که گوایه شوێنی سه‌رهه‌ڵدانی ئارییاییه‌کان دوورگه‌یه‌کی خه‌یاڵی له ده‌ریای باکووردایه و باکووری هیندستانی ناوه‌ندی بڵاوبوونه‌وه‌ی هه‌موو نه‌ته‌وه‌کانی جیهان ده‌س‌نیشان کرد" ، " یوهان دولونگ پێچه‌وانه‌ی سه‌رده‌می‌خۆی باوه‌ڕی وابوو که هه‌موو زمانه‌کان یه‌ک ڕیشه‌یان نی‌یه و شوێنی سه‌رهه‌ڵدانی مرۆڤی به‌ڕۆژهه‌ڵاتی ئاسیا ده‌زانی" "یامس یانگ له‌هه‌ڵسه‌نگاندنی ڕوانگه‌کانی دولونگ‌دا ئه‌م شوێنه‌ی به‌ڕۆژئاوا و باشووری ئاسیا ، به‌تاییه‌ت کشمیر ده‌ناساند" " راسموس راسک که له زمانه‌وانیدا پسپۆڕبوو ، له‌ساڵی ١٨١٨دا زمانی تراسی به ڕیشه‌ی سه‌ره‌کی هه‌موو زمانه‌کانی ئاسیای بچووک و ده‌شته‌کانی یانونی دانا" " الکساندر موری لێبراوانه ڕاێگه‌یاند که بیشکه‌ی شارستانیه‌تی جیهان ئاسیایه" " فرانز بوپ و یاکوب گریم له ١٨١٦دا قبوڵی کرد که تیرۆژی شارستانیه‌ت له‌ڕۆژهه‌ڵاته‌وه جیهانی گرتووه‌ته‌وه و

ڕیشه زمانه‌کانیان به سانسکریت ده‌زانی" ،" فرانزو له ساڵی ١٨٣٨دا نووسی که ئه‌مه بیرکردنه‌وه‌یه‌کی بێ‌نرخه ئه‌گەر هەوڵ بدەین ڕیشه‌یٚ هەموو زمانه‌کان له‌یه‌ک سه‌رچاوه وه‌ربگرین" "لاثام له ساڵی ١٨٥٩دا له‌ڕێگایٚ زانستی پله‌به‌ندی ژین‌ناسینه‌وه ده‌یگوت جیاکردنه‌وه‌یٚ ئوروپاییه‌کان له هێندی و ئارياييه‌کان، وه‌کو ئه‌وه‌یه که بێژین گیان‌له‌به‌رانی مورروداری به‌ریتانی، له‌تیره‌یٚ مورروداراني ئیرله‌ندین و له‌م ڕێگاوه ڕایگه‌یاند که شارستانیه‌ته‌کانی هێند و ئێرانی له ناوچه‌یه‌کی نزیکی لیتوانییه‌وه ده‌ستی پێکردووه"، " شلانجر له‌ساڵی ١٨٣٥دا ووتی شوێنی سه‌رهەڵدانی هێند و ئوروپی و ئارياييه‌کان له چیاکانی موستاگ تا ده‌ریای خه‌زەر درێژه‌ی هه‌بوو."
ارنست رنان ئه‌و شوێنه‌یٚ نزیک ده‌شته‌به‌رزه‌کانی پامیر له‌ئاسیایٚ ناوین ده‌زانی و ده‌یگوت له‌بەر ئه‌وه که چیروکه وێژه‌کانی زمانی هێند و ئوروپی له‌وشوێنانه ئاشکرا بووه، جگه‌له‌وه‌ش، کتێبی پیروز یانه‌یٚ مروڤی له ئاسیا ناوه‌ندوه ناساندووه که‌وابوو، هەموو خه‌ڵک ته‌نیا ده‌تووانن له‌ئاسیای ناوینه‌ه سه‌ریان هه‌ڵدابێ" ، " له‌ساڵی ١٨٥٩دا آدولف پیکته به‌که‌ڵکوه‌رگرتن له کۆمه‌ڵی وشه‌یٚ زمانه‌کانی بنه‌ماڵه‌ی هێند و ئوروپی، شوێنی ئارياييه‌کانی بوباکتریا گواسته‌وه.
پیکته یه‌که‌مین که‌س بوو که واێده‌زانی ئارياييه دێرینه‌کان له‌لایه‌نی جوانی و نه‌ژادی و زیره‌کییه‌وه له‌خه‌ڵکانی دیکه جیاوازترن، به‌ڕاده‌یه‌ک که‌له‌ناوڕاستی سه‌ده‌یٚ ١٩دا ئارییه‌کان و هێند و ئوروپییه دێرینه‌کان، له‌ڕوانگه‌یٚ زۆرینه‌ی پشکێنه‌رانه‌وه ، نه‌ژادێکی باشتر ناسرابوون، بۆچوونێک که هێرش بردن بۆسه‌ر زۆربه‌یٚ وڵاتانی جیهان له‌لایه‌ن ئه‌و ئوروپییانه‌وه که‌خۆیان به ئاريايیه ده‌زانی، پاسا ده‌کرد. وئه‌مه له‌سه‌ر پشکنین و به‌دواگه‌ڕانی داهاتووی ئارياکان، شوێنه‌وارێکی قووڵی دانا."
جان بالدوین له ١٨٦٩ دا باوه‌ڕی وابوو که له سه‌رده‌مه دێرینه‌کان خه‌ڵکانی خاوه‌ن شارستانییه‌تی ئاريايی له‌ئوروپادا ده‌ژیان که ئاستی تووانايیه‌کانیان له‌سه‌رده‌می خۆیان گه‌لیک پێشکه‌وتووتر بوو "
"له ساڵی١٨٧٠دا هن دژبه‌ری ڕوانگه‌که‌ی پیکته بووه‌وه و به‌ره‌یٚ ئوروپیه‌کان به‌وه‌چه‌یٚ هێندییه‌کان نه‌زانی" . " بنفی هەرله‌و کاته‌دا له‌ته‌وه‌ری ئوروپایی هه‌نگاوێک ئه‌ولاتری نا و نووسی: له‌به‌ر ئه‌وه که پشکنینه زه‌ویی‌ناسینه‌کان به‌دڵنیاییه‌وه ، ئوروپایٚ به کۆنترین شوێنی مروڤ

دەناسن ، نیشانەکانی هاتنی مرۆڤ لە هیندەوە بۆ ئوروپا ، بەدەمار گرژییەکی منالانە دەزانیت" .
" لە ساڵی ۱۸۷۳ دا آلبرت پایک جارێکی‌تر هێندی بەشوێنی سەرهەڵدانی ئارییایەکان و هەموو شارستانیەتی جیهان لەیەکدایەوە و مێژووی پێکهاتنی شارستانیەتی هێندستانی بەیارمەتی زانستی ئەستێرەناسینەوە بردەوە بۆ دەهەزار ساڵ پێش لەزاینی" . "تیودور پوش لە ساڵی ۱۸۷۸ دا شوێنێکی نوێ بۆ سەرهەڵدانی ئاری و هێند و ئورووپییەکان ناساند و بەم‌جۆرە هەستی ڕەگەز پەرەستی گەیاندە دووا پلە . ناوبراو تیشکی خستە سەر لەش‌ناسی مرۆڤ و نووسی کە بەرانبەر یاسای سورشتی ڕەگەز و پلەیٔ جیاوازی مرۆڤ ، تەنیا ئەوانە کە پێستی ڕۆشن ، قژی بۆر وچاوی شینیان هەیە ئاریایی و ناوەندیشیان هەرێمی دەریای بالتیکە و لەلیتوانییەوە سەریان‌هەڵداوە .
ئەمە پاساکردنی بی‌نرخ و پووچەڵی تیٔوری داڕێژەرانی نازیست لەشەڕی یەکەمی جیهانی‌دایە". "
کارل پنکا لەساڵی۱۸۸۳دا کتێبێکی دەربارەیٔ ڕیشەی ئاریاییەکان نووسی و ووتی: هەرچەند کە تێزی پڕنرخیی قژ بۆرەکانی پەسەندە ، بەڵام بڕوایٔ وایە کەولاتی لیتوانی وڵاتێکی زونگاو و ناتووانیٔ شوێنی سەرهەڵدانی وەها نەژادێکی پڕجموجۆش و بەهێز بێت کە پوش ناساندوویە و لەکۆتاییدا بەتۆزی دەسکاری‌کردن شوێنی سەرهەڵدانەکەیان گواستەوە بۆ ئیسکاندیناڤیا" . "
چارلز موریس لەساڵی ۱۸۸۸ دا خوشەویستی خوێ لەگەڵ نموونەیٔ فەرهەنگی قەوقاز و سۆزی چیرۆک ووتندا تێکڵاو کرد و یەکجاری نووسی کە هەموو مرۆڤە توٚقێنەرەکانی سەرزەویی لە تیرەی مەغولی و هەمووشارستانییەتەکان لەقەوقازەوە سەریان هەڵداوە و ئەمانەشی بە پێشرەوی کۆچبەربوونی ئارێییەکان ناساند" لەساڵی ۱۸۸۸ دا ماکس مولر بەکەڵکوەرگرتن لەدەسکەوتە تازەکانی زمان‌ناسین و نەژادناسی تیشکێکی تازەیٔ خستە سەر ئەم هەوڵدانانە و ڕایگەیاند کەئاریایی شتێک نی‌یە ئیلا مژاری زمان ناسین نەبیٔ و ئەوەش ناتوانێت ئەوانە کە بەم زمانە ئاخەفتنیان کردووە نیشان‌بدات و لەکۆتاییدا نووسی ئەگەر ناچاری بکەن کە شوێنێک لەنەقشەیٔ خرتایی زەوییدا بۆسەرهەڵدانی ئاریاییەکان ببینێتەوە ، پەنجە بۆ"ناوچەیەک لە ئاسیا"ڕادەکێشی و ئەوەش بەوٚ بونەوەیە کە دێرینترین شارستانیەتەکان لەو دەوروبەرەدا دوٚزراوەتەوە" . "دووایی تیلور لەکوتایی سەدەیٔ نوزدەهەمدا ئەوگریمانەیٔ قبوڵ‌کرد کە قژبۆرەکان ڕەگەزی جیاوازو باشترن ، و

پاش باسێکی دوور و درێژ بەو ئاکامە گەیشت کە ئیلا فینلاندییەکان نەبێ هیچ نەژادێک لەجیهاندا ناتووانی خاوەنی تایبەتمەندی بێوێنەیٚ ئارییاییەکان ببێت و ئیلا فینلاندیەکان نەبێت هیچ زمانێک ناتووانێت ڕیشەیٚ زمانە کۆنەکان بێ، و دووایی تیلور ئارییاییەکانی بەتیرەیٚ فینلاندی ناساند" . " داریوا دوژوبنویل لەساڵی ١٨٨٩دا شوێنی سەرهەڵدانی ئارییەکانی لەئوروپادارەت کرد وهەرێمی رووباری سەیحون و جەیحونی بەژێنگەی سەرەتایی ئەوان دەس‌نیشان کرد، و دەیگوت بەبێ پەیوەندی لەگەڵ ئیمپراتورەکانی ئاسیا کە لەپرسی شەڕ و ئاشتی‌دا زۆر بەئەزموون بوون، شارستانیەتی دووایی ئوروپا پاسا ناکرێت" ."لەساڵی ١٨٩٠دا مرۆڤ‌ناسی بەنێوبانگی ئامریکی، دانیل بریتون بەپاڵدانەوە بە نیشانەکانی زمان ناسینەوە قژبۆر بوونی ئارییاییەکانی بەڕاست نەزانی ونووسی کە زۆرینەیٚ ئارییاییەکان بسکیان ڕەشە و توزی پاش ئەوە وتەکانی باڵانس کرد و ڕاگەیاند کە دەتووانین قبوڵی بکەین ئارییاییەکان لەئوروپایٚ ڕۆژئاواوە سەریان هەڵداوە و دووایی کۆچبەری ڕۆژهەڵات بوون " .

"هاکسلی لەساڵی ١٨٩٠داکەوتەشوێن ڕوانگەکانی پنکا و تیلور و ووتی کەلەسەری ئارییاییەکان درێژە و بسکیان ڕەشە بەڵام شوێنی سەرهەڵدانیان سنووری نێوان ئوراڵ و دەریای باکوورە".

"ئەتو شرادر لەساڵی ١٨٩٠دا پرسی بی‌دەسەڵاتی زمانەوانی لەپشکنینی دێرینەناسی‌دا خستە بەردەس ، و لەکۆتایی‌دا شوێنی سەرهەڵدانی ئەوانەیٚ کارپات لەئیستێپەکانی باشووری ڕوسیا تا ئاسیای ناوەراست دەس‌نیشان کرد" . " (ئێشمیت)یش لەهەمان کاتدا لە کتێبێک بەناوونیشانی "شوێنی سەرهەڵدانی هێند و ژرمەن" ، بەشێوەیٚ توژینەوەیٚ ژماردنی ١٢یی، ئارییاییەکانی بۆ کەنارەکامی دوو ڕووباری دیجلە و فورات و شارستانییەتەکانی دەوروبەری بابوڵ گواستەوە" . لەساڵی ١٨٩٢دا هرمان همپرت بەتێروانینێکی ڕەخنەگرانەوە سەبارەت بە هەموو ڕوانگەکانی پێش‌لەخۆیٚ ڕاێسپارد کەبەگشتی باشترە باسی نەتەوەیێک بکرێت نەوەک نەژادێک وگەشەکردنی شارستانیەتی لە کەنارەکانی دەریای بالتیکدا بەڕاست زانی" . "لەکۆتایی سەدەیٚ ١٩دا ویلیام تێزی نەژادیشی قبوڵ نەکرد وباوەڕی وا بووکە پرسی هێند و ئوروپی وئارییایی هەر وەکو خۆیٚ دەمێنێتەوە و دەربارەیٚ هەرجۆرە ئاگاداریی ناڕۆشن و بێ‌سەروبن وپەیوەندی‌دار بە مرۆڤەوە،

دوور له‌به‌رپرسایتیه و زانایانی له‌م باره‌وه ووشیارکردووه" . له‌سه‌ده‌یٚ ۲۰ و سالّی ۱۹۰۲دا موش ووتی ئه‌بیٚ زمان‌ناسی له‌ڕشته‌یٚ دیّرینه ناسی جیا بکرێته‌وه و ڕوانگه‌که‌یٚ پنکا و ناوه‌ند بوونی ئیسکاندیناڤیای ڕه‌فز کردوه‌و سه‌رچاوه‌یٚ ئارییه‌کانی له‌ناوچه‌یه‌کی نێوان باشووری بالتیک تا باشووری کارپات و ڕۆژهه‌لاّتی ڕووباری ئه‌دەر دیاری کرد و به‌م‌جۆره ڕایگه‌یاند که شارستانیه‌تی ئورووپا سه‌ربه‌خۆه و ده‌توانی به‌بیٚ ئه‌وه که‌له‌سه‌رچاوه‌یه‌کی دیکه‌وه هه‌لقولّیبێت ، پێکهاتبێت" .

" گوستاف گوسینا له‌سالّی ۱۹۰۲دا کتێبێکی به‌ناونیشانی . " ولاّمی پرسی هێند و ژرمه‌ن" نووسی و ڕایگه‌یاند که‌شارستانیه‌ت له ئالّمان و له‌سه‌رزه‌ویی‌خۆیه‌وه بۆ جێهانی دێرین خۆر بووه‌ته‌وه و بۆ سه‌لماندنی مژاره‌که‌ش نموونه‌ی خۆلقاندنی سوالّه‌تی هێنایه‌وه بیر که له مێژه‌وه دووا تێزێک بوو که باسی ئاریایی و هێندیی و ئورووپیه‌کانی ده‌کرد" . " سالّی ۱۹۰۳ زانایه‌کی هێندی به نێوی تیلک ، سه‌رنج‌ڕاکێش‌ترین شوێنی سه‌رهه‌لّدانی ئارییه‌کان واتا جه‌مسه‌ری باکووری ناساند و بۆسه‌لماندنی ئه‌و تێزه چه‌ن ڕوه‌ک و گیان‌له‌به‌ری پشتوێنه‌ی زه‌ویی و هه‌ندی فاکتی له‌ئاوێستا کرد به‌نیشانه‌یٚ ڕاستبوونی تیۆرییه‌که‌یٚ . ناوبراوهه‌ولّی‌دا به‌هه‌ره‌مه‌ندی جه‌مسه‌ری باکوور بۆ په‌روه‌رده‌کردنی یه‌که‌مین شارستانیه‌ت بسه‌لمێنێت" .

"ژوزف ڤیدنی پشکێنه‌ری ئه‌مریکایی له‌سالّی ۱۹۰۷دا یه‌کی له‌هه‌لّسه‌نگراوترین ڕوانگه‌یٚ هێند و ئورووپی و ئاریایی خسته‌به‌رده‌س و له‌کۆتاییدا به‌و ئاکامه گه‌یشت که باشتر وایه له‌ئیستێپه‌کانی باشووری ئاسیای میانه به‌دووای ڕیشه‌ی ئارییه‌کاندا بگه‌ڕین . ناوبراو نزم‌بوونه‌وه‌ی ئاستی ئاوی ده‌ریاکان و به‌رفراوان بوونی چۆلاّییه‌کانی ئاسیای‌ناوین ده‌کات به بیانو و هه‌لّخرێنه‌ری کۆچبه‌ر بوونی ئارییه‌کان" . " کناور له ووتارێکی نووسراوه‌یی له‌سالّی۱۹۰۳ دا ،له‌ڕه‌وشتی ڕیشه‌ناسی وشه‌کان ، خالّی ناوه‌ندی شوێنی سه‌ره‌کی ئارییه‌کانی که‌ناره‌کانی‌ڕووباری ولگا دیاری کرد" . "زیگموند ڤایست له‌سالّی ۱۳۱۹دا ئیدانه‌ی ڕوانگه‌یٚ که‌له‌سه‌ری درێژ و قژی بۆری کرد و له ئاکامدا شوێنی سه‌رهه‌لّدانی هێند و ئورووپییه‌کانی برده‌وه بۆباشووری ڕوسیا و لکاندی به‌شارستانییه‌تی تریپوله‌وه" ." کری له کتێبێک به‌نێوی گزنگی مێژوو ، دیسانه‌وه شوێنی سه‌رهه‌لّدانی برده‌وه بۆ نێوان دوو ڕووباری سه‌یحون‌و جه‌یحون و بایخێکی زۆرتری به ده‌سکه‌وتی پشکنینی گۆڕه‌کان و

شوێنەوارەکان و نیشانە فەرهەنگییەکان دا" . " هارولد بندر لەساڵی ١٩٢٢دا یەکی لە هەست پێکراوترین هەڵەیٚ زانایان و خەباتکارانی بەوە زانی کە پێش لەوە بەدوایٚ نموونە مادییەکاندا بگەڕن، شوێنی سەرهەڵدانیان دابین دەکەن. ناوبراو لەوٚ باوەڕەدا بووکە شارستانییەتەکان دەتووانن لەپاڵ یەکدا پێکبێن و گەشە بکەن و لە کاتێکی نزیک بەیەکدا، لە هەرێمە جۆربەجۆرەکاندا ڕیشە دابکوتن، بەڵام لەوٚ حاڵەشدا لیتوانی بە ناوەندی شارستانییەتیهێند و ئوروپییەکان دەزانی. "گایلز لەساڵی ١٩٢٢دا ڕووباری دانوبی وەکو ڕێگایەکی شیاو و ئاسان بوکوچبەربوون لیکدایەوە و هەنگاری (مەجارستان) بوٚ ناوەندی شارستانیەتی ئارییەکان دابین کرد" .

"گوردون چایلد لەساڵی١٩٢٦ دا کتێبێکی بەنێوی ئارییەکان نووسی و ئەوٚ شوێنانە کە بوٚناوەندی سەرهەڵدانی ئارییەکان پێشنیار کرابو، هەڵیسەنگاندبوو ناوبراو پاش تێروانینێکی ورد لەزەمینە زمان و دێرینەناسیندا، سەرهەڵدانی ئاریایی لەئیستێپەکانی باشووری ڕوٚژئاوای روسیا ڕاگەیاند" . " فریزر لەساڵی ١٩٢٦دا لەڕاستودوٚرست بوونی هەموو ئەوٚ دەسکەوتانە تووشی دوودڵی بوو و بوٚچوونەکانی هێندی و ئوروپی شەکاندەوە و دوودڵی لەم بارەوە تاماوەیەکی زوٚر باڵی بەسەر هەڵسوکەوتی پشکێنەرانی ئەوکاتەدا کێشابوو" . " سیس ١٩٢٧دا ناوەندی هێند و ئوروپییەکانی بوٚئاسیای بچووک گواستەوە" . " لاچمیدار دێرینە ناسی هێندی لە ١٩٣٠ دا جارێکی تر هە موو شتێکی بوٚئاسیا گواستەوە و شارستانییەتی ئارییەکانی لەگەڵ فەرهەنگی ئاسیادا بەیەک سەرچاوە زانی" . " هربرت کوهن لەساڵی ١٩٣٢دا تێزێکی نوێ پێشکەش کرد و هەرکام لەناوەندە پێشوەکانی بە بیانوێکەوە ڕەتکرد و لەدووابیدا هەوڵیدا بیسەلمێنێت کە شوێنی کوٚبوونەوەیٚ سەرەکی ئارییەکان باکووری ئافریقا و لەنێوٚ کاپسیەکاندا بووە (مەبەست کاسپییەکانە؟ وەرگیر) و لەو شوێنەوە فەرهەنگەکانی آلبرک و شالسە تەشەنەیان کردووەتە نێو ئوروپاوە" . " سولیمیرسکی لەساڵی ١٩٣٣دا لە شێوەیٚ ناشتنی مردووەکان و دانانی قاپ و قاچاخ و سواڵەتەکان لەتەنشتیاندا، جارێکیتر سەرنجی چووە سەر ئێستێپەکانی باشووری روسیا، وەکو سەرچاوەی سەرەکی ئارییەکان" . "ژوٚرژ پواسون لەساڵی ١٩٣٤ دا لەکتێبێکدا بەنێوی ئارییەکان، لەڕوانگەکانیسولیمیرسکی داکوکی کرد و هەرێمی باڵکان وکارپات و ئادریاتیک و ئالپ ی

ەسنووری شارستانییەتی ئاریاکان ناساند" . "واڵتر شولتز لەدەهەی چوارەمی سەدەی بیستەمدا گشت ڕوسیای لەگۆڕەپانی شارستانییەتی دێرینەدا وەدەرنا و چووە سەر ناوەندی ئوروپا بەتایبەت ئاڵمان وهاوکات لەگەڵ بەهێزبوونی نازییەکانی ئەوڵاتە، ناوەندی ئوروپای بە نیشتمانی ڕەسەنی ئارییە پڕهێز و بەدەسەڵاتەکان ناسی" . "(گوستاو کیل)ش کەوتە شوێن هەمان روانگە و هەر لەمێژەوە ئاڵمانییەکانی بەخاوەن بەهرە و بلیمەت لە سوارکاریدا زانی و بە بۆنەوە ڕایگەیاند خوڵقێنەری شارستانییەتی دێرین و لە نەژادی ڕووتی ئارییین" . لەمە بەدوواوە کۆمەڵێک نووسراوەبڵاو بووەوە کە هەموویان ئەڵمان وناوەند و باکووری ئوروپایان بەشوێنی سەرهەڵدانی ئارییەکان دەزانی "فریتز شێوەیٚ سوارکاری پێشکەوتووتری ئارییەکانی بەرانبەر بە ئاسیاییەکان خستە بەرباس" . "شاخر مایر و هایر لەساڵی ١٩٣٦دا ناوەندی ئارییەکانیان تەنانەت هەنگاوێک لەبێرلەن دوورتریان نەدەخستەوە" .

"ویلهوڵم کوپرس جارێکی تر شوێنی سەرهەڵدانی ئارییەکان بردەوە بۆ تۆرکمەنستانی ڕۆژئاوا" . " پولیوس پوکورنی لەساڵی ١٩٣٩دا بەبڕیار بوو لەومەبەستە کە خەڵکانی ئوروپاو ئیرلەندی و ئیتالیا و ئیسپانیاییەکان ڕەچەڵەکی غەیری هێندییان هەیە و بروای بەهەبوونی دووجۆر ئاریایی هەبوو کە لەناوەندی ئوروپادا هەڵکەوتبوون" . "ئولنبەک لەساڵی١٩٣٧دا ووتی، دەکری هێند و ژرمەن زمانەکان لەڕۆژهەڵات و لەڕێگایٚ باشووری ڕوسیا وئیستێپەکانی ئورال و خەزەرەوە هاتبێتن " . " تروبتسکوی بەگشتی ئینکاری هاوبەشی ڕیشەیٚ زمانەکانی کرد و ووتی کە پەلە جۆربەجۆرەکانی هێند و ئورووپی چ لەیەکچوونێکیان پێکەوە نی‌یە ولەوانەیە لە ڕاستیدا وەها خەڵکانێک لەمێژوودا نەژیابێتن . ناوبراو پاش ئەم ووتارانە لەوباوڕەدایە کە ناوەندی ئەوانە لەمیانەیٚ هەرێمی بەربڵاوی فینلاند و ئویغوری و قەوقازدا هەڵکەوتبوو" . ئیستوارت مان لە ساڵی١٩٤٣دا بەهەڵسەنگاندنی شێوەی بەڕێوەبردنی جەژن و نەریت و ڕەسم و یاسا و یاری منداڵان و سرودی گەنجان و لە کۆتاییدا دیسانەوە شوێنی سەرهەڵدانی ئارییەکان گواستەوە بۆ باکوور و باکووری ڕۆژهەڵاتی ئوروپا" . " ئێرنێست میر بەهۆیٚ هەڵسەنگاندنی کۆمەڵیٚ وشەوە ئارییەکانی بەتێکڵاوێک لە شارستانییەتە جۆربەجۆرەکان ناسی" . " ئانتون شرر بۆ ڕەوشتی

زمان‌ناسی بایدایەوە و نووسی کە شوێنی سەرهەڵدانی ئاریایی و هیندی و ئورووپییە نەژادەکان، لەرۆژهەڵاتی چیاکانی ئورالّ تا باشوور و ناوەندی ڕوسیا و باکووری دەریای بالتیک دەگرێتەبەر" . " (پاول)ش بەهەڵسەنگاندن و هاودەقکردنی چەند شارستانییەت وەکو هیندی و سلتییەکان ناوەندی هیندی و ئورووپییەکان بەزمانێکی گشتی، ڕۆژهەڵاتییەکان بەناوکرد" . " بوکورنی لەساڵی ١٩٤٩دا تیزی جیابوونەوەی زمانەکانی بڵاوکردەوە و بەپاڵپشتی کولتوری گشتییەوەناوەندی ئاریاییەکانی برد بۆچیکوسلوڤاکیا" . " لەهەمان ساڵدا ویلهوڵم ئێشمیت بەسەرنجێکی وردەوە تیشکی خستە سەر مژاری ئەسپ و سوارکاری و بەبێ ئاماژە بەشوێنێکی دیاریکراو ڕایگەیاند کە ئاریاییەکان لەئاسیای ناوڕاستەوە هاتوون" . " گیورک زولتا تاڕادەیەک کەوتە شوێن تیزەکەی تروبتسکوی، بەڵام ئەوەی ڕاگەیاند کە هەبوونی هاوبەشی هەندێ لەزمانەکان بەهۆی هاوبەشی وبەیەک گەیشتنی جوگرافیاوەیە و لەهیچ مەرجێکدا نیشانەی یەکگرتوویی زمانەکان‌ناسەلمێنێت، لەڕوانگەی زوڵتاوە مژاری هیند و ئورووپی و ئاری بەناوکردنێکی سایلۆحانەیە کە لەگەل ئاستی زانیاری نزمی مرۆڤ لە نەژاد ناسیندا داڕێژراوە" . "پوڵ تیمە لەساڵی ١٩٥٣دا ڕێگایەکی پێچهەلپێچ و دژواری دەربارەی وشەکانی شەراو، زەیتون، ماسییە سوورە (قزل‌آلا ) درەختی سنەوبەر و شتی دیکە تێپەرکرد کە ئاکامەکەی بوو بەوە: هیند وئورووپی وئارییەکان لە باکووری ئورووپا و هەرێمی ژرمەن و بالتیکەوە سەریان هەڵداوە" . " یولیوس پوکورنی کەوتە شوێن هەوڵەکانی تیمە و نیشانەی سواڵەتە شەپۆلدارەکانی خستە سەر دەسکەوتەکانی ناوبراو و ژرمەن و دەریای بالتیکی بە وڵاتی دێرینی ئاریاییەکان زانی" . " ئالفونس نێهرین لەساڵی ١٩٥٤دا لەڕێگای هاودەقکردنی نەریت و باوەڕ و ئایین و ڕەسەن و ناوەکان لە هیند وقەوقاز و ئەڵماندا، بەو باوڕ گەیشت کە شوێنی سەرهەڵدانی ئارییەکان قەوقاز و پراوێزەکانی دەریای خەزەرە" ." (هینکێن)ش هەرلەوکاتەدا هەوڵیدا بەتێکڵاوکردنی چەن ڕوانگە خاڵێکی جوگرافی نەناسراو لەنێوان باشووری ڕوژهەڵاتی ئورووپا و ئیستێپەکانی باشووری ڕۆژئاوای ڕوسیادا وەکو شوێنی سەرەکی ئارییەکان بناسێنی" . " (وریاند مرلینگن)ش لەساڵی ١٩٥٥دا ڕوانگەکەی تیمەی دایە بەر ڕەخنە و بە بەرز کردنەوەی هاوڕیشەیی وشەی شەراو لەزمانی یونانی و ئەرمەنی و

لاتینیدا ، دیسان پەیوەندی زمانی سانسکریت و لاتینی خستەڕوو و کۆبوونەوەی دەسپێکی ئاریاکانی لەخاکی هێندوستاندا بەڕاست زانی" . " لەساڵی ١٩٥٧دا کراسلند گەڕایەوە بۆڕەوشتی تۆژینەوەی زمان لەدێرینەناسیدا ، ناوەندی ئوروپای لەبەرنامەکانیدا سڕیەوە بەڵام شوێنێکی دیاریکراوی جۆرافیایی بۆ سەرهەڵدانی ئاریاییەکان دیاری نەکرد" . " هانس کراهە لەساڵی ١٩٥٧ دا ڕەوشتی دێرینەناسی لەڕێگای زمانەوە ڕەفز کردەوە و ئەوش نەیتووانی شوێنی سەرهەڵدانی ئاریاییەکان دەس نیشان بکات" . " ئێرێنێست پولگرام لەساڵی ١٩٥٨دا لەتووانایی زمانەوانی بۆ ڕتۆشن کردنەوەی پرسە مێژوویەکان تووشی دوودڵی بوو و زانایانی وریا کردەوە و ووتی کاری زمان ناسی بەڕادەیەک بۆلایەنی خەیاڵ گۆڕدراوە کە تۆزێکی ماوە بۆ وشەی جگەرە و بیرەش لەسەردەمی سزارەکاندا ڕیشەیەکی وێژەیی تایبەت بناسێنین" ."گوستاو سوانش جارێکی تر پرسی جیاوازی و سەردەستی نەژادی ژرمەنی هێنایە بەردەس و لەپاڵ ناسینی باکووری ئوروپا وەکومەلبەندی سەرهەڵدانی شارستانییەتی ئاریا وهێند و ژرمەنەکان ووتی کە وێنەی ژرمەنەکان لەهیچ شوێنێکی جیهاندا دەس ناکەون" . " هنزکروتا لە تێزی دێرینەناسی لەڕێگای زمان ناسینەوە داکۆکی کرد و ڕوانگەی ترویتسکوی بەبێ نرخ زانی و لەڕێگای نرخاندنی ڕیشەی وشەکانەوە دیسان شوێنی سەرەکی هێند و ئورویی و ئارییەکانی بردەوە بۆ ڕۆژهەڵات" . "بوش گیمپر لەساڵی ١٩٦٠دا گەڕایەوە بۆسەردەمە هەرە دێرینەکانی ئاسن و مەفرەق و کۆبوونەوەی ئاریاییەکانی بردەوە بۆ هەزارەی پێنجەمی پێش زاینی و ناوڕاستی ئوروپا" . " گیمبو تاس لەساڵی ١٩٦٣وە تا ١٩٧٠ بەزنجیرە نووسراوێک تیشکی خستە سەر کەنارەکانی دەریای ڕەش و ئێستێپەکانی ولگا و ڕیشەی هێند و ئوروپیەکانی لکاند بە شارستانییەتی گورکانەوە" . " رام چندراجین لەساڵی ١٩٦٤دا نووسی کە لیتوانی لەلایەنی زمان ناسینەوە نەگۆڕاوترین و کۆنترین زمانە و بەپێچەوانەی گروپە هێند و ئێرانییەکان و هەر گروپێکی تر ، خەڵکانی بالتیک زۆر کەمتر ژینگەکەیان گۆڕیووە و وەکو ئەیژن لەپەلاماری داڕزاندنی نائاریایی پارێزراون! و لەکوتاییدا شوێنێکی لەڕۆژهەڵاتی لیتووانیدا بۆ نیشتمانی ئارییەکان دەس نیشان کرد" . " ولفانگ شمید و گودیناف لەحەفتاکاندا جارێکی تر هەوڵیاندا ناوەندی ئوروپا بکەن بەناوەندی شارستانیەتی درۆشاوەی ئاریاییەکان"

"براندشتاین لەکۆتایی حەفتاکاندا بەپەژارەوە ووتی پرسی ئاری و هێندی و ئوروپییەکان پرسێکی بەربڵاوە کە هەر ڕۆژە بۆچوونێکی نوێ لەم بارەوە پێشکەش دەکرێت" . ئەم دەربرینە زانایانە هێشتا لەجێ خۆیدایە و هیچ مێژوو نووسێک بەوردی ناتووانی لەم سەردەمەدا بوێرانە وشەکانی ئارییەکان و هێند و ئوروپییەکان و هێند و ژرمەنی و هێند و ئێرانی بەکار بهێنێ ، چوونکە دۆزراوەکان تا ئیستا دەیسەلمێنن کە هەمووی ئەوپرس و مژارانە لەلایەنی ناوەڕۆکەوە نەناسراو نین ، هەروەها موسلر لە حەفتاکاندا بڕوای وابوو کە ئەگەر ئەم گشتە زمان‌ناس و دێرینەناس و نەژادناسانە کە بەزانیارییە هاوشێوەکانیان ئاکامی وەها دژبەیەک بەدەس دەخەن ئەبێ لەڕاستیدا کەم و کووڕی لەشێوەی کار و بناغە فیکرییەکانیاندا هەبووبێ . ئیستا لەمبارەوە گومان و دوودڵی هەیە ، وشەی هێند و ئوروپی هێند و ئێرانی و ئاریایی چەمکانی بێ پسن و قەبارەن و هەروەها کە ئاماژەی پێدەکەین ، لەسی سالی ڕابوردوودا باسێکی نوێ دەربارەی ئەو هۆزە کە داریوش خۆلقاندی نەخراوەتە بەردەس و بەپێچەوانەوە کۆمەڵی ئاماژەی تازە و پڕ لە سووکی و بێ نرخی لەم بارەوە وتراوە . لە یەکەم تێڕوانیندا پڕوپاگەندەی ئوروپییەکان لەسەر ئەم وشە بێ ناسنامە ، دەکرێ بەم جۆرە لەیەک بدرێتەوە کە ئەوانە لەسەردەمی ئیستعماردا وەکو ئاڵای سەردەستی نەژادی بۆ پاساکردنی هێرش بۆ داگیرکردنی جیهان کەڵکیان لێوەرگرت و بەداخەوە لە وڵاتی ئێمەدا هێشتا بە سوود گرتن لە کۆمەڵێک گریمانەی لاوازی زمان ناسی ، بریارێک دەردەبرێت کە تیوری دوواکەوتووی ئاریایی بە تەڕو تازەیی ڕادەگرێت .

"١ . **هۆز و سەرزەویی هاوبەشی ئاریاییەکان** : چەمکێکی تازەی "هێند و ئێرانی" و نازناوی دێرینی گروپە ئارییەکانە و بەکۆمەڵێ زمانی گروپە پڕژمارەکانی هێند و ئوروپی وتراوە کە کاتێکی دوور و درێژ لەباشووری ڕۆژهەڵاتی ژینگەی بەربڵاوی "هێندو ئوروپییەکان" لە دراوسێەتی یەکتردا ژیاون

لەوانەیە کە ئەمانە لەدووا سەدەکانی هەزارەی سێهەمی پێش زایینیدا واتا پێش لە جێ‌بەجێ بوون و کۆچبەرییە گەورەکەیان جۆرێک لە یەکگرتوویان ڕێکخستبێت ولە ژێر دەسەڵاتی تاکە بەڕێوەبرێکدا ژیابێتن ، هەڵبەت نەوەکو تاکە دەوڵەت و نە بەوڕادەیە یەک ڕا و یەکدڵ بەڵکو بەپەیوەندییەکی خۆدموختاری خێڵەکیی و کۆنەوە .
ئەم یەکگرتووییە تایبەتی سەردەمێک بوو کە دوژمنە هاوبەشەکەیان هەڕەشەی لێدەکردن ، زۆرتر هەستی پێدەکرا .
زمانی ئەوانە تاڕادەیەک یەکدەس بوو وئایینێکی یەکدەس و تائاستێکی زۆر نزیک بەیەکیان پەیڕەو دەکرد .

ئەگەر ژینگەی گشت هێند و ئوروپییەکان لە سەدەکانی کۆتایی هەزارەیٚ سێهەمی پێش زاینی، لەسنووری دەریاچەیٚ بالخاش لەڕۆژهەڵات و هەرێمی دانوب لەڕۆژئاوادا لەبەرچاو بگرین، بەشی ئارياییەکان لە هەرێمی ڕۆژهەڵاتی ئەم پانتاییەدا جیٚدەگرێت، واتا لەهەمان دەریاچەی بالخاشەوە تا لایەنی ڕۆژئاوای وۆلگا. ئەوانە بێشتر لە ناوچە بەپیتە کشتوکاڵیەکان و مێرگە چروپڕەکانی ئەم ڕووبەرە فراوانەدا نیشتەجیٚ بوون". (امان‌الله قرشی، ایران نامک ل ٦٣ و ٦٤)

نموونەیٚ سەرەوە نیشاندەری خەیاڵێکی دوور و درێژ و تێکەڵ و پێکەڵە کە زمان‌ناس و دێرینە ناسان لەمێژوودا پێکیان هێناوە. ئەوانە لەحاڵێکدا کە هێشتا هیچ نموونەیەکی جی‌گیر و سەلمێندراویان بەدەس نەهێناوە و لەماوەی دوو سەدەیٚ ڕابوردوودا هەمیشە ڕوانگەکانی یەکتریان بەدرۆ خستووتەوە و لەحاڵێکدا کە دێرین پشکنین لەزمان ناسیندا هێشتا ناتووانرێت بەشێک لە زانست" بێت و زۆرتر وەکو هەوڵێکی ئەزموونیی لە شێوە میناکی سەرەوە و نموونەگەلی دیکە، بۆ "داهێنانی" هۆزێکی تایبەت لەئاسیای ناویندا هەوڵیان‌داوە و لەم‌ڕێگاوە لەڕەتکردن و پشتگویٚ‌خستنی نەتەوە ناوچەییەکانی هەموو جیٚهان وبەتایبەت هۆزە ئێرانییەکان و مێزوپۆتامیا و ئوروپا و هێندوستاندا تاوانبارن.

قسەکانی ئاغای قرشی بەئاسانی، بەبێ پێشکەش کردنی هیچ نیشانەیەکی شیاوی مێژوویی و یا جۆغرافیایی، بەسەر هەمواند دایدەسەپێنیٚ کە ژینگەیٚ ئارياییەکان لەشوێنێکی نێوان دەریاچەیٚ بالخاش لەڕۆژهەڵات و هەرێمی دانوب لەڕۆژئاوا بزانن، ئەوانە لەسەدەکانی کوتایی هەزارەیٚ سێهەمدا بەخاوەن شارستانیەت دابنین و تەنیا بەبونەی چەن سەرزاری هاوبەش و دوور لەدڵنیایی، ئەو هۆزانە کە تەنیا نێوێکیان لیٚ بەجیٚ ماوە، لەوکاتەدا لە بەرزترین پلەیٚ یەککرتووی نەتەوەیی و پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکاندا فەرزیان بکەین! زۆرتر لە دوو سەدە هەوڵدانی بیٚ ئاکام و ٢٠ ـ ٣٠ ساڵ بێدەنگی و ئینکار، یەک تۆز بادانەوە لەتێوری لەنج و پێداگرتنی نەژادپەرستی و "ئاریامەنشانە" ناوبراودا نابینرێت، هەرچەن بەدڵنیاییەوە ناتووانێت ڕۆشنی بکاتەوە کە ئەم هێند و ئوروپیانە لەشوێنە خەیاڵاوییەکەیاندا لەبەرچی تائەو ڕادەیە لەباری کومەڵایەتی و فەرهەنگییەوە گەشەیان کردووە، مەڵبەندی ئەو یەکیتیە لەکام باژێر و یا کەمپێکی پێکهاتوو لە

کۆمەڵێک ڕەشماڵی ناسراو هەڵکەوتبوو . بۆچی ناچار بەکۆچەری بوون و لەبەرچی هیچ گرووپێک لەوانە لە زەیدی خۆیاندا نەمانەوە ، کەلەم سەردەمەدا بناسرێن و ئەگەر هەرێمەکەیان لە ڕوانگەی ژینگەوە بەوپرادەیەبێ‌نرخ بووە کە دووا کەسیان لەوێ هەڵهاتوون ، ئەێ وەها کۆمەڵگایەک چۆن پێکهاتۆوە و لە کۆتقییدا بەرێزیان ئەو هەموو زانیاریەیان دەربارەی ئەو هۆزە خەیڵەکییەوە چۆن بەدەس‌هێناوە ؟ ( ١ ) .

بەم جۆرە تەنیا بەڵگەنامەیەکی کۆن کە ئاماژە بەئارییەکان دەکات ، هەمان چەند وشەیە کە لەنووسراوەکەی نەقش ڕۆستەم و شوشدا نووسراوە و هەمان پەسن و بانگەشەیە کە لەدەمی داریوشەوە بڵاو بووەتەوە .

داریوش شاە ئەڵێ: ئەمەیە وڵاتانێک کە ئەهورامەزدا بەمنی بەخشیوە و من لەم وڵاتانە پادشام . پارس ، ئیلام ، بابۆڵ ، ئاشور ، میسر ، وڵاتانی کەناری دەریا ، لیدیە ، ئیونیە ، مێسیا ، ئەرمەنستان . کاپادوکیە ، پارت ، درنگیان ، ئاریا ، خوارەزم ، باکتریا ، سەغدیان ، قەندهار ، سکاییان ، ساتاگیدی ، ئاراخوسی ، رەخج ، ماکا ، کۆێ ٢٣ وڵات" ، (داندایف ، ایران در دوران نخستین پادشاهان هخامنشی ، ل ٣٤٣ ) <١>

١ـ ناچارین ئەوەش بلێن کە ڕووخانی بیری مێژوویی "ئاریامەنشی" ، بەواتای ڕووخان و پووچەڵ کردنەوەی نووسراوەی مێژوونووسانێکە کە لەدەسپێکی "ئاریا مەنشانە" دەربارەی ئێران ، هیند ، ڕۆژهەڵاتی ناوپراست ، ئورووپا و یاهەر هەرێمێکی دیکەی مێژوو نووسیویانە . ئەو مێژووانە کە لەسەر کوڵەکە خەیاڵییەکەی ئارییایەوە سەرکەوتووە ، بەبێ ئەو کوڵەکە داڕووخانی زۆر سۆرشتییە بەشێوەیەک کە دەتووانرێت هەمووی ئەوانە بەنەنووسراو بزانین . چوونکە کاتێک ناسنامەی هۆزێکی نووسراو لەو مێژووەدا لەهێند و ئاسیای ناوەندیەوە تا ئورووپا دەژیان و نیستا لەژیاندا نین پێویستە وەها مێژوویەک بەبێ‌خاوەن بزانین . دیارە بە بێ‌گریمانەی دەسپێکی هەبوونی ئارییایەکان لەمێژوودا ، بەسەرهاتی لێکدانەوەی لەجۆری خوارەوە بەچی ئەبوو . بنیاتی پادشاهی لەواتای کۆبوونەوەی دەسەڵاتدا ، هەر بەو جۆرە کە ئاماژەی بۆکرا ، لەلایکەوە وڵامێکە بو دژەرییە دەروونیی هۆزە تازە کۆچبەرە ئارییایەکان ، لەلایکی دیکەوە وڵامێک بوو بە پێداویستی داکۆکی لە وڵاتی تازە دەسکەوتووی ئارییایەکان . ئەو ئارییاییانە کە بۆلایەنی ڕۆژئاوا واتا بەرزاییەکان ئێران سەروخوار بوونەوە ، لەم سنوورە تازەدا لەڕووی پێداویستیە وە دەبووا شێوەی ژیانی نوێ و هەڵسوکەوتی نوێیان هەڵبژاردایە ، ژیانێک کە شیاوی مرۆڤی نیشتەجێ و هێمنی کشتوکاڵی بێت . ئەم ئاڵوگۆڕە لەهەموو ناوچەکانی ئێراندا یەکدەس و یەک ئاهەنگ ئەبوو . لەڕاستیدا ئیستا کە باسی ئەو ئارییاییانە دەکرێت کەڕوو بەبەرزاییەکانی ئێران هاتن ، زۆرجار مەبستیان مێدیا و پارسەکانە و دەوترێ کەمێژووی ئێران لەمێدیاکانەوە دەستی پێکردووە لەحاڵێکدا مێدیا و پارسەکان لە ڕۆژئاوا و باشووری ڕۆژئاوای بەرزاییەکانی ئێراندا نیشتەجێ بوون ، ئایرانە وەنجە یا ولاتی نەجیبەکان ( ! ) کە ئارییایەکان کۆچبەری بوون ، ڕۆژهەڵاتیشی دەگرتەوە . لەم هەرێمەدا خەڵکانێک دەژیان کە زۆر درە نترلە ئارییایە ڕۆژئاواییەکانی مێدیا و پارس لە ژیانی شوانی دەسیان هەڵگرت وڕوویانکردە کشتوکاڵ . (فرهنگ رجائی ، تحول اندیشەی سیاسی درشرق باستان ، ل ٦٨)

چەن ڕۆژهەڵاتناسایێک دیسان بەردەنووسراوکەی بێستونیان بەهەڵە خوێندەوە و بۆ نموونە وەکو نووسراوەیٚ سەرەوە، هەراتیان کرد بە ناوەندی نیشتەجیٚ بوونی ئارياییەکان. ئەم وشەیە لەخۆدی نووسراوەکاندا(هَرِوَ)یە = [cuneiform] ، لەوانەیە واتایٚ مەبەست هەرات بێت. هەندی لە ڕۆژهەڵات ناسان بەهەڵە یان ئەنقەس هەراتیان بە"ئاریا" خوێندەوە تاڕاستی قسەکانی داریوش بسەلمێنن و ئارەزوەکانی ناوبراو بۆخولقاندنی وەهاهۆزێک بەدیبهێنن. بەڵام هەوڵەکانیان بەئاسانی بۆ دژی ئارزوەکانیان گۆردرا، چوونکە ئیشارەتی داریوش بە سەرزەوییە داگیرکراوەکان لە نووسراوەکەی بێستوندا ئاماژەیەکی سەرلیٚشێواو نییە. ناوبراو لەناوەندی پارسی هەنوکەییەوە، یەکەم جار بۆ ڕۆژئاوا و دوایی باکووری ڕۆژئاوا و دیسان بۆباشووری ڕۆژهەڵات جووڵا و جارێکی دیکە ڕوو بە ڕۆژهەڵات و لەئاکامدا گەیشتە باکووری ڕۆژهەڵات.

داگیرکردنی نەتەوە و وڵاتەکانیان وەکو داریوش پەنجەیٚ بۆڕادەکێشی، بەوجۆرەیٚ سەرەوە و ئاریاکان"دەکەونە دوورترین خاڵی ڕۆژهەڵات و ناوڕاستی ئیمپراتوریەکە لە ئەفغانێستانی ئیستادا.

بەدووایٚ پارتییەکاندا ئارياییەکان بەڕێوەن، کە لە ڕۆهەڵاتیشاهەنشاهی، دەوروبەری هەراتەوە دێن. پێشکەشییەکانیان تاڕادەیەک وەکو پێشکەشی پارتییەکانە. قەبارەیٚ دەفرەکان جیاوازە و جلوبەرگی تایبەتیان هەیە. بۆنموونە مێزەر و سەروەنەکانیان سیٚجار بەدەور سەریاندا پێچاوە. ئەژنۆیٚ دەرپێیەکانیان هاوڵساوتر و دەرقاچەکانی بەسەر چەکمەکانیاندا داشکاوە. وەها دەکەوێتە پێش‌چاو کە لێوارەیٚ دەرقاچەیٚ شواڵکانیان بەجۆرە پراوێزێک کە یەک سەری بەدەرەوێە، بەسراوە. (هاید ماری کخ، از زبان داریوش، ل ١١٨)

دەتووانین بە سەرنج و وردبینییەوە سەیری وێنەکانی سەرەوە بکەین کە ڕۆژهەڵاتناسان بە چ شێوەیێکی سەختەکارانە لیٚ ئەدوێن. هەڵسەنگاندنی جلوبەرگ و پێکەشی خەڵکانێک کە لە بەردە نووسراوەکەیٚ بارگایٚ گشتی تەخت جەمشید نیشان‌دراوە، لەیەکچوونی زۆر و نائاسایی ستافی نوێنەرایەتی ئارياییە خولقێنراوەکان لەگەڵ نوێنەرەکانی پارتی و بەڵخییەکاندا دەخاتە بەرچاو.

جێگایٚ سەرسووڕمان و ورینەوەیٚ فراوانە کە داریوش لەگرنگترین و درێژترین تێکستی بەردە نووسراوەکەیدا، واتا نووسراوەکەیٚ بیٚستون، خۆیٚ بە پارسی ناونابات بەڵکو ئەڵیٚ پادشایٚ پارس. تێکستی سەرەوە ڕۆشنی دەکاتەوە کە داریوش پارسی داگیرکردووە نەئەوە کە لەپارسەوە سەری هەڵدابێت. کەوابوو، ئەوەیٚ کە ناوبراو لەدوواییدا لە نووسراوەکەیٚ نەقش ڕۆستەم و شوشدا، خۆدی خۆیٚ بە پارسی کوڕی پارسی و ئاریایی کوڕی ئاریایی دەناسێنی ڕاستییەکی مێژوویی و جۆغرافی و نەژادی نییە، بەڵکو ئاکامی هەبوونی ئەوٚ لە مێژوودایە کە لەوەرزی دوایی ئەم کتێبەدا دەچمەسەر باسەکەیٚ. ٢. لەم کتێبەدا سەیری باسی ئەهورا مەزدا بکەن. لەسەرەوە بۆخوارەوە: ستافی نوێنەرایەتی بەڵخییەکان، ستافی نوێنەرایەتی پارتییەکان، ستافی نوێنەرایەتی ئارياییەکان.

لەسەرەوە بۆخوارەوە : ستافی نوێنەرایەتی بەڵخییەکان ، ستافی نوێنەرایەتی پارتییەکان ، ستافی نوێنەرایەتی ئارییاییەکان .

هەروەها دەتووانین هاوبەشی هەرێمی و ژینگە و تایبەتمەندییەکانی دیکەیٚ ئابووری و کۆمەڵایەتی، لەڕووی بەڵگەنامە ڕاستەکانی هەنوکەییەوە هەڵسەنگێنین نە لەڕووی هەستیاری زمان ناسین یان تێکستەکانی ئاویستا و ریکوداکان و شاهنامەیٚ فیٚردۆسییەوە.

ئەگەر قبوڵی بکەین کە هۆزە بندەستەکانی بەردە نووسراوەکە لەڕووی ناچارییەوە دەبووا باشترین دەسکردی نەتەوەیی و هونەری و فەرهەنگییەکانی خۆیان بە بارگایٚ ئیمپراتوری سەرکەوتوو پێشکەش بکرداێە، ئەو کاتە دەتووانین قوناخی پێشکەوتنی مێژووییٚ هەرکام لەو هۆز و نەتەوانەیٚ سەردەمی دەسەڵاتداری داریوش لە دەروونی جلوبەرگ، چەک، گیانلەبەرانی پێشکەشی و کەرەسە دەسکردەکانی دیکە، باج و سەوقاتەکان، بەئاسانی لەیەک بدەینەوە. بۆنموونە ئەو وێنانە نیشانی ئەدەن کە سکرتییەکان لە جۆلایی و پەروەردەکردنی ئەسپدا بەهرەمەند و ڕواڵەتی هەڵگری پێشکەشییەکان ڕازاوەتربوون. ئەرمەنییەکان لەپەروەردەکردنی ئەسپ و بەرهەمهێنانی دەسکردە یەکجار بەنرخەکاندا بەناوبانگ بوون. سورياییەکان لە ئاژەڵداری و جۆلایی و پیشەسازیدا لە قوناخێکی تەواو پێشکەوتوودا دەژیان. هەروها ستافی نوێنەراێەتی لیدیایی و بابۆلی و سەدی وسکا کڵاوتیژەکان، هێندی و تەنانەت گنداری و خوارەزمی ڕواڵەتی پێشکەوتوویی خۆیان نیشان ئەدەن. بەڵام جلوبەرگ و پێشکەشی سیٚ نوێنەراێەتی پارتی و بەڵخی و ئارياییەکان، ئەوانە وەکو چۆلگەرد و بێبەری لە کشتوکاڵ و ئاژەڵداری و خاوەنی پێشە زۆر سەرەتاییو دوواکەوتووەکاندا ەناسێنیٚ لەمیانەیٚ ئەم سیٚ نوێنەراێەتیە و هەموو ستافەکانی دیکەدا، ئارياییەکان لە نزمترین پلەی کۆمەڵایەتیدا دەژین. جلوبەری ئەوانە جلوبەرگی دانیشتووانی لمزارەکانی دەور و بەری زابۆلە و پێشکەشیەکانیان تەنیا حوشتر و پێستی ئاژەڵی شیرداره و دووکۆچەڵەیٚ گلین کە لە دەسستی ئەوانەداێە، لەگەڵ دەفرە مەتاڵی و نەخشێنراوەکانی نوێنەرانی دیکە لە بەردە نووسراوەکەدا بەرانبەرکی ناکات و ڕواڵەتیان سواڵەتێکی نەنەخشێنراو و سەرەتاییە.

وەها ئارياییەک کە لە زمانی داریوشەوە بۆ مێژوو دێنە ناسین و نواندن، ناتووانن بیانویەکی شیاوین بۆ مێژوو نووسان ساز بکەن کە ئەوانە وەکو ڕەسەنی ئەو نەتەوانە بژمێردرێت کە بناغەیٚ شارستانیەتەکانی هێند، مێزوپۆتاميا، مێسر، یونان و رومیان دارشتووە. بەشی شادی خۆلقێنی ئەم

هەڵسەنگاندنە کاتێ دەس پێدەکات کە داریوش، لە چەن بەردی نووسراوەدا خوێ بەم هۆزانەوە دەلکێنێ:

"من داریوش شاێ مەزن، پادشاێ پادشاهان، پادشاێ وڵاتانێک کە هەمە جورە خەڵکێکی تێدایە پادشاه لەم سەرزەوییە دوور و درێژە، کوڕی ویشتاسپ هخامەنشی، پارسی کوڕی پارسی و ئاریایی کوڕی ئاریایی".

(ازکتیبەی داریوش در نقش رستم، بند۲ و درشوش بند۳)

ڕۆژهەڵاتناسان کە بە مەبەستی تایبەتی خوێیانەوە و بە هەڵە هەرات بۆ سەرزەوی ئاریاکان دەگۆڕن، سەرنجیان نەداوە کە بەمجوڕە دەسەڵاتدار بۆ نزمترین باجدەری خوێن دەگۆڕن و وورد نابنەوە کە بەمجوڕە دەسەڵاتدار ناتووانێ"پارسی کوڕی پارسی و"لەهەمان کاتدا"ئاریایی کوڕی ئاریایی"بێت!؟ بەمجوڕە گەڕان بەدوواێ بناغەێ هێندوئوروپی، هێندوئێرانی و هێندوژرمەنی وەکو گەڕان بەدوواێ درزییەکی درومان لە کادانێکدایە. ڕاشکاوانە دیارە کە زۆربەێ نەقشەڕێژ و لایەنگرانی ئەم ڕوانگەیە پەرە بە ئارەزووە نەتەوەییەکانیان ئەدەن وبەرەتکردنی هەوڵی گشتی مرۆڤایەتی دژی ڕەگەزپەرەستی، لە بیری ڕفاندنی کڵاوێکی نوێتر بۆ سنووری جوغرافیایی و خەڵکی خوێی، لە لەبادەێ ئاریاییە نەناسراوەکانن، چوونکە هەر ئەم نەناسراویەیە کە هەرجوڕە فشە و خوهەڵکێشانێک لەبارەێ ئاریاییەکان و شارستانیەتە گەشەکردووەکەیاندا شاردووەتەوە و مێژوو، بەتایبەت مێژووی ڕوژهەڵاتی ناوڕاستیان تووشی سەرلێشێواوی و لە ناوەڕوکەکەێ بەتال کردووەتەوە. بەڵام بەڵگەنامە مرۆڤناسیەکانی پێش لەمێژوو بەڕوشنی ئەیژن کە زۆرینەێ شارستانیەت و بازێرەکانی دەور و بەری هەزارەێ دووەمی پێش زاینی، کەلە چینەوە تا ناوەندی ئامریکا هەڵکەوتوون ، لە سەدان هەزار ساڵ پێشەوە شوێنی نیشتەجێبوونی مرۆڤی نێئاندرتال و کرومانیون بوون. لەم دۆخەدا و بە زانیارییە هەنووکەییەکانەوە، ساکارترین پرسیار ئەمەیە : " کۆبوونەوەێ خەڵکە ڕەسەنە سەرەتاییەکان کە بەدرێژایی هەزاران سەدە لەبارودۆخێکی ناحەزی جوغرافیاییدا ژیاون، بۆچی ئەبێ بو گەشەکردن چاوەڕوانی کوچبەرانی ئیستێپەکانی ناوڕاستی روسیا بن کە هیچ ئەزموونێکی ژیانیان پێ‌نی‌یە، ئیلا توندوتیژی و خوێنڕشتن نەبێ"؟ پرسیارێک کە بێگومان گریمانەێ مێژوویی نیشتەجێبوونی شارستانیەت لەسەر تەورەێ کوچبەر

بوونی هۆزی ئاریایی و بەگشتی کۆچبەربوون بەتاڵ ئەبێتەوە(١).

بێگومان دەتووانرێت بۆبابەتی کۆچبەربوون و هەوڵی مرۆڤ بۆ بڵاوبوونەوەیْ شارستانیەت، دەلاقەگەلی تازەتر بکرێتەوە. هێشتا نازانین بۆچی ئەبێ ڕێگای کوچبەربوونە شارستانیەت خوڵقێنەرەکان لەباکوورەوە هەڵبژێرین و بۆچی باکوور دەتووانێ ناوەندی کۆبوونەوەیْ سەرەکی مرۆڤ بێت و لەئاو وهەوایْ دژواری باکووردا کە پیت و بەرەکەتی زەوی لە نزمترین ئاست و پەروەردە کردنی بەربڵاوی ئاژەڵ و کشتوکاڵ بەرتەسک و سنووردارە، و بەبۆنەیْ کەڵکوەرگرتنی هەمیشەیی لەگۆشت، وەکو تەنیا سەرچاوەی خواردن، بازنەیْ سۆرشتیی زاوزێ هێمن دەبێتەوە، ولەبارودۆخی لەدایکبوونی هەر شارستانییەتێکی کۆرپەدا گەشەناکات، کۆمەڵە پرژمارە خاوەن شارستانییەت و تەنانەت بێبەری لەشارستانییەتیش بە چ شێوەیەک مەیسور ئەبێت؟ سەرنجێک بەنەقشەی جۆغرافیای زەوی و گەڕیان بەدووای کۆنترین شارستانیەتەکان و ناوەندی کۆبوونەوەی مرۆڤدا، کە نزیکەی سەدان سەدە پێش زاینیەوە دەستیان پێکردووە، ئێمە لەڕچە و شەقامی ڕاستەقینە و لایەنی بزاوی شارستانیەتی مرۆڤ ئاگادار دەکات.

ئەم شەقامە کە باریکەڕێگایەک لە١٠ تا٣٥ پلەیْ جۆغرافیایی پانتایی باکوور دادەپۆشێ، بەجوانی ئاشکرایْ دەکات کە مرۆڤ لە کۆنترین ڕۆژەکانی مێژووەوە باشترین شوێنی مامناوەندی جۆغرافیایی بۆ نیشتەجێبوون لەم شوێنانە دۆزیوەتەوە و لە هەر قەیرانێک وەکو ڕووداوە سورشتییەکان، قاتوقڕی و یا تەنانەت خولیای گەڕیان بەدووایْ ناوچەیەکی پڕسوودتردا، لە نیشتەجێ بوون لە پانتاییە جۆغرافییە زۆر گەرم و زۆر سەردەکان خۆیان لاداوە و ڕێگایان لە پراوێزێکی مامناوەندی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوادا بۆ نیشتەجێ بوون دۆزیوەتەوە.

١ـ ئەوانە کە شارستانیەتی مرۆڤ لەهێندەوە تا ئورووپا بەئاریاییەکانەوە گرێئەدەن، خۆزگە تووانابیان بووایە کە شارستانیەتە دێرینەکانی وەکو چینیان ڕۆشن بکردایەتەوە کە بەبێ یارمەتی ئاریاییە تایبەتەکان جێهانی دێرینەیێنەیان بەهونەر و فەلسەفە و دەسمایە پیشەسازییەکانیان خستە ژێردەسەڵاتی خۆیان لەبەشی کۆتایی ئەم کتێبەدا ئاماژە دەکەم بەڕاسترین واتای وشەیْ ئاریایی و هەروها شوێنی سەرهەڵدانی ئەم وشەیە. تایبەتکردنی بەشی کۆتایی کتێبەکە بۆشیکردنەوەی وشەیْ ناوبراو کە بە ناحەق لایەنی نەژادیەکەی خراوەتە پێش‌چاو، لەبەر ئەوەیە کە بەشی زۆری ئەم بابەتە لە کوتایی کتێبەکەدا نووسراوە کە بیستن و ئاگاداری لەوانە پیویستە.

دۆزراوەکانی دێرینەناسی نیشانی ئەدەن کە مرۆڤ بەجیاوازی و تایبەتمەندییەکانیەوە لە زۆرناوەندی ئەم پراوێەدا هەبوونی ناوچەیی و سۆرشتی و دێرینەیان بووە و بەهۆیْ گەشەکردنی ژمارە و هۆکارەکانی دیکە لە دڵی ئەم پراوێزەدا بەدووایْ ناوەندی سوودمەندتر و تازەدا گەڕاون و بۆئەو شوێنانە کۆچبەر بوون . لایەنی ڕاستەخۆیْ ئەم جێبەجێ بوونە بەڕۆشنی نیشانی ئەدات کە گروپە کۆچبەرەکان لانی کەمی سۆرشتی هەرێمەکەیان ناسیوە و بەڕادەی پێویست ئاگاداری هەتاو و ئاستی باران وەرزەکانی ساڵ و بەدەس خستنی سەرچاوەکانی خواردن و ڕێگایْ جموجوڵی ئاسان و ڕووباری شیاوی ماسی گرتن و بەلەمەوانی و لەوەڕگەیْ بەربڵاو و پڕنەچیر و شایستەی پەروەردەکردنی ئەسپ و ڕەوک و سەرچاوەکانی ئاو بۆ کشتوکاڵ بوون . بەوجۆرەیە کە هەموو ناوەندەکانی شارستانیەتی دێرینە لە بەنرخترین شاڕێگایْ جۆغرافیاییدا هەڵکەوتبوو کە پانتاییەکەیْ ٢٥ پلە بوو . شارستانیەکۆنەکانی باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا ، شارستانیەتی مەزنی هێند ، شارستانیەتی دێرینی چین ، شارستانیەتی باکتریا ، شارستانیەتی سەغدیەکان ، شارستانیەتی سکاکان ، بەرزاییەکانی ئێران : پارتەکان ، هیرکانیەکان ، زابوڵیەکان ، سیستانیەکان ، بەلوچەکان ، ڕەخجییەکان ، شارستانیەتەکانی کرمان ، مۆکران ، ئانشان ، شوش ، ئیلام ، کادوسیەکان ، مارلیک ، ماردین ، کاسپین ، سیەلک ، لۆرستان ، مێدیاکان ، ئورارتوەکان وئەوکاتە شارستانیەتی یەکجار درۆشاوەیْ مێزوپۆتامیا ، بابۆل ، ئەکەد ، ئاشور ، سومەر و ئور ، شارستانیەتی ئەرمەنەکان لیدیاییەکان ، فریجیە ، کاپادوکیە ، شارستانیەتی میسر ، یونان ، ڕۆم ، ئەتروسک و ئیبری ، شارستانیەتەکانی باکووری ئافریقا ، کارتاژەکان ، ئسپارت ، بەربەرەکان و تەنانەت شارستانیەتی سەرسووڕهێنەری ئازتەکەکان ، ئینکاکان ، ومایاکان لە ناوەندی ئامریکا ، کە کۆیْ شارستانیەتە ناسراوەکانی جیهان پێکدەهێنن ، هەموویان ئەم شاڕێگا دێرینە تێپەر دەکەن کە هەمیشە باشترین جۆغرافیای جیهانی پێکهێناوە . لەبەر ئەوە کە شوێنەواری زۆر و پەرژوبڵاوی ژینگە سەرەتاییەکانی مرۆڤی نیئاندرتاڵیش لەم پراوێزە ، واتا : لەجاوە ، باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا ، چین ، دەوروبەری دەریاچەیْ ئورال ، بێهشەهر ، ڕۆژئاوایْ دەریاچەیْ ئورومیە ، مێزوپۆتامیا ، فلستین ، باشووری

تورکیه ، باکووری ئافریقا ، باڵکان ، سیسیل ، ئیتالیا ، یونان ، پۆڵەندا ، نەمسە ، ناوەندانی زور لە ئاڵمانیا و ناوەند و باشووری فرانسە ، و هەروها ئیسپانیا و پۆرتەقال هەڵکەوتووە ، بە جوانی ئاشکرا دەبیٚ کە لە سەردەمی زۆرکۆنەوە مرۆڤ لەو ئاستەیٚ لە زانست و لێکدانەوەدا ژیاوە ، کە لە سەر ئەم هێڵە مامناوەندیەدا کۆ بوونەتەوە و بەم جۆرە تیۆری کۆچبەربوونە سەرەتاییەکان لە پانتایی سەرەوەیٚ جەمسەری باکوورەوە بۆهێڵی کۆنی شارستانیەت ، بێبەری لە بناغەیەکی ژیرمەندانەیە . چوونکە هەموو کۆبوونەکانی دەروونی ئەم هێڵە لەسەرپیٚی خۆیان دەژین و بۆ بڵاوبوونەوە ، بەو شێوە کە باوە ، پێویستیان بە هیچ جۆرە کۆچبەربوونێک نییە . لەلایەکی دیکەوە هەرێمی باکوور لە ئامادەیی پەروەردەکردنی گرووپی گەورەی مرۆڤ و دەرفەتی بەرهەمهێنان و شارستانیەت بێبەرییە .

ئەگەر رچەیٚ شارستانیەت لەرۆژهەڵاتەوە بۆ رۆژئاوا ، لەرۆژئاواوە بۆ رۆژهەڵات یا لە خاڵێکەوە بو هەردوو لایەن کەوتبێتە گەڕ ، بناغەی باسەکە ناخاتە ژێرپرسیار و ئەگەرلەم هێڵە تارادەیەک بەربڵاوە و بە پیت و پێزەدا ، زمان ، داب‌ونە ریت ، ئایین ، ئامرازی بەرهەمهێنان و هونەر و فەرهەنگ ، بە ساکاری دەس بەدەس بوویٚ ، بۆ سەلماندنی پێداویستی بە هیچ بیانوو و نیشانەیەکی تایبەت نییە . بێگومان کاتی ساوایی مرۆڤ کە هێشتا زمانی دیاریکراوی هۆزەکان فەرهەنگێکی سەقامگیری دۆرست نەکردبووە و هەموو ئەو وشانە کە بەکاردەبرا ، ژمارەیان لەچەن سەدی تێپەڕی نەدەکرد ، تێکڵاوی ساکاری ئینسانی ، ئابووری و جۆغرافیش دەیتووانی هاووێنەیی ریشەی وشەکان لەناو خەڵکانێکدا پێک بهێنیٚ کە بە گشتی لەلایەنی نەژادی و شوێنی سەرهەڵدانیانەوە جیاواز بوون ، شوێنی دادەنا . هەوڵی زمانناسان بۆ کۆچبەربوون لەرێگایٚ هاوبەشی کۆمەڵێک وشەوە ، تائیستا توانیوە تەنیا ببی بەهۆیٚ سەرلێشێواوی .

بەمجۆرە داهێنانی سنووورداری هەندیٚ وشە وەکو"هێند و ئێرانی" و ئیشارە بە هۆزێکی نەناسراو وەکو ئارییایەکان و سەلماندنی ناوەندێکی یەکگرتوو بۆ بڵاوکردنەوەیٚ شارستانیەت لە رێگایٚ زمانناسی و دۆزینەوەیٚ پەیوەندی نێوان ریشەیٚ وشەکان ، لە وەها قوناخێکی بەربڵاو لە بزاوی مێژوودا ، زۆرمناڵانە ، کاڵوکرچ ودەسکرد دەنوێنێت . چوونکە لانی کەمی دەمەوبەیانی ئەم

جیّبەجیّ بوونە بۆ دەورووبەری ٦٠٠٠ساڵ پێش دەگەڕێتەوە ولەو سەردەمەدا هیچ چوارچێوە و سنوورێکی جوّغرافي و نەتەوەیی یا نەژادی بەرچاو ناکەوێت و چ بەربەستێک دژی ڕەوتی ئازادانە لەم شاڕێکەدا نابینرێت . چوونکە نزم بوونی ئاستی حەشیمەت و بەربڵاوی زۆری ژینگەکان نەیتووانیوە سنوور و بەربەند لە نێوان فەرهەنگ ، زمان و داب‌ونەریتەکاندا پێکبهێنێ ، و دانانی وەهاسنووور و بەربەندێکیش پێویست نەبووە . بەشێوەیەک کە دیمەنی مێژووی جیهانی دێرینە نیشانی ئەدات لەبەشێکی گرنگی ئەم کاتە دوور و درێژەدا ، واتا لە١٥٠٠ ساڵ پێش زایینیەوە هەموو بوارەکانی ئەم جیّبەجیّ بوونە بەبۆنەیّ بەربڵاوی گۆڕەپانەکەوە ، گشت جموجووڵەکان لە دۆخێکی ئاشتیخوازانەدا ئەنجام بووە . پاشتر و هاوکات لەگەل پێشبەچوون و ئامادە بوونی ژینگەیّ باشتر و گەشەکردنی شینایی و نیشتەجێکردنی هەمیشەییان ، نیازە کۆمەڵایەتییەکان ، پێداویست بەرێوەبەری نەتەوەیی ، پێکهاتنی بنەماڵە ، سەرهەڵدانی خاوەندایەتی ، ئایین و داب و نەریتی هاوەدەق لەگەڵ هەرێمێکی دیاریکراودا ، پێویستی دابینکردنی سنوور هەست پێکراوە و لە وانەیە سنوورەکان بە چۆڵایی بەربڵاو ، زنجیرە چیای تووش و سەرکەش ، رووباری بیّبوار ، ئۆقیانووس ، دەریا ، دەریاچە دارستان و ئەشکەوت و شیو و دوڵە قووڵەکان دیاری کرابێت .

لە قۆناخەکانی دوواییدا دیسان بەهۆیّ زۆتر بوونی حەشیمەت و کەرەسەی گواستنەوە ، پێشکەوتنی ئابووری و ڕامیاری گەڕان بەدووای ساماندا ، هێڵی شارستانیەت بۆدوولایەنی باکووڕ و باشوور تەشەنەیّ کرد و بۆ ٥ پلەی پانتایی جوّغرافیایی پەرەیّ سەند و کۆمەڵانی ئینسانی لەپراوێزی سەرەکی هێڵی شارستانیەتدا سەریان هەڵدا . لەم پانتاییە نوێەدا بەشی باکووڕی ئەندونیزیا ، ڤیتنام ، کامبوج ، میانمار ، مالزی ، سری لانکا ، سودان ، سومالی ، ئیتیوپی ، و دوواییی وەنزوئلا ، کۆلمبیا ، و باکووڕی پروی کۆن هیدی هیدی هاتنە نێو هێڵی شارستانیەتی دێرین . ئەم شارستانیەتە پراوێزییە لەباکووڕدا لەگروپەسووورپێستەکانی ئامریکای باکووڕ و هەرێمێکی بەربڵاوتر لە ناوەند و باکووری ئوروپا ، سیتەکان ، سکاکان ، ماساژتەکان ، و هی‌تر پێک دێت کە بە هۆیّ دۆخی جوغرافیەوە تاکاتی هێرشی هۆزەباکووڕییەکان ئەوەندە شیاوی گەشەکردن

پراوێزی تۆقینەر (جوگرافیای بێ بەرهەم) ڕێگای کۆچبەربوون لە باکوورەوە بۆ باشوور

پراوێزی شارستانییەت جوگرافیای بەبەرهەم و نیوبەرهەم) جێبەجێبوون، لەڕۆژهەڵاتەوە بۆ ڕۆژئاوا و شارستانییەت ساز

پراوێزی هاوەدەق (جوگرافیای ئاڵۆز) نیشتەجێ و نەگۆڕ وبێبەری لەگەشەی ئابووری و کۆمەڵایەتی

**١ ـ پراوێزی شارستانییەت** : ئەم پراوێزە کە مامناوەنیتین و بەپیزترین غوغرافیای جیهان دەگرێتەبەر، لەدەسپێکیدا، شوێنی سەرەکی کۆبوونەوەی مرۆڤ بووە، هەموو شارستانییەتەکانی جیهان لەم شوێنەوە سەریان هەڵداوە. لەسەردەمانی دێرینەدا هیچ خاڵێکی جوگرافیای دیکە توانایی پەروەردەکردنی ژمارەیک مرۆڤی نەبووە کە دانیشتووانی کۆبووەوەکەی بۆ نێو ئەم پراوێزە کۆچبەر بکات. هەموو ڕووداوە مێژووییەکان، گواستنەوەی فەرهەنگی و پێشکەوتنە مادییەکان لەم پراوێزەدا، لەسەر بنچینەی تایبەتمەندیی ناوچەیی ڕاوەستاوە و ڕێچکەی بڵاوبوونەوەی هەریمی و جموجووڵی ئابووری و فەرهەنگی لەم پراوێزەدا، لەڕۆژهەڵاتەوە بۆ ڕۆژئاوا و شارستانییەت خولقێن بووە.

**٢ ـ پراوێزی تۆقێنەر** : گروپ و کۆمەڵە کەم ژمارەکانی مرۆڤ لەم پراوێزەدا، بەهۆی بێبەرهەمی و نەزۆکی ناوچەکەوە، لەکەمژمارەترین کۆمەڵەشدا پێویستیان بە کۆچبەربوون هەبووە. یەکەمین کۆچبەرانی مرۆڤیی ناوەندی ئەم پراوێزە، بەمەبەستی پشکنین و بەدوواگەڕانی بارودۆخی ژیان دەستی پێکردووە. دانیشتووانی کەمی ئەم پراوێزە بەهۆی خووگرتن بە زەبروزەنگی سۆرشتە ئاڵۆزەکەیەوە، خاوەنی ڕۆحییەتێکی شەڕاشۆ و لەشێکی بەهێز بوون. لەم پراوێزەدا لەگەڵ فەرهەنگێکی قەبارەدار و خاوەن ناسنامەدا ڕووبەڕوو نابینەوە. تەنیا ڕێچکەی کۆچبەربوونی هۆزە نیشتەجێیەکانی ئەم پراوێزە ، باکووریی، باشووریی و دیاردە تایبەتیەکانی داگیرکەریی و کاولکاری، لەوانە، بۆسەرئێران ئێران بووە.

**٣ ـ پراوێزی هاوەدەق** : لەم پراوێزەدا کۆنترین کۆمەڵی مرۆڤیی، لەوانە پادەشتە ڕوژهەڵاتییەکانی ئافریقا پێکهاتووە و هەرچەندە کە ڕێژەی پانتاییە جوگرافییەکەی، لەگەڵ پانتایی پراوێزی باکووردا بەرانبەرە، بەڵام بەهۆی چەند بۆنەیەکەوە گەشەکردنی ئابووری و کۆمەڵایەتی تێدایا ڕاوەستاوە. یەکەم بەهۆی دابڕانی جوگرافیایی نێوان ئوسترالیا و ئافریقا و ئامریکای باشوورەوە، کە پەیوەندی نێوان ناوەندی کۆبوونەوە و گواستنەوەی سەرچاوەکانی ژیانی لەڕوانگەی تێکنیکییەوە بۆ بارێکی دژوار و نەکراو گۆڕیووە. دووەم لایەنی ڕاستەخۆتری تیشکی هەتاو، کە ئاکامی لادانی تەوەرەی زەوین و پانتایی جوگرافیاییە و هەل و مەرجی ئاو و هەوایی دوورتری پشتوێنەی زەوین لەنێوەی باشووریدا وەکو پشتوێنەکە گەرم ڕادەگرێت. و لەکۆتاییدا ئاڵوگۆڕی کتووپڕی ئاو و هەوا، گەشەگردنی مشەخوارانەی گیا و ڕووەک، کۆبوونەوەی لەڕادەبەدەری گروپە جۆربەجۆرەکانی گیانلەبەران لە کۆمەڵی چەن هەزار سەریدا، باران و ڕێژنەی درێژخایەن یان کورتماوەی وەرزیی کە بەگشتی لەمپەڕێکە بەرانبەر بەسوود وەرگرتن لەزەوین پێکدەهێنی، هەبوونی ڕووبارگەلی فراوان و پڕئاو وەکو ئامازۆن کەڕووبەرێکی بەربڵاو لەزەوین دەکات بەزۆنگاو و چەن هۆکاری دیکە، کۆمەڵانی دانیشتووی نێوان ئەم پراوێزەی ناچارکردووە کەخۆیان لەگەل مەرجەکانی سۆرشتدا ڕێکەبخەن و بۆ گۆڕانی ئەوانە هەوڵ نەدەن و دیسان لەرووی ناچاریەوە، تەنیا لەچەن ...

این نقشه، که برگرفته از ص ۲۳ متن انگلیسی کتاب «پیش از تاریخ»، مجموع مقالاتی به ویراستاری ژان گلین است، نشان می‌دهد که انسان، از پنج میلیون سال پیش، جغرافیای معتدل را برای زیست برگزیده است و بالاتر از مدار ۴۰ درجه‌ی عرض شمالی، هرگز خاستگاه عمده‌ی انسان نبوده است.

این دو نقشه، که از صفحات ۱۷ و ۲۶ جلد اول کتاب اطلس تاریخی جهان، اثر کالین مک ایودی برداشته‌ام، نشان می‌دهد که شهرهای بزرگ از سه هزاره پیش از میلاد، تا ظهور مسیح، در آسیا و اروپا، در ادامه‌ی رشد همان زیستگاه‌های اولیه‌ی نخستین انسان‌ها برآمده است. در نقشه می‌بینیم که در بالاتر از مدار ۴۰ درجه‌ی عرض شمالی که بقایای انسان کهن یافت نشده، تا دوران اخیر هنوز شهری هم ظهور نکرده بود. اگر در ایران مراکز تجمع انسان کهن علامت نخورده، به سبب فقدان کوشش جدی و لازم برای جست‌وجوی چنین مراکزی بوده است، همچنان که به دو مرکز در بهشهر و غرب دریاچه‌ی ارومیه نیز به تصادف برخورده‌ایم. اما کوشش اروپاییان در آن قاره نشان می‌دهد که تقریباً هر شهر بزرگ امروز در اروپا، با خود نشانه‌ای از زیستگاه انسان از ۵۰۰ قرن پیش دارد.

× آثار استخوانبندی انسان نئاندرتال
۵۰۰۰۰ ق.م.
جاده ابریشم به چین
بلخ
مرو
عاج
ادویه
(دامغان) صددروازه
ری
هاترا
اصفهان
استخر
داربگرد
سلوکید
ارک
پالمیر
اسکندریه
طلا
عاج
صمغ
۲۳۰ م.

نی‌یە . نابێ لەبیرمان بچێتەوە کە گۆڕینی ژیانی سۆرشتی هەرکام لەم هۆزانە و کۆبوونەوەیان وەکو هەبوونێکی مێژوویی، پێداویستی بە هەوڵ و خەباتی بێوچانی وەچەکانی دووایی بوو کە بەدرێژایی هەزاران ساڵ و پێداویستی بە خوڵقاندنی بەرهەم و کەرەسەیَ مادی دەسکردی دانیشتووانی هەر ناوچەیەکەوە بووە .

من پێدادەگرم و بەبیری دێنمەوە ، هەربەو جۆرە کە شارستانیەتە هەرە کۆنەکانی چین و هیندوستان لە پێکهێنان وگەشەی شارستانیەتی باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیادا شوێنەوارێکی حاشاهەڵنەگری لەم سەردەمەدا هەیە و بەراستی شارستانیەتی تازەیَ باشووری ئاسیا پێکهاتەیەک لە شارستانیەتی چین و هێند دەژمێردرێت ، هەر بەوجورە شارستانیەتی بەرچاوی ناوەندی ئاسیاش بەرهەمی بڵاو بوونەوە و گەشەکردوویی پیشەسازی و فەرهەنگی و ئابووری ئێران لەلایەن باشوور و چین لەلایەن ڕۆژهەڵات ، لەسەردەمەکانی پێش لەهخامەنشیەکان بووە . بێگومان ناوەندی ئاسیاش وەکو بەشەکانی دیکەی هێڵە شارستانیەتەکە ، لەم کاتەدا لەشارستانیەتی ناوچەیی بێبەری نەبووە ، بەڵام سەرهەڵدانی مێژوویی و لەپڕ و دروشاوەیَ سیتەکان و سکاکان ، بەدڵنیاییەوە بەرهەمی کاریگەری فەرهە نگەکانی باکووری ئێران و ڕۆژئاوایَ چین لەسەر دانیشتووانی ناوچەکە بووە کە خاوەنی شارستانیەتێکی ڕاوەستاو بوون و بەئاسانی ڕەنگ و شوێنەواری ئەوشارستانیەتە لەسەرشێوەیَ پیشەسازی ، بەرهەم ، نەقشە هونەرییەکان ، نێوە خێڵەکییەکان و هەرێمە هاوبەشەکان دەبینین . هەرچەن ژمارەیەک لە زانایان و پشکێنەران بۆدابین کردنی ناسنامەیَ خێڵە چەن جۆرەکانی ناوەندی ئاسیا لەلایەن نەژاد و ڕەسەنەوە ، هەوڵێکی شێتگیرانەیان دەس پێکرد ، بەڵام هێشتا لەم بارەوە ڕوانگەکانیان یەکانگیر نەبووە . هەندێ جاریش ئەو ناوە چەن جۆرانە کە نووسەرە پێشووەکان نووسیویانە ، لەوانەیە کە ببێتە هۆیَ ناسینی گروپێکی تایبەت یان چەن گروپێکی پەیوەندی دار لەگەڵ یەکدا . دەربارەیَ ئەم خێڵانەوە پشکێنەرانی ڕۆژهەڵاتی و ڕۆژئاوایی زۆرباسیان خستووتە بەردەس کە زۆربەیَ ئەوانە ناوەرۆکێکی پێشەکییانەیان هەیە و کۆتاییان پێنهاتووە . کەوابوو دەربارەیَ سیتەکان ، سکاکان ، روسونەکان ، ماساژتەکان ، یوچییەکان ، هسیونگنوهاکان هونەکان و هی دیکە ، هێشتا دوودڵی هەیە . . . هەڵسەنگاندنی هونەری ئەم هۆزانە لە لایەنی جۆربەجۆری مێژوویی و لەچەرخێکی دوور و درێژی زەمەنییەوە ، لەهەبوونی ناکۆکی و دژبەری لە سەرچاوەیَ ناسنامەیَ "ئێرانی" و "ئاسیای ناوەندی" ئەو هۆزانە کەم دەکاتەوە . هۆزە چیانشینەکان کە لە هەرێمێکی بەربڵاو لە

سنووریّ لەنێوان چین و ئوروپا و ڕۆژهەڵاتی ناوڕاستدا هاتوچۆیان کردووە، دەسمایەی فەرهەنگی زۆریان دەسکەوتبوو کە خۆدی ئەوانە لەنێو دانیشتووانی هاوێنە و لە هەرێمێکی پان و بەریندا بڵاویان کردبووەوە.
(گرگوار فرامکین، باستان شناسی درآسیای مرکزی، ل٢٩ و ٣٠)

ووردبوونەوەیەکی نوێ، بیرکردنەوە لە گواستنەوەی شارستانیەت لە کەنارەکانی ڕۆژهەڵات و باکووری دەریای خەزەر و ئاسیای ناوین بۆباشوور، یەکجار بێ‌نرخ و خەیاڵی"ئاریا مەنشی" پووچەڵ دەکاتەوە. ئیستا ئیترناچارین کە بەدوای بناغەیْ ڕاستەقینە و ناوچەیی شارستانیەت لەجیهانی دێرینە و ئێرانی کۆندا بگەڕین.

بەدرێژایی سەدەی نۆزدە و دەسپێکی سەدەیْ بیستەمدا باوەڕی گشتی دەربارەیْ پێکهاتەیْ کۆمەڵایەتە و فەرهەنگی یونانی زمانەکانی سەرەتایی بەم گریمانەوە دەستی پێدەکرد کە هێند و ئورووپە نەژاد جیاواز و ڕەسەنەکان لە سوارکارە ئارییەکان هێرشیان کردە سەر باشووری ئوروپا و جیاوازی وڕەسەنییەتی نەژاد و زمان و داب‌ونەریتەکەیان بەسەر دانیشتووانە ناوچەیی و لاواز و ئاشتیخوازەکاندا داسەپاند. ئەم جۆری گریمانانە تەنیا بەرهەمی باوەڕی دمارگرژانەی"ئوروپا مەنشانە"**ولە حاڵەتی ئیستادا هیچ پشکێنەرێک، تەنانەت بەشێک لەم ئەفسانە ئارییاییە کە لەدووایدا زەمینە سازکەری تاوانە دژی مرۆڤایەتییەکانی فاشیست و نازییەکان بوو، ناپەرژێنێت.** (سارا پومری و دیگران، یونان باستان، تاریخ فهرهەنگی، اجتماعی و سیاسی، ل ١٠ سال ١٩٩٩ ازانتشارات دانشگاه اکسفورد، متن اصلی)

تەنیا لەسنووری هەزارەیْ یەکەمی پێش زایینی‌دا، کاتی کە ناسنامەی نەتەوەیْ، یەکیتی و ئیمپراتور-ییەکان لە پانتاییە جۆغرافیە جۆربەجۆرەکانی هێڵی شارستانیەتدا ئاشکرا و سەقامگیر دەبێت و مێژوو دەتووانی لە شارستانیەتی ڕۆژهەڵاتی دوور، شارستانیەتی باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا، شارستانیەتی چین، شارستانیەتی هێند، شارستانیەتی ئێرانی کۆن، شارستانیەتی مێزوپۆتامیا، شارستانیەتی میسر، شارستانیەتی یونان، و شارستانیەتی ناوەند و باشووری ئوروپاوە نموونەیْ بەرچاو نیشان بدات و هاوکات کۆبوونەوەیْ مرۆڤ لە لایەنی باکووری بازنەیْ ٤٠ پلەی جۆغرافیاییدا ڕووبەڕوو دەبینەوە. لەوانەیە لەهەمان کاتدا کە مرۆڤ لەباشووری بازنەیْ ٣٥ پلەیْ باکووریدا، بەکەڵک وەرگرتن لە بارودۆخی شیاوی هەرێمی و یاساکانی ئاشتیخوازی، لە هەوڵێکی ٢٠٠٠ ساڵە توانیبێتیان نیشتەجی بن و گرنگترین بریاری ئابووری، بەڕێوەبەری و فەرهەنگ، لەڕێژەیْ

پێداویستی نەتەوەیی ـ هەرێمیدا ، تارادەیێ گەیشتن بە پێنی نووسین ، یاسا و هونەر د. ربرییێت و دانیشتووانی بازنەیێ باکووری ٤٥ پلە تەنیا لەرادەیێ ژمارەدا بەزۆرینەیەکی ڕێژەیی گەیشتبێتن و بە هۆی ڕژدی سۆرشتەوە ، بۆدابین کردنی پێداویستییەکانی ژیان ڕوو بە بازنەیێ جوگرافی باشوور ناچار بەدەرباز بوون بوون . کۆبوونەوەیێ لەم جۆرە زۆرجار هەلبژاردنی ژینگەکەیانی بە ململانێ بەردەوام لەگەلێ سۆرشتدا ڕووبەڕوو دەکردەوە بەرادەیەک کە ئەوانە هەندێجار ناچار دەبوون خواردنی ڕۆژانەیان لە دەم پەلەوەر و گیان لەبەرە چیاییەکان بستێنێنەوە . ئەمانە بە هیچ جۆرە نموونەیەک لە شارستانیەت نەگەیشتبوون ، ئیلا لە تۆند و تیژی و تۆقاندندا نەبێ ، بەهرەیەکی دیکەیان نییە .
لە سەدە سەرەتاییەکانی هەزارەیێ یەکەمی پێش زاینیدا ، دانیشتووانی لایێ سەروی بازنەی ٤٠ پلەی جۆغرافیێ باکووری ، واتا دانیشتووانی "پلەیێ تۆقاندن" کۆچبەربوون بۆ باشوور دەس پیێدەکەن . هەمووی ئەوکۆچبەربوونانە دژی شارستانیەت و کاولکەر بوون و هەموو ئەو کۆچبەرانە بۆداگیرکردنی هەبوونی پانتاییەکانی باشوور ، نزیکەیێ هەزارسالێ بە تۆند و تیژترین شێوەی تۆقاندنی سۆرشتی هەستاون . تێروانینێک بە شوێنەوارە ناسراوەکانی هێرشی ڤیکینگەکان ، فرانگەکان ، گلەکان ، هانسەکان ، توتونەکان ، هونەکان ، هێرش بەرانی ئیسلاڤ ، ئیستێپەکانی باکوور ، بوڵغارەکان ، تورکەکان ، تاتارەکان ، مەغولەکان ، کە گشتەکەیان لە لایێ سەروی بازنەیێ باکووری ٤٠ پلەیێ جوگرافییەوە سەریان هەڵداوە بەجوانی نیشانی ئەدەن کە کۆچبەرانی باکوور نە تەنیا نەیانتووانیووە ببن بە هۆیێ سەرهەڵدانی شارستانیەتی "هیند و ئێران" و "هیند و ئوروپا" بەڵکو بەپێچەوانەوە ، هێرشی ئەوانە بوو بە هۆیێ ڕاوەستانی گەشەکردنی سۆرشت و دەوڵەمەندی شارستانیەتی باشوور . یەکی لە سەغلەتترین ، بێسنوورترین ، خوێنینترین ، و نێگاتیڤترین شوێنەواری ئەم هێرشە لە سەر شارستانیەتەکانی ئێران و مێزوپۆتامیا دانا و سێبەری کردەوە کاولکارییەکانی هۆزە باکوورییەکان بە درێژایی ١٢٠٠ سالێ ، لە دەسپێکی هخامەنشییەکان تا کۆتایی ساسانییەکان هەردوو هەرێمەکەیێ داپۆشی و بوو بەهۆیێ فەوتاندنی گەشەیێ ئابووری ، بەڕێوەبەری کۆمەڵایەتی و فەرهەنگ و هونەری ناوچەیی .

سێهەمین پراوێزی کۆبوونەوی مرۆڤ لەپانتایی ١٠ تا ٣٥ پلەی باشووری جوگرافیدایە . هەرچەن کونترین نیشانەکانی هەبوونی مرۆڤ لەپراوێزی ڕۆژهەڵاتی ئافریقا ، پراوێزی ڕۆژئاوا و باکووری ئامریکای باشوورو هەروها لە پراوێزی ئۆسترالیادا ماوەتەوە ، بەڵام بەبۆنەی لەیەک پچرانی گەورەی ئوسترالیا ، ئافریقا و ئامریکای باشوور ، لەژێر کاریگەری بارودۆخی جوگرافی تایبەت بە پانتایی باشوورو لادانی تەوەرەی زەوی و قوژنی نێوان زەوی و تیشکی هەتاو و هۆکاری جوغرافی نابەجی ، دانیشتووانی ڕەسەنی ئەم ناوچانە لەگەشەسەندنی هاوسەنگ و هەمیشەیی بەجیماون . ئەوخەڵکانە لە بریتی هەوڵدان بۆ سازکردنی بەرێوەبەری بەرهەم هێنان و سازەئابووری و کۆمەڵایەتییەکان ناچاربوون کە لەگەل کێشە سۆرشتییکان ، لەئۆسترالیا ، ئافریقای ناوەند و ئامازوندا دەسبەیەخە و ململانی و بری جاریش سازشت بکەن . هەموو ئەم نیشانە سۆرشتیانە لەهەڵسەنگاندنێکی کۆتاییدا ئێمە بەم ئاکامانەی خوارەوە دەگەیەنێت .

ئەلف: مرۆڤ لە مێژەوە دەسەڵاتی هەڵبژاردنی هەرێمی باشتری بۆ نیشتەجێبوون بووە و شوینە زۆر گەرم و ساردەکانی بۆ ئەم مەبەست هەڵنەبژاردووە . چوونکە لەجوگرافیای نەشیاودا گەشەکردن بەدی نایەت .

ب: زۆرترین کۆمەڵی مرۆڤ لە بازنەی شارستانییەتدا یەکیان گرتووە ، هەموو شارستانیەتە ناسراوەکان لەم بازنەدا سەریان هەڵداوە . ڕێگای جێبەجی بوون لەم بازنەدا تەنیا لەسەر ڕچەی ڕۆژهەڵات ـ ڕوژئاواێ ئاشتی خوازانە و لەگۆڕانەوەی فەرهەنگ ، هونەر ، زمان و داب و نەریت بەردەوام بوون .

پ": ڕێژەی حەشیمەت لەپانتاییەکانی بەرزتر لە ٤٠ پلەیجوگرافیدا (بازنەی توقێنەر) ، پاش پیکهاتنی ئیمپراتوریەکان ، یەکیتیەکان و نەتەوەکانی بازنەی شارستانیەت سەری هەڵداوە و هێرشی دانیشتووانی ئەم شوێنانە بۆ باشوور ، لەسەرتاسەری بازنەی شارستانیەت و لەوانە لەئێراندا ، بووە بە هۆی فەوتان و کاولکاری و دژبەری سورشتی شارستانیەت .

### ت. ئەهورامەزدا:

بێگومان دیمەنی هەنووکەیی وشەی ئەهورامەزد، کە لەبەردە نووسراوەکەی داریوش وەرگیراوە، سەختە و نابەجێیە و دەسکردە و لەداهانینەکانی پارسەکانی هێند و بەرهەم و بناغەکەی لەپیتە دەنگدارەکانی زمانی سانسکریتە.

وەهادەرئەکەوێ، ئەوەی لە بەردەنووسراوەکەی بیستون و چەن بەردی دیکەشدا بەناوی ئەهورامەزدا دووپات کراوەتەوە، هیچ نیشانەیەکی لەپیتی "ە" و "واو"ی تێدا بەدی ناکرێت.

ر د ز م ر و ا

هەڵەی ڕۆژهەڵاتناسان لە ووتنی (زەمەی) ئێرانی بەشێوەی"U" لاتین، سەرچاوەی زۆرینەی هەڵە سەرەکیەکان لە سەر زار و لێکدانەوەی وشەکانی زمانی ناوچەیی ئێرانی دێرینەیە. لێرەدا ناچارین دەربارەی گرنگترین هەڵەی ڕۆژهەڵاتناسان لەخوێندنەوە و وەرگێڕانی تێکستە مێژینەکان، بەکورتی ئاماژە بکەم.

١-ڕۆژهەڵاتناسان پیتی بزماری ئێرانی دێرینەیان بە پیتی دەنگدار زانیوە و لەوە خراپتر جیاکردنەوەی نێوەکانیان بەشێوەی نێر و مێ و لەڕووی جنسییەتەوە ریزکردووە. لەحاڵێکدا کە سیستەمی (ئەلف و بێ) ئەم پیتە، بەشێوەی ئێستا لە(ئەلف و بێ) ڕاستەقینە، بێدەنگ و لەجیاوازی جنسی بێبەریە. هێشتا لەنووسینی ئەم زمانەدا دەنگ بەکار نابرێت، بۆ میناک دەنووسین: (کرم) و وەکو پێویستی ڕستەکە دەتوانین بنووسین (کَرَم)، بەخشش)، (کِرم، گیان لەبەرێک)، (کُرُم، جۆرێک مەتاڵ) و (کِرِم، کەرەسەی خۆڕازانەوە) دەیخوێنینەوە. یان دە نووسین (گرم) و وەکو پێویستی ڕستەکە بە (گَرم، دژی سرد) یا (گِرَم، یەکەی قورسایی) دەیخوێنینەوە. هەر ئەم شێوە لەپیتی بزماری فارسی دێرینەشدا لەپێش چاو دەگیردرێت.

بۆنموونە لەنووسراوەکاندا، دوو پیتی (ب ) و (گ ) لەپاڵ یەکدا ( ) وشەیەک بوواتای (خۆدا) سازدەکات. بەم جۆرە کە دەبینرێت ئەم دوو پیتە لەنووسراوەکاندا بێدەنگن. خوێنەرانی نووسراوەکان بەمەیلی خۆیان پیتێکی دەنگداری درێژی (آ، a) یان داناوە و پاش ئەوە دوو

پیتەکەیان بۆ هەمیشە وەکو پیتە سەربەخۆ و جێگیرەکانی (آ ، a ) بیریان لێکردووتەوە!.

٢ ـ بەمجۆری لەکۆی ٣٦ پیتی بزماری دێرینەیی ، لەهەمان حاڵدا کە سێ پیتی سەرەتایی دەنگداری تاقانە (مۆجەرِەد) دەزانن ، (لەپێناوی ئەو هەڵەدا کە (f بە a)، (اِ بە i) و (اُ بە u) خوێندوتەوە ، ٢٢ پیت بە پێکهاتەیەکی جێگیرو دەنگداری (a)، ٤ پیت بە پێکهاتەی جێگیر و دەنگداری (i) و ٧ پیت بە پێکهاتەی جێگیر بە دەنگی (u) بیریان لێکردووتەوە ١ .

٣ ـ بەمجۆرە ئاشکرا دەبێت کە لە دابەشکردنی دەنگ لەنێوان پیتە بزمارییەکانی زمانی فارسی دێرینەییدا ، دەنگی جێگیر بەتەواوی نەناسراوە و لەبەر ئەوە ئەمجۆرە پیتانە دەنگی جێگیریان نییە ، خوێنەران ئاگایان لەوە نەبووە کە جێگیربوون لە زاری ئێرانیدا خاوەنی یەک دەنگە و بەو هۆوە شێوەی خوێندنەوەی نووسراوەکان بەتەواوی لەزمانی ئێمەوە کە بەفراوانی لە دەنگی جێگیر سوود ئەبەین ، دوور کەوتووتەوە . لەهەمان حاڵدا وەکو لە(وَزرَک =بزرگ) و (پُثر=پسر) دیارە لە نیشانەی جێگیریش کەڵکیان وەرگرتووە! . بەڵام کاتێک ئەوانە بۆبەکاربردنی (ز) و (ثر)یش

| | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| 𐎠 | $a$ | 𐎩 | $j^a$ | 𐎴 | $n^a$ | 𐎼 | $r^a$ |
| 𐎡 | $i$ | 𐎪 | $j^i$ | 𐎵 | $n^u$ | 𐎽 | $r^u$ |
| 𐎢 | $u$ | 𐎫 | $t^a$ | 𐎱 | $p^a$ | 𐎾 | $l^a$ |
| 𐎣 | $k^a$ | 𐎬 | $t^u$ | 𐎳 | $f^a$ | 𐎺 | $v^a$ |
| 𐎤 | $k^u$ | 𐎰 | $\theta^a$ | 𐎲 | $b^a$ | 𐎻 | $v^i$ |
| 𐎧 | $x^a$ | 𐏂 | $ç^a$ | 𐎶 | $m^a$ | 𐎿 | $s^a$ |
| 𐎥 | $g^a$ | 𐎭 | $d^a$ | 𐎷 | $m^i$ | 𐏁 | $š^a$ |
| 𐎦 | $g^u$ | 𐎮 | $d^i$ | 𐎸 | $m^u$ | 𐏀 | $z^a$ |
| 𐎨 | $c^a$ | 𐎯 | $d^u$ | 𐎹 | $y^a$ | 𐏃 | $h^a$ |

هەموو فەتحەکان (a)، و هەموو ضمەکانیان بە (u) خوێندووتەوە

١ ـ لەنموونەی سەرەوەدا سەرزارەکانی (کنت) بەرانبەر بە پیتە بزماریەکانی ئێرانی دێرینە دەبینن . هەموو کەسرەکان (i)، هەموو فەتحەکان (a)، هەموو زەمەکانی بە (u) خوێدووتەوە .

لە دەنگداری ( a ) سوود وەردەدرن ، نازانین بە حوکمی کام ڕێزمان ، ێگیری ئەو پیتانەی سەرەوەیان فەرزکردووە .؟

٤ ـ لەڕاستیدا ڕۆژهەڵات ناسان و خوێنەرانی نووسراوە دێرینەکان ، بەهۆی لێکدانەوەی ناڕاست ،

١ ـ کنت ، فارسی باستان ، ص ١٢٠ ، موضوع ١٩ ، متن اصلی
٢ ـ کنت ، فارسی باستان ، ص ١٢٠ ، موضوع ١٨ ، متن اصلی

لە کتێبکی کنت وەرگیراوە٢ ، بەتەواوی ئاشکرایە کە ئەوانە ( فەتحە ) یان ، واتا دەنگی کورتی ( ئەلف ) بە ( آ a ) ، ( زەمە ) ، واتا دەنگی کورتی ( واو ) بە ( ئو ، u ) و کەسرە واتا دەنگی کورتی ( یا ) ، بە ( ئای ، i ) ، ناساندووە و لە بەر ئەوەیە کە ( مەزدە ) بووە بە ( مەزدا ) ، ( ئور ) بە ( ئور ) ، ( فێردوسی ) بە ( فیردوسی ) ، ( حافز ) بە ( حافیز ) ، و ( چِش پِش ) بە ( چیش پیش ) دەناسێنن ،

٥ ـ ئەگەر پیتە نووسینەکانی ئێرانی دێرینە دەنگدار بووبێتن ناچارین بیر لە دوو جۆر ( ک ) ، دوو جۆر ( ج ) ، دوو جۆر ( ت ) ، سێ جۆر ( د ) ، دوو جۆر ( ن ) ، سێ جۆر ( م ) ، دوو جۆر ( ر ) ، دوو جۆر ( و ) بکەینەوە ، نزیکەی پیتە بزمارییەکانی ئێرانی دێرینە دووپاتدەبنەوە ، پرسێک کە پێکهاتەی ئاڵۆزی ئەو پیتە ئاڵۆزتر دەکات .

سەرنجێک لەسەر ئەو باسەی سەرەوە و بەپشت بەستن بەم هۆکارانە کە پاشتر ئاماژەی پێدەکەم ، پیتی بزماری دێرینە لەبنەچەوە بێهوودە و ناڕاستە .

ئەلف ـ دەربارەی ئەو ٢٢ پیتە کە پێکهاتەکەیان بەخاوەنی دەنگی جێگیری ( آ ، a ) دادەنرێن ، بریتین لە : ( بَ ، پَ ، تَ ، ثَ ، ثَر ، جَ ، چَ ، خَ ، دَ ، رَ ، زَ ، سَ ، شَ ، فَ ، کَ ، گَ ، مَ ، لَ ، نَ ، وَ ، هَ ، یَ ) ، کاتێک لەکێلکی دەنگی ( اُو ، اِ ) ، زەمە وکەسرە دادەنرێن یا بەبێ هۆ دەنگی جێگیریان وەرگرتووە !

ب ـ دەربارەی ئەو ٧ پیتە کە پێکهاتەکەیان بەخاوەنی دەنگی جێگیری ( او ، u ) دانراون و بریتین لە : ( تُ ، دُ ، رُ ، کُ ، گُ ، نُ ، مُ ، ) ، کاتێک کە لەپاڵ دەنگی جێگری ( اَ و اِ ) فەتحە و کەسرە دادەنرێن یا بەبێ هۆ دەنگی جێگیریان وەرگرتووە !

پ ـ دەربارەی ئەو ٤ پیتە پێکهاتەکەیان خاوەنی دەنگی جێگری ( اُ ، i ) دانراون و بریتین لە لە : ( حِ ، دِ ، مِ ، وِ ) کاتێک لەپاڵ ( اُ ، اَ ) زەمە و فەتحە دادەنرێن و یا بەبێ هۆ دەنگی

لە : (حِ ، دِ ، مِ ، وِ) کاتێک لەپاڵ (اُ ، اَ) زەمە و فەتحە دادەنرێن و یا بەبێ هۆ دەنگی جێگیریان وەرگرتووە!

ت - لەحاڵێکدا کە پێکهاتەی هیچ کام لەپیتەکان دەنگی جێگیری بۆ دانەنراوە، دیسان لەم دەنگە لەسەر پیتە جۆربەجۆرەکانەوە سوودی لێوەردەگیردرێت .

ث - ئەگەر پیتێک لە پێکهاتەکەیدا تەنیا یەک دەنگی جێگیری هەبێ ، لە دێرێکدا کە تاکە دەنگی جۆربەجۆری هەیە ، زۆر بێواتەیە چوونک لەوحاڵەتەدا دەنگە تاکەکانی ئەو دێرە بێ‌نەقش و پێداویستین . کەوابوو ، ئەگەر پیتی بزماری دێرینە بە قبوڵکردنی دەنگە جۆربەجۆرەکان لەپاڵ خۆیاندا دەنگە جێگیرەکانیان دەگۆردرێت ، ئیتر بە چ شێوەیەک هەبوونی دەنگێکی جێگیر لە پێکهاتەکەیاندا مەیسور دەبێت ؟

ج - لە وشەی ئارشام ، باپیری داریوش=( 𐎠𐎼𐏁𐎠𐎶 ) پیتی (ر) کە دەنگە جێگیرەکەی فەتحە( َ )یە ، لەهەمان حاڵدا دەنگەکەی جێگیرەو پیتی (ش) کە دەنگەکەی جێگیر لەگەڵ فەتحەدایە ( َ ) ، جارێکی تر فەتحە( َ )یان داناوە و بەرانبەر شێوەی دەنگدانانی ڕۆژهەڵاتناسان ئەم نێوە دەبووا (اَ رَ شَ اَ مَ) بخوێنینەوە!

چ - پشتی ئەو پیتانە کە لە پێکهاتەکەیاندا زۆرجار دەنگی جێگیری فەتحە و یا کەسرە وەردەگرن ، دەنگێکی هاوێنەی دیکە لە وشەی کورشدا پاش (ک) و (ر) دانراوە کە پێکهاتەی هەردووکیان ڕەوڵی دەنگی جێگیری زەمە دەنوێنێت بەڵام دیسان زەمەیەکی تریان داناوە . دەربارەی ئەم وشەوە ، (شارپ ، ل ٣) تەنانەت فەتحەی لەسەر پیتی (ر)ش داناوە و دەنووسی لەبەر ئەوە کە نێوی کورش لە حاڵەتی (إضافە) دایە ، پێویستە فەتحەی لەسەر دابنرێت و بەم جۆرەی خوارەوە بنووسرێت (کورَوش) . لەحاڵێکدا کە پیتی (ر) لە پێکهاتەی وشەی (کورش)دا بە زەمەوە ( ُ ) فەرزکراوە . بەم جۆرە دەرئەکەوی کە بەگوێرەی شێوەی نێودانانی ڕۆژهەڵاتناسان ، دەبووا ئەم ناوە وەها بخوێنرایەتەوە (کُ اورُ اوش) کە هیچ هاوبەشیەکی لەگەڵ زمانەکانی ئێرانی دێرینەدا نی‌یە .

ح - لە وشەی (زُرَ ، زۆر = 𐏀𐎢𐎼 ) ، پیتی (ز) کە بەدەنگی جێگیری (فەتحە) نووسراوە ، لە کێڵکی دە نگی زەمەدا ، هەر بە زەمەوە دخوێرێتەوە .

خ ـ شایسته نی‌یه له‌پیتی بزماری دێرینه‌دا که جیاواز و سه‌ربه‌خۆ له دوو پیتی (ث K𐎰) و(ر 𐎼) سوودیان بردووه، پیتێکی سه‌ربه‌خۆی دیکه وه‌کو (ثر 𐏂) که پێکهاته‌یک له هه‌ر دوو پیتی (ر) و (ث)یه، داببن بکرێت. دیار نی‌یه چ حه‌وجه و پێداویستییه‌ک به‌داهێنانی به‌په‌له‌ی پیتی بزماری پارسی دێرینه هه‌ست پێکراوه. له‌وانه‌یه که پیتی (ثر) بۆنموونه وه‌کو پیتی (ژ) بووبێت که خوێنه‌رانی به‌رده نووسراوه‌کان به‌ته‌واوی ئه‌وه‌یان له‌یادکردووه.

گشت ئه‌م باسانه پێشه‌کییه‌کن بۆ نیشاندانی ئه‌و که‌مترخه‌مییه بێ ئه‌ژمارانه که له خوێندنی ده‌نگه‌کان و نێودانانی پیته بزمارییه‌کانی دێرینه ڕوویان داوه. سه‌رڕاستکردنه‌وه‌ی ئه‌وّ هه‌موو هه‌ڵانه و دیسان خوێندنه‌وه‌ی نووسراوه‌کان کارێکه وّرێدراوی داهاتوو(١) به‌ڵام له هه‌موو ئه‌م پێشه‌کییانه ئاکامێکی دروّشاوه ئه‌که‌وّێته‌وه.

پیتی بزماری دێرینه، بۆ به‌کارهێنانی ڕۆژانه ڕانه‌سپێردراوه. بۆنموونه ئێمه هیچ کاتێک له‌ڕێگای ئه‌م پیته‌وه نازانین له زمانی ئێرانی کۆندا نێوی دره‌خت و نان و هه‌ڵۆ چی بووه و ته‌نانه‌ت نازانین به‌زمانه کۆنه‌که‌مان به‌چ شێوه‌یک چاکوچۆنی بکه‌ین و له‌یه‌کتر بپرسین. وشه‌نامه‌ی پیتی بزماری و زمانی ئێرانی دێرینه له‌چوارچێوه‌ی نووسراوه‌کان زیاتر تێپه‌ڕ ناکات. له‌ڕاستیدا ده‌توانین باسه‌که به‌وّشێوه‌یه ڕێکوپێک بکه‌ین که‌ڕاگه‌یاندنه‌که‌ی داریوش بۆمێژوو، هه‌روه‌ها که زۆر که‌س وه‌بیریان هێناوه‌ته‌وه، له‌ده‌سپێکدا به بابۆلی و ئیلامی نووسراوه و ئه‌وّکاته که شاه فه‌رمانی داهێنانی پیتێکی تایبه‌تی بۆئیمپراتورییه‌که‌ی ده‌رکرد، نووسه‌رانی ئیلامی به‌گوێره‌ی ئه‌وفه‌رمانه ناچاربوون که‌به‌رانبه‌ر به هه‌ر وشه‌یه‌کی ئیلامی و بابۆلی له‌به‌رده نووسراوه‌که‌دا، وشه‌یه‌کی تازه‌بابه‌تی فارسی دابنێن. به‌م جۆره ته‌نیا له‌پێناوی به‌جێ‌هێنانی فه‌رمانی شاهه‌نشادا بوو که ئه‌م پیته له‌ڕاده‌یه‌کی سنووورداری پیت و وشه و به‌قه‌ده‌ر قسه‌کانی داریوش، له‌نووسراوه‌کاندا، له‌دایک بوون (١).

له‌وه به‌دوواوه‌یش ئه‌وپیته ته‌نیا له‌سنووری به‌رده‌نووسراوه‌کاندا که‌ڵکی لێ‌وه‌رده‌گیرا و هیچ کاتێک نه‌که‌وته نێو ژیان و فه‌رهه‌نگی ڕۆژانه‌وه. ساکارترین هۆکاری ئه‌م ئاماژه ئه‌وه‌یه که پیتی فۆرمی ڕۆژانه له‌بارگاکه‌ی ته‌خت جه‌مشیددا، ڕێنووس پیتی ئیلامی و پێویستی به‌ده‌وڵه‌مه‌ندی و

١ ـ له‌وه ئاگادارمه چه‌ن مامۆستایه‌ک خه‌رێکی چاککردنه‌و و دیسان خوێندنه‌وه‌ی نووسراوه کۆنه‌کانن و به‌م جۆره تیشکی ژیانه‌وه فه‌رهنگی نه‌ته‌وه‌ییمان له‌سه‌ر بنه‌چه‌که‌ی خۆی، به‌خۆشیه‌وه ئاشکرا ده‌بێ.

جۆربە جۆری وشەبووە کە لەزمانی تازەخۆڵقێنراوی پارسی دا باسێکی غەریب بوو .

بەرواڵەت کەڵکوەرگرتن لەم رێنووسە بەڕادەیەک سنووردار بووە کە چەن دهە دوایی ، کاتێک بۆ بتەوکردنی ناسنامەیٚ خێڵەکی ، بریاری هەڵکەندنی نووسراوەیەکیان بۆ (ارشام) و (ئاریا رەمن) دەردەکرد ، (٢)کەسێک نەبوو کە لانی کەمی ، ئەو سەختەکارییە بە ڕێنووسێکی ڕاست بنووسیٚ . چوونکە نووسراوەکەیٚ بێستون بەڕادەیێک نەیار و نائاشنایە کە کەسانێکی دیکە جگە لە نووسەرانی سەرەتایی دەسەڵاتی ئەو کارەیان نەبووە . وەهایە کە نووسراوەکانی دوایی هخامەنشییەکان بێجگە ناوە تایبەتەکانی کەسان و خۆداوەندان و ژمارەیێک وشەیٚ تازە لە نووسراوە سیٚ زمانەکاندا ، تەنیا لەو وشانە سوودیان بردووە کە داریوش لە (نووسراوە سەرەکیەکەیٚ) بێستواندا ئەمری نووسینی دەرکردووە . لەم حاڵەتەدا نابیٚ ڕێنووسی بزماری دێرینە وەکو ڕێنووسێکی نەتەوەیی ڕوومەت و بەهایەکی ئەوتویٚ پیٚ بدرێت . ئەمە ڕێنووسێکە کە بۆ سەرقاڵی و ئارامشی دەروونی داریوش داهێنراوە ، نە بۆ ژیان و زمانی ڕۆژانەی خەڵک و پەرەسەندنی فەرهەنگی نەتەوەیی .

بەم ڕوونکردنەوە کورتە ئیستا دەگەڕینەوە بۆ وشەیٚ (اُرمَزدَ) لە بەردە نووسراوەکەیٚ داریوشداکە پێکهاتەیەکی تۆژینەرانە لە دوو وشەی (اُر = اور) و (مَزدَ = مزدا) . بەشی یەکەمی ئەم پێکهاتەیە لە چەن وشەی ناسراو و زۆر باوی ڕۆژئاوایٚ ئێرانی کۆن و مێزوپۆتامیایە و واتەکەشی (شار و سەرزەوی) یە . نە تەنیا ئەم وشە لەگەڵ پاشەکی جۆربەجۆرکەیدا لە زۆربەیٚ شوێنە جوغرافی و شارەکانی وەکو (ارشلیم = ئورشلیم ، شاری ئاشنایی ولەش ساغی) ، (ارمیە = ئورومیە ، شار و سەرزەوینی پڕئاو) ، (ارامان = ئەورئامان ، شاری :اسایش) ، (اربیل = ئوربیل ، شارێک لەنێوان چیاکاندا) ، دەبینینەوە ، بەڵکو هەرئەم وشەیە لەپێشەکی لانی کەمی ، ٢٠ شار و تۆخیبی دیکەیٚ مێزوپۆتامیا و ڕۆژئاوایٚ ئێراندا خۆیٚ نیشان ئەدات کە ئیستا بۆمنی نووسەر واتاکەیان ڕوون نی یە : ئوراشنو(١) (ئەرمەنستان) ، ئوریدو ، ئوراش ، ئورکیش ، ئورتنا ، ئوریکاتو ، ئوریاکی ئوراندوش ، ئوربیلوم ، ئورزبابە ، ئورناشە ، ئورغو ، ئورکاگینە ، ئورارتو ، ئورها ، ئوریدو ، ئەریحا ، ئرزنا و زۆر نێوی دیکە کە هەموو ئەوانە گرێدراوی شار و شوێنی جۆغرافیان . شار و سەرزەوی ار

١ ـ ئەڵێن ڕێنووسی بزماریدێرینە ٣٦ پیتی هەیە ، بەڵام من زیاتر لە ٢١ پیت و ٣ دەنگم نەدۆزیەوە .

٢ـ جیاواز لە وئاماژەیٚ سەرەوە ئەیژم کە هەڵکەندنی ئەوە دوو نووسراوە سەختەکارانە لەسەردەمی هەت دوو ئەدەشیردا ئەنجام بووە

ار = ئور ) لە باشووری مێزوپۆتامیادایە و بە گوێرەیْ ڕاگەیاندنی تەورات، شوێنی لەدایکبوونی ئیبراهیم نەبی، لە بەناوبانگترینی ئەوانەیە. لەزمان و فەرهەنگی بابۆلی و ئاشورییەکاندا(ار Ur، ) و (اری، Uri ) بە واتایْ تەواوی شار یان یەک شارە.

بەشی دووەمی وشەی پێکهاتووی (اُرمَزدَ) واتا (مَزدَ) هەمان وشەیە کە لە فارسی نوێدا بۆ (مۆزد) گۆڕدراوە کە ڕۆژهەڵاتناسان بە( muzd ) دەینووسن. ئەم وشەیە بە ئاوێستایی ئەبێتە(mîzd) =(میژد) کە لەگەڵ (مژده)یْ ئیستایْ زمانی فارسیدا زۆر نزیکە. لەپارسی مانویدا تەنیا بەشێوەی mzd پێدەنگ. لە فەرهەنگی پەهلەویدا بەشێوەیْ ( mozd ) و ( mizd ) و واتایْ بەرانبەر، ئەجر و کرێیە. ئەم وشەیە تەنانەت لەزمانی گوتیک و ئوستیشدا بەشێوەیْ mizd و mizdö و دیسان بە واتایْ بەرانبەر و ئەجر نووسراوە .لەڕووپەلێکی گڵینە کە لە گەنجینەکەیْ تەخت جەمشیددا دەپارێزدرێت بەزمانی ئیلامی، یەکێ لەکرێکاران کە ٥٠ کارشە حەقدەسی وەرگرتووە بەناونیشانی (مەزدەیسنە) نێوبراوە. کامرون لەبەرگی یەکەمی (ڕاپۆرتەکانی دێرینەناسی) بەهەڵە ئەو کرێکارە بە(مەزداپەرەست دەناسێنی)، بەڵام نیشانەیەکمان بەدەستەوە نییە کە (مەزداپەرەست)، (مەزدیسنە) و یا (ئورمەزد)، لەگەڵ ئایین و پێشوایەک بەنێوی زەردەشتەوە گرێبدات، بۆنموونە لەم بارەوە دەتووانین (مەزدیسنە) بەنیشانەیەکی پەرەپێدرا و بو ئەوکرێکارە بزانین و دەکرێت کە واتایْ پڕئاماژەیْ (حەقدەس پەرست) ویا (بەرانبەر خواز)یشیبۆ دابنین. (نیشانەیْ مەزدیسنە کە بە پاپیرۆسی ئارامییەکانی سەردەمی هخامەنشی نووسراوە، ناتووانیْ نیشانەیْ زەردەشتی بوونی ئەوانە بێت، هەروەها کە هەبوونی نێوی ئەهورامەزدا لە بەردە نووسراوەکاندا نیشانەیەک بۆ ئەم پرسە نییە. (بنونیست، دین ایرانی ،ل٢٦ )

ئیستا واتایْ (اُرمَزدَ)ی ئاماژە پێکراوی داریوش بەتەواوی ڕوون ئەبێتەوە و ئەوە نیشانەیەکە بۆ خوداوەندەکەیْ داریوش، کە لەڕاستیدا خودایکی ئاشورییە: خوداوەندێک کە شارو سەرزەوینەکان وەکو ئەجر و دەسخوەشانە بەداگیرکەران دەبەخشیْ، واتا (بەخشەندەیْ سەرزەوین). داریوش و دەسەڵاتدارانی دیکەی هخامەنشی، برێجار نێوی ئەم خوداوەندە ئەبەن کەبۆ داگیرکردنی ١ـ

تێکستی بابۆلی، لەوانە گڵە نووسراوەکەیْ کورش، پێشەکی نێوی شار و سەرزەوییەکان بە(ار) دەس پێدەکات: (ئەنشان، دێری ١١)، (ئەرشوکا دێری ١٥)، (ئارانشنو و ئەرزابان، دێری ٣١ و نموونەیْ ئەوانە.

سەرزەوییەکان و تێکشکاندنی نەیاران لەپێرستی وڵاتە ژێردەسەڵاتەکانیاندا ئاماژەیٚ پێدەکەن .

(داریوش شاە ئەڵیٚ : ئەمەیە سنووری وڵاتانی ژێردەسەڵاتم : لەسکائیەوە تاسەغدیان تا وڵاتی کوس (نوبیە)، لەسەندەوە تا سارد . **ئەهورامەزدا ئەوانەیٚ ڕادەستی من کرد.** ئەوٚ کە گەورەترین خوٚداوەندانە و پشتیوانی من و بنەماڵەکەمە) . (Dph لە پی‌یر بریان وەرگیرتووە، مێژووی ئیمپراتوری هخامەنشی، ل ٣٨٦ ) . ئاریارمن شاهی مەزن، شاهی‌شاهان، شاە پارس، کوڕی چیش‌پیش شاە، کوڕزایٚ هخامەنش . ئاریارمن ئەڵیٚ : ئەم وڵاتی پارسە کەمن هەمە خاوەنی ئەسپگەلی باش و زەلامگەلی (باشە) . **(خوٚدایٚ گەورە ئەهورامەزدا ئەوەیٚ بەمن داوە. بەویستی ئەهورامەزدا من شایٚ ئەم وڵاتەم)** (نووسراوەیٚ ئاریارمن وتاری شارپ ل ٢١ )

سەروبنی قسەکانی داریوش لەنووسراوەکەیٚ بیٚستوون و کاتی شەڕبوٚداگیرکردنی شار و سەرزەوییە-کانی ئیٚران و هەرێمەکە : (اُرمَزدَ یارمەتی‌داوم) ئەم‌نیشانە پرواتەیە بوٚخوٚداکەیٚ داریوش، بەباوەڕی پووچەڵی ڕوٚژهەڵاتناسان و پارسەکانی هێند ، بەشیٚوەیٚ(ئەهورامەزدا ) لەڕیشەی (هور ) و(خوٚر = هەتاوە ) و بەواتایٚ خوداوەندی ڕووناکی وەرگیراوە تالە هەڵسەنگاندنەکانیاندا لە دژایەتی دیٚو و تاریکیدا بەکاری بهیٚنن و بەخوٚلقاندنی دوو خوٚداوەند بوٚئایینی زەردەشت، سەرهەڵدانی ئەو ئایینە بەسەردەمی هخامەنشییەکانەوە گریٚبدەن . من لەکاتی خوٚیدا باسی ئەم هەوڵە بیٚئاکامامە دەکەم . هەوڵی داریوش لەنووسراوەکەی بیٚستوندا لەسەر ئەم باسە کوٚبووەتەوە کە دەسکەوتەکانی ساڵانی دەسپێکی دەسەڵاتدارییەتیەکەیٚ بەشیٚوەیەک بنوێنیٚ‌کە گوایە تەنیا بەخششی خوٚداکەی خوٚیٚ بووە، واتا (ئورمەزد )ی سەرزەویی بەخشە و کەسانێک کە ئەم شتەیان پەسەند نەبیٚ، نەیارو دژبەری ئیرادەی (ئورمەزد ) دەناسیٚنیٚ . ناوبراو داکوٚکی سەردارانی سەربەخوٚخوازی نەتەوەکانی دیکەیٚ دژبەری، بەرانبەر بەخوٚی نەدەزانی بەڵکو دژبەری بەرانبەر بەوٚخوٚدایە دەزانی کە بەخشە-ندەیٚ سەرەکی سەرزەوییەکان بەداریوشە .

(ئیستا داریوش دەتوانیٚت ڕایگەیەنیٚ : (لەبەرەکەتی ئەهورا مەزدا) وەیە کەمن پادشام . **ئەهورا مەزدایە کە سنووری پادشاهییەکەیٚ بەمن ڕاسپاردووە** ) وێنەیەک کە داریوش دەیٚنوێنیٚت بە ئەوپەڕی دڵنیاییەوە ئەڵی کەشاە خوٚدا نی‌یە، **بەڵام لەبەر ئەوە کە لەلایەن خوٚداوەندەوە بووە بەخاوەن دەسەڵاتی پادشاهییەکەیٚ،** لەپێناوی پەیمانیٚکدا کە پیٚکەوە بەستوویانە، نوێنەری ئەهورامەزدا لە سەر زەویدایە .

به شێوه یه کی وردتر، ئه هورامه زدا خۆداوه ندی شایه . ئه مه ڕاستیکه که داریوش له نووسراوه که ی خۆی بەڕۆشنی ڕایده گه یه نێ : **(ئه وه یٚ که من له ماوه یٚ یه کسالدا کردوومه، به ده سه لاتی ئه هورامه زدا بووه. ئه هورامه زدا پشتیووانی خۆی به من به خشیوه.)** (بریان، تاریخ امپراتوری هخامنشی، ل ۳۰۲)

کاردانه وه یٚ وێنه یی ئه م خۆداوه ش زۆر دیاریکراو و له کاره گرنگه نه قش خۆلقێنه ره کانی ماموستایان و هونه رمه ندانی خۆلقێنه ری هه میشه ییه . له وێنه ناسراوه که یٚ ئه هورامه زدادا دوو باسک له هه ردوو لایه یه وه ڕوواوه، که جگه له کلاوه که ی هه موو به شه کانی دیمه ن و ڕازاوه یی ڕواله تی وه کو ده سه لاتداریکه . کلاوه که یٚ داریوش له بیستوندا نافۆرمیه چوونکه ئه وٚ وێنه یه له گۆڕه پانی شه ڕدا گیراوه . کلاوی ئه هورامه زداکه یٚ بیستون له گه لٚ کلاوه که ی داریوش له باره گا گشتییه که ی ته خت جه مشید دا یه ک شتن . له ڕاستیدا وێنه یٚ ئه هورامه زدا که له بیستوندا به رانبه ر به داریوش ڕاوه ستاوه، به ته واوی و له هه موو لایه نێکه وه، ته نانه ت له باری جلوبه رگی قۆل شۆڕیشه وه له گه لٚ وێنه یٚ داریوش له باره گایٚ گشتی ته خت جه مشیددا یه کسانه . وده توانین ئه و خۆداوه نده به سیمبولی پادشایه ک بزانین که به دوو باله که ی به سه ر ولاتانی ژێرده سه لاتیدا ده فرێت . ئه مڕۆش ئه م وێنه یه له کۆڕو کۆمه لی زه رده شتییه کاندا به دیمه نی خۆداوه ندی ئه هورامه زدا ده زانن و نه قشه که ی له سه ر ئاگردان و به لگه نامه کانیان داده نێن . دیار نی یه له به رچی وه هاوێنه یه ک له خۆداوه ندی یان بۆگه شه کردنی ئایینی زه رده شت له سه رانسه ری ئێرانی سه رده می ساسانیه کاندا دانه ناوه «(۱)» وله شێوه کارییه ئاینی و هونه رییه کانی پاش هخامه نشییه کان له سه ر به رد و ده فره سواله تییه کاندا نابینرێت، ئه هورامه زدایه ک که خۆداوه ندی زه رده شتییه کانه، نشانه یه کی به شوێن خۆیدا به جیٚ نه هێشتووه . پادشاکانی ساسانی ته نانه ت بازنه یٚ ده سه لاتیان به بیٚ هه بوونی نوێنه ری ئه م خۆداوه نده بالداره ده گۆڕایه وه و ئه هورامه زدایٚ سه رده می ئه وانه ئیتر بالدار نه بوو به لکو له سه ر ئه سپیک سوار بوو! .

وێنه که یٚ شاپور له سه ر پشتی ئه سپیک کێشراوه که ده ستی بۆ بازنه ی ده سه لات ڕاکێشاوه بوو . ئه هورا مه زدایش له سه ر ئه سپێکی دیکه سواره و بازنه یٚ پادشایی راده ستی شاپور ده کات . له ژێر سمی ئه سپه که یٚ شاپورگردیانوس (؟!) وله ژێر سمی ئه سپه که ی ئه هورا مه زدادا ئه هریمه ن ده بینرێن! (لوکونین، تمدن ایران ساسانی، ل ۳۳۱)

دلنیا نیم که نه قشی ئاگردان، دراوه و به لگه نامه کانی ساسانی و به گشتی پیروزی و پارێزگاری ئاگرپه یوه ندی به ئایینی زه رده شته وه هه بیٚ . ودلنیا نیم ئه و شتانه که ساسانییه کان به زۆری فه لاقه پروپاگه نده یان بۆده کرد، گرێدراوی ئایینی زه رده شتبێت

دیار ی‌یه بۆچی لوکونین له لێکدانه‌وه‌یٚ شێوی کاری سه‌رده‌می ساسانیه‌کاندا له هه‌موو شوێنێکدا ئه‌م مۆغه ئه‌سپ‌سواره‌یان به ئه‌هورامه‌زدا زانیوه . ساسانییه‌کان چه‌مکی ئه‌هورایان خستووته سه‌ر نووسراوه‌کان و به ئه‌هورا مه‌زدا ده‌یخوێننه‌وه ، له‌حالێکدا نووسراوه‌کان ته‌نیا (مۆغ مه‌زداپه‌ره‌ستیان) له‌سه‌ر نووسراوه . ل گه‌لٚ ئه‌وه‌شدا ته‌نانه‌ت ئه‌گه‌ر ئه‌وٚ مۆغه‌ش به ئه‌هورامه‌زدا بزانین ، لانی که‌می ئیترله ئه‌هورامه‌زدایٚ سه‌رده‌می هخامه نشییه‌کان ناچێت و هه‌روه‌ها سه‌مبۆلی هه‌نوکه‌یش نی‌یه . به‌لام بۆچی زه‌رده‌شتییه‌کانی پاش هخاخمه‌نشی ، وێنه‌یٚ هه‌لبژێردراوی داریوشیان بۆ ئه‌هورامه‌زدا گۆڕیوه و دیمه‌نێکی دیکه‌یان لیٚ خۆلقاندوه و بۆچی زه‌رده‌شتیه‌کانی ئیستا جارێکی تر هه‌مان وێنه ده‌سکرده‌که‌یٚ داریوشیان به‌شێوه‌ی وێنه‌یٚ ئه‌هورامه‌زدا هێنایه مه‌یدانه‌وه ؟ . ئایا ده‌کریٚ وێنه‌کانی خوداوه‌ندی ئایینێک به‌ ڕێژه‌یٚ به‌رژه‌وه‌ندی سه‌رکرده یا په‌یره‌وه‌کانی بگۆڕدرێت یان ئه‌م‌لا و ئه‌ولایٚ پیٚ‌بکرێت ؟ . مه‌گه‌ر لێکدانه‌وه‌یٚ زه‌رده‌شتیه‌کان له هه‌ر ده‌وره‌یه‌کدا سه‌باره‌ت به یه‌زدان و خۆداوه‌نده

١ ـ دلنیا نیم که‌نه‌قشی ئاگردان ، دراوه و به‌لگه‌نامه‌کانی ساسانی و به‌گشتی پیروزی و پارێزگاری ئاگر په‌یوه‌ندی به‌ئایینی زه‌رده‌شته‌وه هه‌بیٚ . و دلنیا نیم ئه‌و شتانه که ساسانییه‌کان‌به‌زۆری فه‌لاقه پڕوپاگه‌نده‌یان بۆده‌کرد ، گرێدراوی ئایینی زه‌رده‌شت بێت .

پێشووه‌کانیان گۆردراوه ؟ ئه‌گه‌ر وه‌هایه ، چ لێکدانه‌وه‌یه‌ک په‌یوه‌ندی به ئه‌هورا مه‌زدا و زه‌رده‌شته‌وه هه‌یه ؟ . به‌هه‌رحالٚ نازانین ئه‌م بوونه‌وه‌ره بالداره ، که یه‌که‌م جار چوار سه‌ده‌پێشتر له داریوش ، له به‌رده هه‌لکنراوه‌کانی ئاشوردا بینراوه ، به چ‌شێوه‌یه‌ک ده‌لکێنرێت به‌باوه‌ڕه ئایینیه‌که‌ی زه‌رده‌شته‌وه . ئاشکرایه که ئه‌گه‌ر ئه‌م وێنه‌یه به سیمبۆلی خۆداوه‌ندی زه‌رده‌شتیه‌کان بزانین ، ناچار ئه‌بین که ئاشورییه‌کانیش به‌زه‌رده‌شتی بزانین ، چوونکه ئه‌وانه خۆلقێنه‌ری سه‌ره‌کی و ڕه‌وایٚ وه‌ها سیمبۆلێکن . له‌لایکی دیکه‌وه ئه‌م بوونه‌وه‌ره بالداره و ئه‌سپه‌که‌یٚ ژێری نه‌قشێکیان له پانتایی کرده‌وه و باوه‌ڕمه‌ندی و ژیانی ڕۆژانه‌یٚ خه‌لکدا نی‌یه و ته‌نیا چاودێری دابینکردن و به‌خشین و گۆڕینه‌وه‌یٚ ده‌سه‌لاتی پادشاکان ده‌کات . چۆن‌چۆنینه که ئه‌م نه‌قشه‌یٚ گرێدراوی زه‌رده‌شت له هه‌ستیار ترین کاتدا ، بۆنموونه نێپرابی ئاگردانه‌کان دا سه‌هه‌لٚ نادات ؟ ئایا باوڕمه‌ندان له‌کاتی به‌جیٚ‌هێانی ئه‌رکه ئایینیه‌کانیاندا به دیمه‌نی هێمنی به‌خشی خۆداوه‌نده‌که‌یان پێویستییان زۆرتر بووه ، یان کاتی گۆڕینه‌وه‌یٚ ده‌سه‌لاتی ئیمپراتوره‌کانیان ؟ . هه‌رجۆره هه‌وڵ و پشکنینێکی جیدی ، خه‌باتی هه‌ندیٚ ڕۆژهه‌لات ناس وه‌کو خانم مری بویس و شاگرده ئێرانیه‌کانی

لەم مۆرەدا کە هی سەدەیٚ نۆهەمی پێش زایینی ئاشورییەکانە، پاڵەوانێک تیردان و کەمانەکەیٚ لەکۆڵ ناوە و خنجێرێکی بەدەستی ڕاستەوەیە و ملی حوٚشترمرێشکێک دەگوشێ. باوەڕمەندێک لەحاڵی دوٚعاخوێندن بەرانبەر درەختی پیرۆزڕاوەستاوە کە لەدوو لایەنی درەختەکەوە، پەیکەری دوو زەلام کەهەرکامەیان ماسییەکی دەلویان بەدەستەوەیە و لەسەروی هەموویانە وە مروٚڤی باڵدار، کە لە گەردوونەی هە تاوەوە سەری هەڵداوە، چاودێری گۆڕەپانەکەیە. ئەمە هەر ئەوٚ نەقشەیە کە پشتی ٤٠٠سالٚ وەکو وێنەیٚ خوٚداوەندی زەردەشتییەکان واتا ئەهورامەزدا بیری لیٚ ئەکەینەوە! (تصویر برگرفته از کتاب جیمز. پ. پریکادو شرق میانەی باستان، ل ٢٢٣)

ئەو وێنەیە کاشیکی سەدەیٚ نوٚهەم و سەردەمی نینورتای دووەم ٨٩٠ ـ ٨٨٤ی (پ ـ ز)یە کە تێدا ئەهورامە[illegible] [illegible]رانی بەشێوەیٚ خوٚدایٚ ئاشوری دەبینین، بەهەمان پەڕ و باڵ و کلکەوە کە تیر و کەوانی بەد[illegible] لەسەر گەردوونەیەکی ئاگر دانیشتووە. (تصویر برگرفته از کتاب جیمز. پ. پریکادو، شرق میانەی [illegible]ان ل ١٨٠)

دەربارەی مێژووی ئایینی زەردەشت بەواتای ئایینێکی نەتەوەیی ، فۆرمی و سەرانسەری ئێران پووچەڵ دەکاتەوە . چوونکە تائێستا هیچ بەڵگەیەکی دەوڵەتی ، نەتەوەییئایینی و تەنانەت گاثەکانی ئاویستا ، و بەهیچ شێوەیەک نێوی زەردەشتی پەیغەمبەرمان نەدیتوەتەوە( ١ ) .

١ - کۆمەڵێ بەڵگەنامەیێ دەگمەن لەسەلماندنی شارستانیەت و ئایینی درۆشاوەی ئێرانی پێش لە ئیسلام ، هاوکاتی دەسەڵاتداریەتی هخامەنشییەکان بەم جۆرەیێ خوارەوە ڕۆشن دەکاتەوە : (هەمووێ ئەوانە ئەسکەندر و عارەب فەوتاندوویانن!) ئەم پەسنە لەشوێنێکی دیکەشدا دەبینین و دەزانین کە ئاویستای ڕاستەقینە لەسەر چەرمی ١٢٠٠٠ گا نووسراوە و پاش ئەوە لەزۆرشوێندا دەبیسترێت کەئەمە هەمان کوپییە سەرەکییە پیرۆزەکەیێ ئاویستایە کە ئەسکەندەر سووتاندی و پاتەختی وڵات هەمیشە لەپارس و ناوەندی مۆغەکان لەشیز کەناری دریاچەیێ ئورومیە ، دووخاڵی سەرەکی لەمێژووی ئەم بەڵگەدان . هەرکەس کە بەڕوانگەیەکی دوور لەهەڵەوە ، چاوێک بەمێژووی ڕاستەقینەی زەردەشتیدا بخشێنێتەوە بۆیەک چرکەش بووە بەگومانەوە بیر لەوە دەکاتەوە کە ئەو خەیڵاتە ڕاستیکی مێژوویی بێت . هیچ کەس ناتووانێ جیا لەپرسەکانی دیکە پرسێکی وەها پێشکەوتوو لەسەردەمی هخامەنشییەکاندا بەوکتێبەوە بچەسپێنێ کەبتوانێت تێکستێکی گەورە یان کتێبخانەیەک لەئاویستا بخوڵقێنێ ، و ئەگەر بەڕاستی پێشکەوتنی وێژەیی لەوڕۆژانەدا بەوە ڕادەیە گەیشتبوو ، نەریتە ئایینییەکان ناشێ تەنیا لەڕووی نموونە سووتاوەکانیەوە بڵاو بووبێتەوە . تەوراتی یەهود کە پلەیێ یەکەمی لەکۆتایی دەسەڵاتی هخامەنشییەکاندا ، کۆتایی هاتبوو ، ڕێکەوتێکی تاڕادەیەک دژوارتری لەساڵەکانی ٧٠ی پاش زایینیدا لەئورشلیمدا بەخۆیەوە بینیووە . بالەبیرمان نەچێ کە کاتێ ئەسکەندەر دەستی بەسەر ئێراندا گرت ، ئەم وڵاتە لەگەڵ قەیرانێکی ئایینیدا ڕووبەڕوو نەبوو ئایین هەر لەسەرشێوە کۆنەکەیەوە مابووەوە و هیچ ئایینێکی نوێ خوداوەندەکانی کۆنی هەڵنەدێرابوو ، حەوجەیێ بەوەنییە کە ئاماژە بەو دوو خاڵە بکەم ، بەڵام ناچارم کەبێژم : لەوێژەوئەدەبیاتی یۆنانیدا کەئاگایی وردمان دەربارەیەوە هەیە ، بەو جۆرە کە سەبارەت بەئاویستا دەنووسن بچووکترین شوێنەوارێک نابینرێت ، هەرچەن کەزۆربەیێ سەرچاوەکانی فەرهەنگی ئەوسەردەمەیێ یونان فەوتاون .... **نە، ئاویستایێ پێش لە ئەسکەندەر لە ئێراندا تەنیا خەیاڵێکە و هیچی تر** . گرنگتر ئەوەیە : کۆمەڵێ ڕاپورت و چیروکی دوور و درێژ لەم بارەوە لەبەردەسایە کەبەتایبەت لەسەردەمی دێرینەدا لەسەرزاری خەڵکەوە بوون . (هنریک ساموئل نیبرک ، دینهای ایران باستان ، ل ٤٢٤ ) .

ەم جۆرە ئەم گروپە لەو باوەڕەدا بوون کە دەکرێت ئاگر بەربدرێتە شارستانییەتێک و بکرێت بە بووڵەمر، بە شێوەیەک
با لەگەڵ خۆیدا بیبات و هیچ یاد و شوێنەوارێکی لێ نەمێنێتەوە. ئەم بۆچوونە سایلۆحانە ئاسانترین ڕێگای
هەڵهاتن لە پشکنینێکی نەتەوەییە. بەڵام من حەز ئەکەم لەوانە بپرسم گریمان مەقدونی و عارەبەکان هەموو
بەڵگەنامە نەتەوەییەکانی ئێمەیان سووتاند بە شێوەیەک کە هەموو چەمک و ناوەڕۆکەکەی لە یاد و بیرەوەری
جیهاندا سڕایەوە، ئەوەش لە حاڵێکدا کە لەسەر هەستیاری خوڵقێنەرانەی فەرهەنگی زهنی ئێرانیەکان، تارادەی
پاراستنی تەواو و بێ کەم و کووڕی ئاویستا پێ دادەگرن، لەم حاڵەتەدا، لەوانەیە کە مەقدوونی و عارەبەکان دەستی
ئەو هەموو بەردتاشانەیان گرتبێت و نەیانهێشتبێت لە دەسپێکی هخامەنشییەکانەوە تاکوتایی
ساسانییەکان بۆیەک جاریش نێوی زەردەشت لەسەر دەیان تەختە بەردی نووسراوە هەڵکەنن، کە هەندێ لەوانە
بەتەواوی پڕوپاگەندەی ئایینی بوو!؟
(کۆنترین بەڵگەیەک کە لەکات و ژیانی زەردەشت لەدەسماندایە، کسانتوس لیدیەیی نووسیویەتی کە
کەسایەتییەکی بەتەمەنی سەردەمی هێرودیتە. ئەم بەڵگەیە تەێژی زەردەشت ۶۰۰ساڵ پێش لە لەشکەرکێشی
خەشایار شاە بۆسەر یونان ژیاوە. ئاگادری لەم جۆرەش بەڵام بەشێوەیەکی دیکە لەئاکادیمیەکەی ئیفلاتونمان
بەدەستەوەیە. ئیفلاتون لەکۆتایی ژیانیدا لەگەڵ کۆڕوکۆمەڵی ئێرانیدا پەیوەندی گرت و سەبارەت بەۆشتانە
کە فێری ئەبوون دڵبەندی فراوان سەری هەڵدابوو، ڕووداوێک وەکو شوپینهاور وشەیدایی ناوبراو بەرانبەر
بە فەلسەفەی هێندی. ئیدکسوس کنیدس، کە پێش لە ئیفلاتون کۆچی دوایی کردبوو و دۆستێکی نزیکی ناوبراو
بوو، لەزاری پلینوسی مەزنەوە ئەڵێ؛ زەردەشت ۶۰۰۰ ساڵ پێش لە ئیفلاتون ژیاوە(!). ئەم چیروکە ئەبێ
لە نووسراوە بزربووەکەی ئەرەستوو دەربارەی فەلسەفەوە وەرگیرابێت کە تێدا لە ئیینی دوو خۆدایی ئیرانییەکانەوە
باس کراوە. باوەڕمەندانی دیکەی ئاکادیمی لەدەوروبەری ئەوسالانەدا وەبیریان هێناوەتەوە کە زەردەشت
۵۰۰۰ ساڵ پێش لەشەڕی تروّیان ژیاوە (هرمدرس)، چیروکی ئیدکسوس ئەبێ لە هەموو چیروکەکان کۆنتر بێت
(هنریک ساموئل نیبرگ، دین‌های ایران باستان، ل ۲۷).
لەڕاستیدا پێویستە کەسێک ئەم کیشەیە کە ڕۆژهەڵاتناسان بۆمێژووی ئێران خوڵقاندویانە،
بکاتەوە و ڕۆشنی بکاتەوە کە بۆچی ئەبێ ئێمە نێوی پەیامبەرەکەی ئایینی کۆن، نێوی سەرزەویی و
زنجیرەی گەورەترین ئیمپراتورەکان و زۆر شتی دیکە لە بەڵگەنامەی کەسانی دیکەدا بەدووایدا
بگەڕین؟، ئەو ئاگاداریانە کە پەیوەندییان بە مێژووی وڵاتەکەمانەوە هەیە و ساڵانێکی زۆرە کە
ڕۆژهەڵاتناسان دەیکەن بە مێشکماندا و ئێمەش بەبڕوا پێکراو و حاشاهەڵنەگریان دەزانین؟ ئایا

دەکرێت کە ڕۆژهەڵات ناسان وێنەی مێژووی ئێرانیان لەوپارچە فەرتووتە ژێرخاکیانە پێکهێنابێ کە ئەوانە و لایەنگرە ناوخۆییەکانیان پێکەوە لکاندوویانە .

لەبارەی زەردەشتەوە باسێکی زۆر دەکرێت . هەندێ کەس ژیانی دەگێڕنەوە بۆ ٦٠٠٠ساڵ پێش زایینی ، لەلایەکی دیکەوە هەنێ کەسیش بە هۆی هاووێنەیی نێوی گەشتاسپ شاهێک کە لە زەردەشت داکۆکی کردووە و چووەتە سەر ئایینەکەی ، لەگەڵ گەشتاسپ شاه هخامەنشیدا ، سەردەمی زەردەشت بە سەردەمی هخامەنشی دەزانن . هرتسفیلد زەردەشت بە سیاسەتوان دەزانێت و ئەڵێ : (ڕەچەڵەکی دەگەڕێتەوە بۆ یەکێ لە دوو بنەماڵەی مێدیا و جێگرەکەی کە هخامەنشی بوو . ئەو دوو بنەماڵەیە کە دەسەڵاتداری مێژووی ئێرانی دێرینە بوون . . . لە شوێنی لەدایکبوونیدا تاوانی شۆڕشگێرییان خستەپاڵی و بۆ دادگاه بانگێشیان کرد و **سەروکی دادگاکە بە ڕێکەوت گئوماتەی مۆغ بوو کە دوایی دەسەڵاتی زەوت کرد و بە دەستی داریوش هاتە کوشتن.گئوماتە زەردەشتی لە شارەکەی دوور خستەوە)** . و ئەم دوورخستنەوەی زەردەشت بۆتووس واتا بارەگاکەی ویشتاسپ ، دەسەڵاتداری هەرێمەکە بوو . گروپێکی دیکە کە هنینگ بە "باوەڕ و نەریتی گشتی" دەزانی سەردەمی ژیانی زەردەشت دەباتەوە بۆ ٢٥٨ساڵ پێش لە هێرشی ئەسکەندەر بۆسەر ئێران و بە حەسباندنی ژمێریاری کۆچی دوایی زەردەشت لەساڵی ٥٨٥ی پێش زایینی ڕێکەوتووە کە ئەگەر سەرنجی ئەو باسە بدەین کە زەردەشت ٧٥ ساڵ لە ژیاندا بووە ، ساڵی لە دایکبوونی ٦٦٠ی پێش زایینی و لە سەردەمی ژیانی هەوەخشەتەرپادشای مێدیا ، واتا ڕێکەوتی (٦٣٣_٥٨٥) . هەوەخشەتەر زۆر بەدەسەڵات بوو و مشکورناوبراو بە " مەزنترین پادشای مێدیا" دەزانێ (فرهنگ رجایی ، تحول اندیشهٔ سیاسی درشرق باستان ، ل ٦٩)

بەربڵاوی خەیاڵاتی هاوڕێ لەگەڵ نواندنی ئەوپەڕی لەخشتەبردنی مێژوویی لەو نووسراوەی سەرەوەدا مێتولۆژیش دەبەزێنێ . بۆ نموونە دیار نییە کە هیرودێت بۆچی لە حاڵ و وەزعی شوانێک کە مەلەمۆتکە تازە لەدایکبووەکەی کورشی لەناو دارستانەکانی مێدیادا رزگار کرد ، ئاگادار بوو بەڵام لە دۆخی پەیغامبەرێکی مەزن کە گوایە هەموو ئێرانییەکان قەرزداری ئیخلاقی بەنرخ و دروونپاکی وەها پەیغامبەرێکن ، ئاگادار نییە؟ ئەگەر هەبوونی وەها پەیغامبەرێک لەمێژووی ئێراندا بەو ڕادەیە پێویستە کە بە بۆچوونی گروپێک ، لەنەبوونی ئەو پەیغەمبەرە یەک یا چەن کوڵەکەی شارستانیەتی ئێمە کوڵ ئەدا ، هیچ نەبێ ، پێویستە قایمی و بتەوبوونی ئەو کوڵەکەیە جیدی بگرین و لە شێوەی خەیاڵیەکەی ئەو پەیغامبەرە دێرینەیە بۆ سازکردنی مێژوو کەڵک وەرنەگرین .

(نە یونانی و سریانییەکان و نە نووسەرانی ئەرمەنی ، هیچ کامەیان لە زەردەشتی ئاویستایی وئایینەکەی کە

لە گاساکانی ئاڤێستادا باسی لێکراوە، ئاگاداریان لێ نەبوو. پێویستە هەمیشە ئەم ڕاستییە لە بیرەوەرییەکانماندا ڕابگرین. سەرقاڵی بەم پرسەوە و دۆزینەوەی هۆکارەکانی لەدەرەوەی دەسەڵاتی ئێمەیە **تەنیا بە بیرهێنانی ئەو خاڵەمان بەسە کە بزانین خولیایەک لە ئێمەدا هەیە کە دەربارەی بنچینە و بڵاوبوونەوەی ئایینی زەردەشت لە سەردەمە کۆنەکاندا فرەبێژی بکەین**. لەوانەیە ئایینی زەردەشتی لە دەسپێکدا بزاوێکی ناوچەیی لە گۆشەیەک لە ڕۆژهەڵاتی ئێراندا بووبێ و هێشتا سنوورە جوگرافیەکەیدەس نیشان نەکرابێ. ئەم ئایینە نوێیە لەگەڵ کێشە و ئیدانەی ئایینە باوەکانی ئەو سەردەمەدا ڕوو بەڕوو بووەوە و بۆ ماوەیەکی دوور و درێژ نەیتووانی سەردەستی بەدەس بهێنێ و کاتێکیش پەرەی سەند، بۆ بارێکی دیکە گۆڕدرا. ئایینی زەردەشتی لەگەڵ ئایینە کونەکاندا تێکڵاو بوو، ئەو ئایینانە کە پێشتر بیری لە سرینەوەیان دەکرد و پاشتر مەزدیسنا بە شێوەیەکی بەتەواوی جیاواز گەیشتە ڕۆژئاوای ئێران. (بنونیست، دین ایرانی ل ٧٨)

**بەم جۆرە دەرئەکەوێ کە لەهیچ دەورەیەک لە مێژووی ئێرانی پێش لە ئیسلامدا، هیچ ئایینێک لەلەشی نەتەوەیی و بارەگای ئیمپراتورەکانیدا پەلی دانەکوتاوە و ئەگەر بمانەوێ بەکورتی بچمە نێو مژارێکەوە کە لەڕیزی باسەکانی داهاتووی نووسراوەکانی دواییمدا بێت، بێ ئەملا وئەولا ئەڵێم: ئێرانییەکانی پێش لە ئیسلام بە هیچ ئایینێکی فۆرمی، نەتەوەیی و سەرانسەری باوەڕیان نەبووە و ئیسلام یەکەمین ئایین، باوەڕ و ئیمانی نەتەوەیی و سەرانسەری بەرزاییەکانی ئێرانە**(١). هەرچی تەمەنی ساسانییەکان تێپەڕ دەبوو باشتر دەرئەکەوت کە لەهێزی دەروونی ولایەنی پەرسەندنی ئەم ئایینە نزم ئەبێتەوە و **دەسەڵاتی خۆی بە قەرزداری دەزگای دەوڵەتی دەسەڵاتدار و پادشاکانی ساسانی بۆ ئەشکەنجە هەست پێدەکرد.**

دوواجار قایمترین پایگای مەزداپەرەستی کۆڕو کۆمەڵی دەوڵەت و سوپا چەکدارەکەی بوو. بەدڵنیاییەوە پاش ئەوە کە ئیسلام تەشەنەی کردە نێو ئێرانەوە دەسەڵاتداریەتی ساسانیش ڕووخا، **مەزدا پەرەستی تارادەیەک پاڵی بە دەوڵەتەوە دابوو بە یەک هەڵمەت وەکو مێوەیەکی کرمۆڵ سەرەوخوار بووەوە** و ئارام و بێدەنگ لەڕیزی ئەو ئایینانە کە لە دەورەی نوێدا لێبراوانە چاوەڕوانی بوون، وەلانرا). (نیبرگ ئایینەکانی ئێرانی دێرینە، ل ٤٢٩)

ڕووبەڕوو بوونەوەی نیبرگ بەرانبەر بە ئایینی زەردەشت بەگشتی بۆ گومان و دوودڵی دەگۆڕدرێت

١ ـ ئەرکی هاوڵاتیانی زەردەشتییە کە تارماییە مێژووییەکان لەبارەی زەردەشتەوە بسڕنەوە و ئەم کورتە باسە و هەروەها ڕوونکردنەوەکانم لە نووسراوەی دووهەمدا، ڕاگەیاندنێکی ئایینی نییە بەڵکو لێکدانەوەیەکی مێژووییە، چوونکە مێژوونووس ناتووانی بە هیچ ڕووداوێکی مێژوویی و نەتەوەیی هەست و خۆشەویستییەکی تایبەتی هەبێ.

و ئ.وان. کە ئەم پەیغامبەرەیان باوەڕ دەکرد ، هیچیان تائیستا نەیانتوانیوە نیشانەیەک بۆ سەبوونی ئەم ئەندازیارەی ئایینی ئێرانیە پێشکەش بکەن و هیچ بەڵگەیەک لە زەردەشتی بلیمەت کە نێویکی لێوە بردبی ، بەدەستمانەوە نی‌یە . سێ نووسراوەی هەستیارانە ، کاڵ و کرچ و بێ‌نرخی خانمی مری بویس ، لە سەلماندنی کۆن بوونی ئایینی زەردەشتدا ،کە لە دەسپێکی ڕزیوی "ئاریا مەنشانە " دەربازدەبوو و خراپتر لەوە ، بە پاڵدانەوە بە ئاویستاو و لەم دوواییە لە هێندوستاندا بە کۆمەڵێ وشە لەزمانی گەجراتی هاتووەتە نووسین ، نابی بەجیدی بزانین(١) . کتێبەکەی ناوبرا و یەکی لە تازە ترین‌شێوە ناڕەواکانی کومەڵێک ڕۆژهەڵاتناسی نەخوێنەوار ، ساختەچی(٢) و ئەدەگمەن خاوەن زانست و ناونیشانداره کە لە دەسپێکی مێژووی ئێرانەوە بۆ سەرکەوتنەکانی هخامەنشییەکان گواستوویانەتوە .

بە دەگمەن خاوەن زانست و ناونیشانداره کە لە دەسپێکی مێژووی ئێرانەوە بۆ سەرکەوتنەکانی هخامەنشییەکان گواستوویانەتەوە .

ئاگاداری ئێمە لە چۆنیەتی دەربڕینی وشەکان لەزمانی سەرەکی ئاویستادا ، گشتی و سنووردارە ، چوونکە تەنی لەسەرزاری مۆغە پارسیەکانی دانیشتووی هێندەوە هاتووەتە نووسین و شێوە زاراوەی زمانی زکماکی ئەوانەش ، کە هەندێ جار گەجراتی و هەندێکیشیان پارسیە ، کاری کردووەتەسەر زمانی ئاویستا( دکتر پرویز ناتل خانلری ، تاریخ زبان فارسی ، جلد اول ، ل ١٨٠ )

ئیستا ئیتر دەتووانین بۆ هەوڵەکانی کورش و داریوش لە نووسینی ناسنامەی شاهانەی خۆیاندا

١ ئەگەر کەسێک هیمەت بکات و ڕەخنەیەکی ورد و شێتگیرانە لەسەر نووسراوەکەی خانمی مری بویس بنووسێ ،ئەوکاتە دەرئەکەوێ کە ئە و ڕۆژهەڵاتناسە بەڕێزانە ، تا چڕادەیەک لە شاردنەوەی ڕاستیەمێژوویەکانی ئێراندا خاوەن مەبەست و بەبریارن و دەرئەکەوێ کە تەنانەت لە وەرگێرانی نووسراوەکانی مێژووی ئێراندا بۆسەر زمانی‌فارسی ، هەمیشە و تائیستاش پرسێکی تایەتیان هەڵبژاردووە . ـ ئەم شێوە پاڵدانەوانە لەبارەی گرووپێک لە ڕۆژهەڵاتناسانەوە هێشتا کۆرت و لە :استی خۆیدا نی‌یە . بۆ ئاشنایی لەگەڵ گۆشەیەک لە وسەختەکاریانە ، دەگەڕێنەوە بۆبیرەوەرییەکانی خانمی دیالافوآ و هەروەها کتێبە زۆربە نرخەکەی مامۆستا عزت‌الله گهبان ،بە نێوی( مروری بر ٥٠ ساڵ باستان‌شناسی ایران ) ( دوێنێ گابەردێکی گەورەو تماشا دەکرد کە لەم ڕۆژانەی دووایینەی دووایدا دۆزرابووە . و قورساییەکەی دەورویەری ١٢٠٠٠ کیلو بوو ! جێبەجێ کردن هەڵگرتنی قبارەیەکی وەها نەکراو و نەگونجاو بوو . لەدووایدا نەمتووانی تووڕەیی خۆم قووت بدەم و پیکێکم هەڵگرت وکەوتمە لێدانی ئەو پەیکەرە بەردینە و چەندین تەوژمی سەخت و توقێنەرم لێدا . لە ئاکامی ئەولێدانەدا سەری کوڵەکەکە وەکو مێوەیەکی گەیشتوو شەقی‌برد ) . ( ژان دیالافوآ ، سفرنامە ، ل ٢٨٠ انتشارات دانشگاه هران ) .

بگەڕینەوە . پێشتر وتم کە مێژووی شارستانیەت هیچ نیشانەیەکی لەپارس و پارسەکان ، پێش لە دەسەڵاتی داریوش و داگیرکردنی تەواوی ئێران نەدیتوەتەوە و هیچ سەرزەوییەکی بەنێوی پارس لەجوغرافیای کۆنی ئێراندا نەناسیووە و سەلمێندرا کە ئەگەر ئەو ئاماژانەیْ "پارسوا" و "پارسواش" کە لەزمانی ساڵنامەکانی ئاشورییەوە لەمێژوودا ماوەتەوە ، بەنێوی پارسەکانی پاش مێدیاکان بزانین ، خۆیەخۆ سەلماندوومانە کە پارسەکان هیچ کاتێک لەجوغرافیایْ کۆنی ئێراندا وەکوهۆزە ڕەسەنەکان نیشتەجیْ نەبوونە و پاش دەورانی سەرلیْشێواوی و شمشێر وەشاندن بۆشارستانییەتە ئێرانی و نائیرانییەکان ، کۆتوپڕ و بەبیْ هیچ پێشەکییەکی مێژوویی ، ئەوانەی وەکو بناغەدانەرانی ئیمپراتوری ئەدوزینەوە . سەرکەوتنی هخامەنشییەکان بۆدەسەڵات ، تائیستا لە بازنەی سەرسووڕمان وچیروک بۆچوون و موعجیزەدا داپۆشراوە .

**(ئەم زەلامە واتا کورش لە میانەی نهێنییە مێژووییەکانی خۆڵدا نهێنییەکی سەرسووڕهێنەرە.** پرسی خەڵکی ( هیتی ) کەسەردە میک نادیار بوو ، تاڕادەیەک ڕوشن بووەتەوە . شارستانیەتی ( مینوسی ) یەکان کە لە کەنارەکانی دەریای مەزن واتا دەریای سپی‌دا هەڵکەوتبوو ، دیاری‌کراوە و دەوڵەتی هخامەنشی کە پاش کورش سەریهەڵدا بەخەستوخوڵی لەڕووداونامەکاندا تاپۆکراوە ، **بەڵام خودی کورش هێشتا هەر تەماوی و نادیارە و لە سەرچاوەیەکی نادیارشەوە سەری هەڵداوە** ، لەگەڵ ئەوەشدا یەکەمین دەوڵەتی مودێرنی جیهانی پێکهێنا . ناوبراو فیکر و ئارەزوویەکی نوێ خوڵقاند کە ئەگەر بەتەواوی دڵخواز نەبوو ، بەڵام ڕێکایْ مێژووی گۆڕی و جیهانی دێرینە وسەردەمی ئور و کەلدە و فیرعەونەکانی میسر وئاشور و بابۆلیان کۆتایی پیْهێنا . ( علی سامی ، پاسارگاد ، ل ٢٤١ ) ( ١ )

هیرودیت بناغەیْ چیروک و وێنە خەیاڵییەکانی کورشی داڕشتووە و ئەمە وایکردووە کەنرخی مێژوویی "تەواریخ" تا ئاستی‌قسەیْ ئەفسانەوێژی چایخانەکان دابەزێت . نووسراوەکەیْ هێرودیت تێکڵاوێکە لەکەسایەتی و ڕیْ و شوێنی پەرژوبڵاو ، ڕووداوی بیْشوێن وکات و چیروکی بیْواتە کە تەنیا حزر و هۆشی هێلێنیستێک بۆلایْ خۆی ڕادەکێشیْ . بێگومان هیرودیت کە خۆدی خۆی هێلێنیست بوو ، لەژێر کاریگەری ئەفسانەکانی یونان و خۆداوەندە پرژمارەکانیدا کە لەقووڵایی دەریاکان ، لوتکەیْ چیاکان و لەدڵی خاک و ئەشکەوتدا سەریان هەڵدابوو و پێشداوەری غەیبزانان و کاهێنانێک کە هەمیشە دەس‌تێوەردانی مێژوویان کردووە و خەون‌دیتنە سەدان‌جار دووپات‌کراوەکان

کە ڕووداوەکانی جیهان چەواشە دەبینن ، کتێبەکەی بە کۆمەڵی چیرۆکی بێکوتایی ڕازانووەتەوە ، و بەم‌جۆرە یونانیە چیرۆک دۆس و بێکارەکانی لە ڕۆژانی بیکاریدا سەرقاڵ کردووە .

ئەگەر مێژوونووسێک تەنانەت لە ٢٥٠٠ساڵ پێشتردا باوەڕی بەوە بکردایە کە پاڵوانێک دەیتووانی لەسەر پشتی نەهەنگێک سوار بێت و پێش لە کەشتی ئاژاوەچییەکان بگاتە دوورگەی دیاریکراو ، یا لەوانەیە قاترێک بزێت و کۆرپەیەک بهێنێ و یا ئەسپ دەتووانێ لەکاتی پێویستدا مار بخوات ، ئەبێ مێژووی وەها مێژوونووسێک بخرێتە پشت گوێ یا هیچ نەبێ لە وەبیرهێنانی وەکو بەڵگەیەکی مێژوویی خۆمان بپارێزین .

(دیسان کەشتیەکە دەربازی کورنت بوو . ئاریون لەسەر پشتی نەهەنگێک سوار بوو و خۆی گەیاندە تناریوم و لەو شوێنە دابەزی و بە هەمان جلوبەرگی موسیقاوە لەحاڵی سروود خوێندندا دەربازی کورنت بوو و بەسەرهاتی خۆی گێرایەوە . . . لەکۆتاییدا لە مانگی بیستەمی دەسپێکی دوپێچ‌کردندا ، ڕووداوێکی سەرسوورهێنەر ژوپیر کۆڕی مگابیز ، کەیەکی لەوحەفت هاوڕێەی بکوژی موغەکە بوو ، ڕوویدا و یەکی لە قاترە بارکیشەکانی هەنگ (یەکەیەکی سەربازی) زایی و کۆرپەیەکی بوو . . . مار هیرشی بردە سەر کێڵگەکانی دەوروبەری پاتەخت و ئەسپەکان کە خەریکی لەوەڕ بوون بەدیتنی ئەوحاڵ و وەزعە دەسیان کرد بەخواردنی مارەکان) . (هرودت ، تواریخ ، ترجمهٔ وحید مازندرانی ل ٢٦ ٤٨ ٢٥٣)

هێرودیت لەم‌جۆرە مێژوونووسینەدا پێشڕەوی شێوەی مێژوونووسین لەیوناندایە و ئاشیل لاسایی کراوەی ئەو شێوەیە . مێژوویەک کە شیاوی هەردوو جوری شانوگەری ، واتا کۆمێدیا و تراژیدیایە .

شێوەیەک کە دی . اچ . کار دەربارەیەوە دەنووسێ:

هێرودیت وەکو بابی مێژوو وەچەزۆری لێ‌نەکەوتەوە . چوونکە سەرنجی مێژوونوسانی پاش ناوبراو وەکو خودی خۆی لەسەر ڕابوردووی دوور لە ووردبینی و لەسەر داهاتوو ، کەمتەرخەمی بوو . بۆنموونە توسیدید دەنووسی پێش لە شەڕەکانی پلوپونز و دووای ئەوەش کە خۆی لە کتێبەکەیدا بەیانی دەکات ، هیچ ڕووداوێکی گرنگ لەجیهاندا ڕووی نەداوە و ڕوویش نادات . (دی . اچ .کار ، تاریخ چیست؟ ل ١٤٥ متن اصلی ، نیویورک١٩٦١ ،)

مێژووەکەی لە باکووری هەمەدانێرودیت هەڵەی زۆری تێدایە . بە بڕوای ئەوکەنارەکانی دەریای ڕەش

١ خوالێ‌خۆشبوو سامی لەو باوەڕەدایە کە تێکستی سەرەوە بەشێک لە کتێبەکەی ئەسترە ، من لەو کتێبەدا ووتارێکی وەهام نەبینی و لەسەرچاوەیەکی دیکەدا کە ناونیشانی داوە ، نەم دیتەوە . بەڵام ئاشکرایە کە ووتارێکی جیاواز لەنووسراوەیەکی شەخسی ئەو خوالێ‌خۆشبووەیە ، بەڵام ناتووانی گرێدراوی تەورات بێت کە بەڕاشکاوی وتارێکی یکەیە .

لەداوێنی باکووری هەمەدان هەڵکەوتووە و لەو شوێنە کە شتە هەڵکەوتووەکانی جیهان وەکو دیتنەکانی خۆیّ بوو نموونە ئاماژەی پێدەکات هەموو مێشکێکی ئاسایی تووشی سەرسووڕمان دەکات کەبۆچی ئەم هەموو مێژوونووسە بەناو و دەنگەی سەردەم نووسراوە ناڕاست و شێوە ئەفسانەکەی هێرودیتیان کردووەتە پەسنی مێژووی ئێران و بە پاڵدانەوە بەو نووسراوانەوە هۆزە ڕۆژهەڵاتییەکانیان بەبێ مێژووداناوە و بە دووپات کردنەوەیّ ئەفسانەیّ ئورارتویی، حیلکەی ئەسپێک لەکاتێکی دیاریکراودا داریوش وەکو بنەچەیّ سەرهەڵدانی ناوبراو بەیّان دەکەن؟.

(لە عارستان و بەرانبەر بە باژێری بوتو شوێنێک هەیە کەبۆ پرسوجۆ سەبارەت بە مارە باڵدارەکان دەربازی ئەو شوێنە بووم. ئێسکی ئەم گیانلەبەرانە بەڕادەیەکی زۆر لەسەریەک کۆگا کرابوون. هەندیّ لەوانە گەورە و هەندێکی دیکەی زۆر بچووک و بەکۆمەڵ شوێنێک کە ئە ئێسک و پروسکانەیّ تێدا کۆبووبەوە لە دەربەندێکی باریکی کویستانیدا هەڵکەوتبوو کە لە پادەشتێکی کەنارەکانی رووباری نیلدا کۆتایی پێدەهات. کاتیّ کەمارە باڵدارەکان لە چۆڵاییەکانی عارستانەوە بولایەنی میسر دەفرین، لەقلەقەکان بەریان پێدەگرتن و بە کوشتنی ئەوانە، نەیاندەهێشت بوڵایەنی ناوملانەکە بفرن. عارەبەکان ئەڵێن لەبەر وەها قازانج و خزمەتێکە کە نرخ وڕوومەتی لەقلەقەکان لەمیسر بەوڕادەیە فراوانە و خەڵکی ئەوڵاتەش دان بەڕاستبوونی ئەم مژارەدا دەنێن. ڕەنگی هەموو ئەوڵەقلەقانە ڕەش، لاقیان وەکو دوڕنا و دەنووکیان چەماوە و باڵکێش وبەقەد ئابچلیکێک؟ دەبێ ماری باڵدار لەماری ئوی دەچیّ و باڵەکانی بێپەڕن و نموونەیّ باڵی شەم شەمە کوێرەن.) (هرودت، تواریخ، ل ١٤٣)

هێرودیت ئەڵی ئەو مارە باڵدار و لەقلەقە دەنووک چەماوە و ڕەشانەیّ بینیووە! ئەم چیرۆکەدەیسەلمێنێت کە هێرودیت گەڕاڵ نەبووە، و ڕاگەیێندنەکانی لەمبارەوە ناڕاستە(١) و لەوانەیە کە ناوبراو بە گەڕانەوەیّ مێژوو لە گۆڕپانە گشتییەکانی وڵاتاندا کە خەڵکانی یونان و ئیتالیا زۆر حەزیان لێکردووە، کەسابەتی کردبێت و لەوڕێگاوە ژیابێت. ووردبینی لەوەرگرتنی ئەفسانەکان لە تەواریخی هێرودیتدا، کە نیوەیّ کتێبەکەیّ پێکهێناوە، بەجوانی بلیمەتی قسەگەڕانەوەی ناوبراو نیشان ئەدات و ئاشکرایّ دەکات، خەریکی داگیرکردنی هەست و هۆشی بیسەرەکانییە. بەشێکی زۆر لە"تەواریخ" ڕێکوپێک کردنی بیرەوەری ڕێبوارانێکە کەلەنەزانین و بێبەری لەئاگاداری دنیای کۆندا، هەموو

١ ـ بە چ شێوەیەک هێرودیت بەمێژوونووس یا گەڕۆکی سەرزەوییە ڕۆژهەڵاتییەکان بزانین لەحاڵێکدا تێکستی خوارەوە نیشانی ئەدات کەلە ژیانیدا حوشتری نەدیتووە. پێویست نییە من لێرەدا حوشتر بناسێنم، چوونکە یونانییەکان لەگەڵ قەبارە و هەیکەلی ئەم گیانلەبەرە ئاشناییان هەیە بەڵام بەخاڵێکی تایبەت ئاماژە دەکەم تابۆمان دەرکەوێت کە ناوبراو(هێرودیت؟) تازەیە. هەرکام لەلاقە دووایییەکانی حوشتر، دووران و دوو ئەژنۆیان هەیە(!). (هرودیت تواریخ ل ٢٧٢)

شتێکی نەشیاو و نەکراویان لەسەرزەوییەکانی ئەوپەڕی دەریا و چیاکاندا مۆمکین و مەیسوور دەخستە پێش چاو و ئەمە بیری هێلێنیستی هێرودیتە کە ئەوانەی ڕازاندووەتەوە .

ئەم پێکهاتەیە لە نووسراوەکانی هێرودیتدا کە گەڕۆکێکی یونانی بوو زۆر جوان ڕەنگی داوەتەوە: مێژووی ڕووداوەکان تێکەڵ و پێکەڵە . زۆرجار چیرۆک ووتن جێگای مێژوو دەگرێتەوە و ئەو چیرۆکانەش کە لە شێوەیەکەوە بۆ شێوەیەکی دیکە گۆڕیووە ، بەڕادەیەک ئاڵۆزە کە بەدژواری دەتووانین ئامانجەکانیان لەیەک بدەینەوە . سەرەڕای ئەمانەش یۆنانییەکانی سەردەمی کون عاشقی شتانی نائاسایی و باڵکێش بوون و لەبەر ئەوەی کە میسر بەسەرزەوینی موعجیزات و شتانی پرسەرنج دەناسرا گەرەکیان بوو شتی ئاساییش بە شتی گرنگ و نائاسایی بناسێنن ، یا شتی بەرز و جیاواز بخەنە لای سەروی شتە ئاساییەکانەوە ، ئەم خاڵەش لە ووتەکانی هێرودیتدا بە زەقی دەرئەکەوێ . ووتەکانی هێرودیت دەربارەی ئاشوری و بابوڵیەکانیش هەروایە ،بگرە خراپتریش . لەکۆتاییدا ئەبێ ئەوەش بزانین کە سەفەرەکەی هێرودیت لە ڕۆژهەڵاتدا زۆری نەخایاندوە : لەوانەی سێ تا چوار مانگ لەمیسر مابێتەوە . خۆدی هێرودیت ئەڵێ سەری لە بابوڵ داوە بەڵام هەندێ لە زانایانی نوێ لەسەر ئەو باوەڕەدان کە هیچ کاتێک لەو شارە نەبووە . هێرودیت ئەڵێ زۆرجار زانیاری لە کاهینەکان وەرگرتووە بەڵام پێ ناچێت کە سەرچاوەی لێکۆڵینەوەکانی لە بابوڵ و میسر ، لە پێشەوا پلەبەرزەکان بووبێت . . . و دیار نییە نووسراوەکەی هێرودیت لە سەردەمی کۆندا بە چ شێوەیەک هەڵسەنگێردراوە ، ئەبێ ئەوە بزانین کە بیروڕای هەندێ لە زانایان وەکوو "بێر" ، "کروگر" و "ستین" هێرودیت نووسراوەکانی کاتی یاری وەرزشی ئولەمپ لە ئاتینیا بۆ یونانییەکان خوێندووتەوە . هەرچەن لەوانەیە کە بەڕێوە چوونی یارییەکان لە چیای ئۆلەمپ گۆمانی لەسەر بێت ، بەڵام ئەوانە لە ئاتێنیا بەڕێوە چو .چوونکە "ئوسیوس" ڕووداو نووسی بڕوا پێکراوی سەدەی سێهەمی زاینی ، دەربارەی یارییەکانی ساڵی ٤٤٥ یا ٤٤٦ ی پێش زاینی ئەڵێ : هێرودیت کتێبەکەی بۆ خەڵک خوێندەوە و سەبەرزییەکی مەزنی بەدەس هێنا . (فصل ٨٣ بند ٣-٤) پلوتارک لەزمانی "دی ئیل" مێژوونووسی ناوداری یونان (سەدەی سێهەم پ ز) ووتوویە: ئاتینییەکان بەرانبەر بە پەسن و تاریفەکانی هێرودیت دەربارەی ئەوانە . ١٠ تالان دەس خوەشانەیان پێداوە . هەرچەند دەربارەی ئاستی ڕادەی دەس خوەشانەکە بەدڵنیاییەوە زۆرپێژی کراوە ، چوونکە ئاتێنیا لەو کاتەدا بەو ڕادەیە دەوڵەمەند نەبووە کە بۆ کتێبێک ١٢٠٠٠ تمەنی ئیستا پێشکەشی ناوبراو بکات . بەڵام :امازەی مێژوونووسی ناوبراو دەیسەلمێنێت کە شتێک ڕوویداوە و شتێکیش ووتراوە . دیون خری سس تم ووتوویە کە هێرودیت بۆ کتێبەکەی هەندی پارەی لە کرنێتییەکان داخواز کرد و چوون لە وڵامدا ووتیان کە ناونیشانی چاک شتێک نییە کە لەبازارەکاند کرین و فروشتنی لەسەر بکرێت ، هێرودیت ڕوانگەیەکی سلبی سەبارەت بەوانە گرتە پێش و لە شوێنێک لە کتێبەکەیدا ، کاتێک مێژووی شەڕی سالامین دەنووسێ خراپی پێ ووتوون . (پیرنیا ، ایران باستان ، ل ٦٨ و ٦٩) .

لەوانەیە ناوبانگی هیرودیت وەکو قسەبێژی مێژوویی هاوڵاتی یونان، کە بەڕاسپاردەیٚ مشتەری مێژوو ئەڵێ، سەرنجی ئەردەشێری یەکەمی بۆ ڕێکوپێککردن و نووسینی مێژوویەک کە ڕەچەڵەک نامەیٚ ناوبراو بسەلمێنێت، ڕاکیشاوە. ئەمە هەمان ئەردەشیرە کە تاوانی نووسینی نووسراوە سەختەکەیٚ ئاریا ڕەمن و ئارشامی بەستۆیە، بەو ئامانجەوە کە هەبوونی وەها ڕەگەزێک لەسەر دەمی کۆندا بەرژێنێتە قالبی ڕاستییەوە. ئێمە لە پەیوەندی نێوان هێرودیت و سەرچاوە هەواڵ هێنەرەکانی ناوبراو ئاگادارین و دە زانین کە مێژووەکانی هێرودیت لە پلەیٚ یەکەمدا ووتنەوەیٚ شێوە ئەفسانەیی ژیان و داگیرکەریی چوار کەس لەپادشا سەرەتاییەکانی هخامەنشیی، واتا کورش، کەمبوجیە، داریوش و خەشایار شایە و لەگەڵ بەڵگەنامەکانی دەوڵەتانی هخامەنشیدا هاودەقن. لەبەر ئەوە کە هێرودیت لەوپەڕی جیهانەوە بۆ تاپۆکردنی مێژووی هخامەنشییەکان هەوڵێکی وەها پڕهەرا و گەنگەشەیٚداوە، گومانی ڕاسپاردە بوونی ئەو مێژووە دووقات دەکاتەوە، بەتایبەت کە بەڵگەنامە یونانییەکان ئەوانەیان بەبەربەر زانیوە و هێرودیت قورساییەکی زۆرتر بە ڕەگەزنامەیٚ کورش و داریوش ئەدات کە لەگەڵ شێوەیٚ بەیانی بەرانبەر بە خەشایار شادا جیاوازی هەیە. ئەم گریمانە کە کە هێرودیت لەگەڵ زانایانی ئاگادار لە وەزع و حاڵی ئێراندا پەیوەندی هەبووە ئەوە دەسەلمێنێت کە ناوبراو زانیارییەکانی لە پێناوی سەفەرکردن بۆڕۆژهەڵات دەس نەکەوتووە و ئەبێتە هۆیٚ ئەم لێکدانەوەیە کە پێدەچیٚ هێرودیت لەگەڵ کەسانی ئاگادار لە دراوسێیەتی یونان یان نێوخۆیٚ ئەووڵاتەدا پەیوەندی بووە و لەوڕێگاوە دەربارەیٚ مێژوو و بارودۆخی ئێران زانیاری دەسکەوتبیٚ. هەروەها دەشکرێت سەرچاوەیەکی ئێرانی نیشتەجیٚ یونان لەم بارەوە یارمەتی هێرودیتی دابیٚ. هیرودیت لەسەر ڕاستکردنی ئەم ڕوانگەدا، لە کتێبی سێهەمی مێژووەکەیدا نووسیویە کە زوپوروس (زوپیر) کوڕی مگابوزوس (بابوخش) پاش دوورکەوتنەوە لە وڵاتەکەی لە شاری ئاتینیا نیشتەجیٚبوو. **هەروەها کە ئاگادارین زوپیر یەکی لە نزیکەکانی بارەگاکەی خەشایار بووە و دوور نی یە بەشیٚ لە پێکهاتەیٚ مێژووەکەیٚ هێرودیت لە ناوبراوەوە وەرگیرابێت** (هرودت، تواریخ، ترجمه وحید مازندرانی ل ٤)

کاتیٚ کە سەرچاوەکەی هێرودیت ئەندامێکی بارەگایٚ هخامەنشییەکانە، ئیتر ناتووانین مێژووەکەیٚ بەبەڵگەیەکی بڕواپێکراو بۆ هەڵسەنگاندنی مێژوویی ئەوٚ زنجیرەیە بزانین. بە ئاشکرایی دەبینین هێرودیت لەبارەیٚ هەمووشتێک و هەموو کەسێکەوە ووتاری مەیدانی و تێکەڵ پێکەڵ ڕادەگەیەنیٚ،

سەبارەت بە دەسپێکی هخامەنشییەکان بەشێوەیەکە کە نووسراوەکەی بێستون دیسـان دەخوێنێتەوە.
من دڵنیام کە هێرودیت ڕاستەخۆ لەناوەڕۆکی نووسراوەکەی بیستووندا ئاشنا نەبووە و لەم حاڵەیشدا هاودەق کردنی ووردی تەواریخ لەگەڵ ئیدعاکانی ئەم نووسراوەدا دیسانەوە هەستیاری و دووبارە خوێندنەوەی سەرچاوە و هەواڵەکانی پارس، سەبارەت بە تەواریخی دووایی هێرودیتە. و ئەمە لە ناوەڕۆکی ئەم چەمکەی خوارەوە بەدۆرستی خۆی نیشان ئەدات کە ڕوانگەی گشتی (عامیانە) لە دەروونی هێرودیتدا تەنانەت لە هەڵسەنگاندنەکانی پێشتریش بەربڵاوترە و سەرنجی ناوبراو لەسەر هخامەنشییەکان ووردبینییەکی پشکێنەرانە و مێژوونووسانە نییە، بەڵکو جۆرێک لە کەسابەتە.

"هەموو خێڵە هێندییەکان کە ئاماژەمان پێکرد وەکو ئاژەڵان لەبەرچاوی خەڵکەوە تێکڵاو و نزیکییان دەکرد. پێستی لەشی ئەوانە وەکو یەک و نموونەی پێستی خەڵکی ئاثیوپیایە. **ئاوی (نۆتفە) ئەوانە وەکو مرۆڤی ئاسایی سپی نییە، وەکو پێستی لەشیان ڕەنگەکەی ڕەشە.** هەرئەم حاڵەتە سەرسووڕهێنەرە لە نێوخەڵکی ئاثیوپیاشدا دەبینرێت ... لەم چۆڵاییەدا جۆرێک لە مێلورە دەژیت کە کە چکۆلەتر لە سەگ و گەورەتر لە ڕێوییە نموونەی ئەوانە کە لە هەرێمەکە ڕاوی دەکەن لە بارگاکەی پادشای پارسدا دەتوانرێت ببینرێت!. ئەم گیانلەبەرانەلە ژێر زەوییەوە ڕەهەند دەکەنن و خاک و خۆڵەکەی دەرێژنە ئەولایەنە کە مێلورە ئاساییەکان دەیرێژن و کۆگاشی دەکەن. شکڵ و شەباهەتی ئەوانە وەکو مێلورەکانی دیکەیە. (هرودت، تواریخ، ل ۲۲٦).

خاوەنی ئەو بیرەوەرییانەی سەرەوە و زۆر بێ ماناتر لەوانە لە ئاستێکدا نین کە بەمێژوونووسیان بزانین و لە دۆخێکدا ناژین کە پشکنینی پرسی هخامەنشییەکان مەبەستیان بێت. هێرودیت هەرچەن تاکۆتایی ژیانی ئەردەشیر ژیاوە، بەڵام یەک وشەی دەربارەی ژیانی دوور و درێژ و پڕ ڕووداوی ناوبراو نەنووسیوە! ئەم باسە پەیوەندی بە خوشەویستی ئەردەشیر لە دەروونی هێرودیتدا هەیە و ئاشکرای دەکات کە هێرودیت تەنیا دووبارەنوسینی وێنەچیرۆکی ئەو زانیارییانە بووە کە دەوروبەرییەکانی ئەردەشیر پێشکەشیان کردووە تا دێرینەبوونی ئیمپراتورییەکەی پێ بسەلمێنێت.
لەگەڵ ئەوشدا هەموو ئەفسانەکانی هێرودیت دەربارەی بناغە و دێرینەبوونی ئیمپراتوری هخامەنشییەکانە و ئەمەش نیشانەیێکی تر لە فەشەل بوونی بناغە دانەرانی ئەو ئیمپراتورییەیە، چوونکە لە بەڵگەنامە و زماندا ڕۆشن ئەبێتەوە کە هێرودیت نووسینی تەواریخی ۸۰ ساڵ پاش کورش دەس پێکردووە، بەڵام هێرودیت بۆچی لاسایی وڵاتانی ئاشور و بابۆلی نەکردووەتەوە کە ڕووداوەکانی ساڵانی

ئەردەشیریش وەکو جەماوەر شتێکیان لەم بارەوە نەزانیوە . لەبەر ئەوە ژیانەوەی ژیانی ئیمپراتوریان ڕاسپاردەی زەینی چیرۆک بێژی مێژوونووس کردووە ، ئەگینا ژیان و مردنی یەکەمین و مەزنترین ئیمپراتوری جیهان کە دەسەڵات و توانایەکی نائاسایی پێشکەش بە مێژوو کرد ، شایانی ئەوە هەیە کە زۆرتر لە ئەفسانە و چیروک لەبارەیەوە بنووسی .

یەکی لە گرنگترین تایبەتمەندییەکانی مێژووی هخامەنشییەکان ئەوەیە کە پارسەکان بە پێچەوانەی زۆربەی هێزە داگیرکەرەکانی جیهانەوە هیچ جۆرە شایەتێکی نووسراوەیان بۆ سەلماندنی ناوەڕوکی چیرۆکەکانی پاش خۆیان بەجێ نەهێشتووە . هەروەهائەو خاڵەش جێگای سەرنجە کە پادشاه مەزنەکانی هخامەنشی بەپێچەوانەی پادشاکانی ئاشور ، بۆ تاپۆکردنی کردەوە پاڵەوانانەکانی گۆرەپانی شەڕ یا دیمانەی نەچیروانی ، فەرمانی نووسینی ( ساڵنامە ) یان دەرنەکردووە . ئێمە چ نیشانەیەکمان لە ڕووداوە ڕۆژانەکان لەکاتێکی دیاریکراودا بەدەستەوە نی یە کە بویەرنووسێک بە ئەمری پادشا بەناوبانگەکان نووسیبێتی . ( بریان ، تاریخ ئیمپراتوری هخامەنشییەکان ،ل ٤٩ )

نەبوونی ساڵنامە لەبارەگای هخامەنشییەکاندا ، نیشانی لەبێ مەیلی و نا ئاشنایی ئەوانە سەبارەت بە نەریتەکانی رۆژهەڵاتی ناوڕاستەوە هەیە و لە هۆکارێکی سەرەکی دیکە کە لە کۆتایی ئەم نوسراوەدا ئاماژەی پێدەکەم . تەواریخی هێرودیت وەهایە کە مرۆڤ وادەزانێ تەنیا بەرپرسایەتی سرینەوەی کەموکووڕی ڕەگەزنامە ئیمپراتوری لەسەرشانە و ووردبینی هێرودیت لە جی گیرکردنی پیشینەی کۆنی هخامەنشییەکاندا بەتەنیا پشتی بە بەردە نووسراوەکانەوە بەسراوە و دەربارەی سەرهەڵدان و داگیرکەری ڕۆژهەڵاتی ناوڕاست لەلایەن کورشەوە ، ڕوونکردنەوەیەکی نی یە ، مەگەر پاڵدانەوە بە ئەفسانە و خەیاڵەوە ، کە ئەوەش ئەبێ بە هۆی گاڵتەجاڕی و پێکەنین . بەڵام بەداخەوە ڕۆژهەڵات ناسان و مێژوونووسانی خۆدی شێتگیرانە لەسەر نرخ و ڕوومەتی ئەو ئەفسانەگەلە پێ دادەگرن و بەم جۆرە هاوولاتیانی ئێرانی بوگەڕیان بە دووای مێژووی بەبەڵگە و سەلمێدراوی ئێرانی دێرینە ، لا ئەدەن و ناچاریان دەکەن باوەڕە ئەفسانەییەکانی هێرودیت بروا پێبکەن . هێرودیت خراپەی پارسەکان ناخاتە ڕوو و لەهەرشوێنێکدا بەڵگەیەکی ئێرانی کە باسی پرسێکی ئێرانی دەکات و هێرودوتس ئاماژەی پێکردووە ، دۆرستی ووتاری نووسەری ئەو بەڵگەیە ئاشکرا دەبێ . پشکنینە دێرینەناسییەکان و بەتایبەت بەڵگەکانی بابۆلی نوێ و **بەردە نووسراوەکەی بیستون و بەردە داتاشاوەکانی تەختی جەمشید ڕاستی**

**نووسراوەکانی ناوبراو سەرڕاست و پلەی زانست و قۆرسایی کەسایەتی ئەوبەرز دەکەنەوە.**
هەر ڕۆژێک کەتێدەپەڕێ قۆرسایی کەسایەتی هێرودیت زۆرتر خۆی دەنوێنێ و **کاتێ بەبیری دێنینەوە کە زۆربەی زانیارییەکانمان دەربارەی هخامەنشییە سەرەتاییەکانە، تا مردنی خەشایار شاه لەسەر قسەکانی هێرودیتەوە دانراوە بۆمان دەرئەکەوێ کە تا چڕادەیەک قەرزداری ناوبراوین.**
(ع شهبازی ،کورش بزرگ ، ل١٩) .

وەکو ئەڵێن منداڵانی هەنووکەیی ئەم بابەی مێژووش ، یاخی بوون لە مێژووی ڕاستەقینە و تەنانەت فرۆشتنی مێژوویش ، هەر لەم باوکەوە فێر بوون . ئەگەر دەربڕینی مێژووی ئێرانی سەردەمی هخامەنشی هەر ئەوە بێت کە خۆدی هێرودیت لەزمانی ڕاوێژکەرانی بارەگای پارسەوە نووسیویە ، بە دووبارەکردنەوەی هەمان چیرۆک و ئەفسانە مرۆڤ دەتووانێت دڵنیا بێت کە کورش لە هیچەوە و لە بێ‌ناو ونیشانی تەواوەوە و بەبێ ئەوە خاوەنی سەرزەوینێک بێت و بێ پەیوەندی مێژوویی و جوغرافیایی لەتەک بەرزاییەکانی ئێراندا ، لەپڕ و بەڕواڵەت بەیارمەتی دەیان یارمەتیدەری جادوویی بەسەرهات ، بازیبردووەتە سەر تەختی یەکەمین دەسەڵاتی ئەوکاتەی جیهان .

ڕووداوێک کە لەوانەی ڕی بکەوێت ، بەڵام تەنیا بە شێوەیەک کە لە بەشی کۆتایی ئەم کتێبەدا دەیخەمە بەردەس . **بۆچی کورش ؟ ـ بەڵگەنامە ڕێکوپێک و درێژ ماوەکان :** تێکچونی پڕ لە زەبر و زەنگ و دڵەڕاوکی ئیمپراتوری ئاشور لە دەوروبەری ساڵکانی ( ٦١٢ـ٦١٠ کەوتنی نەینەوا ) لە بەرانبەر هێزەکانی مێدیا و بابۆلدا ، هەندێ جار وەکو ریسواییەکی مێژوویی یادی لێکراوە . لەم باسەی بەردەستماندا بەجوانی دەتووانین سەرهەڵدانی کوتوپڕی پارسەکان لەڕۆژهەڵاتی ناوڕاست و شەڕ و پێکدادانی کورشی مەزن ـ کورشی دووەم وەکو ڕووداوێک تماشا بکەین کە پرسیارەکانمان بەرادەی هەمان تێکچوونی شاردراوە و نادیار ، بەرانبەر مێژوونووس بکاتەوە . لەڕاستیدا ، ئەرتەشەکانی پارسی بەدرێژایی دوو دەهە ( ٥٥٠ ـ ٥٣٠ ) بە سەرکردایەتی کورش دووەم هەرێمەکانی ژێردەسەڵاتی مێدیا ، لیدیا و بابۆلی نوێ یان داگیرکرد و کردیان بە پێشەکیەک بۆ داگیرکەری و دەسەڵاتداری لەبەرزاییەکانی ئێران و ئاسیای ناوین . **چۆن ئەبێ سەرهەڵدانی پردە سەڵات و کۆتوپڕیهۆز و دەوڵەتێک کە لە کردەوەدا نەناسراو بوو، لە گۆرەپانی مێژوودا ڕۆشن بکرێتەوە؟ بەچ شێوەیەک ئەم هۆزە لە یەکەمین پلەی سەرهەڵدانیاندا وەها سەرکەوتنیکی پڕ سەرنجیان بەدەس**

**هێنا و توانیان لە دەسپێکی پادشاهی کورشدا ئەو هەموو ئامێر و ئامرازە هۆنەری و عەقڵییە بەکاربێن و دەسکەوتێکی سەرسوور هێنەر وەکو پاسارگادی پێ بخوڵقێنن؟.**

مێژوونووسێک کە بۆکارێکی درێژخایەن ئامادە دەبێ باش دەزانێ کە پادشاهییەکی پرشکۆ و رووداوێکی گرنگ و نەمر لە مێژوودا، پێویستە رەگوریشەی لە رابوردوویەکی دەوڵەمەنداچەقی بێت. پولیب مێژوونووسی (هلنی) کە ئاگاداری ئەم راستییەیە لە نووسراوەیەک بە نێوی "پێشەکییەک بۆمێژوو" وەبیری خوێنەرانی دەهێنێتەوە کە بو تێگەیشتن لە وراستییە کە دەوڵەتی بێ پێشینەی رۆم لە چ رێگایەکەوە بۆ داگیرکردن و فەرمانرەوایی لە زۆرینەی سەرزەوییە یە ئاوەدانە کاندا، بۆماوەی ٥٣ سال سەرکەوتنی بەدەس هێنا، پێویستە بۆ سەردەمە پێشووەکان بگەرێنەوە. و دیسانەوە ئەڵێ، کاتێ خوێنەر چووە ناخی نووسراوەکانمەوە ئیتر بۆ تێگەیشتنی رەوشتی رۆمییەکان لە رێکوپێک کردنی نەقشەکانیان تووشی کێشە نابێت و دەزانێ کە ئەو دەوڵەتە لە چ ئامرازێکی نیزامی و سەرچاوەیەکی مادی بۆسەرکەوتن لەو کارەساتە گەورەدا کەڵکی وەرگرتووە و لەو ماوەدا یاساکانی خۆێ بەسەر دەریاکان و هەرێمەکە ماندا فەرز بکات لەسەر ئەم بناغەیە، بۆ چوونە نێو مێژووی پارسەکان، خوێنەر ئەبێ بزانێت کە سەرکەوتنەکانی کورش جیاوازو بەبێ هەبوونی دەوڵەتێک کە لە رێکخراوەیەکی بتەو ئەرتەشێکی تەیار و پەروەردە کراو، دەسەڵاتی پادشاهییەکی جێ گیر، پەیوەندی زۆر و جۆرواجۆر لەگەڵ نەتەوە و پادشاکانی رۆژهەڵاتی ناوراست و (ئەژەیی) بەدەسهاتووە و بیرکردنەوە بەوەها سەرکەوتنێک دوور لەراستییە. **پیرۆزی بەربڵاوی لەوجۆرە ناتوانێت تەنیا بە پاچەقاندن و بریاری یەک لایەنەی بێ نرخ، هەبوونی دەوڵەتە تێکشکاوەکانی بندەستی کورش پاسا بکات و پێداویستی بەوە هەیە کە ئەو بێ نرخییە رۆشن و چونیەتی ئەوانە دیاری بکرێت**. هەروەها ناتوانین جیهانگیرییەکانی کورش ئاسانی ئەم گریمانە ساکار و بچووکە نزم بکەینەوە و بریاری سەردەستی مافدارانەی هۆزێکی خێوەت‌نشین بە سەر خەڵکانی نیشتەجێدا دەربکەین. بەکورتی هەر جۆرە بیرکردنەوە و توژینەوەیەکی مێژوویی لەوجۆرە پاڵمان پێوە دەنێت کە باوەر بکەین، سەرهەڵدانی کورش نەتەنیا خاڵی دەس پێکی یەکەمین ئیمپراتوری جیهانە کە لەلایەنی سیاسییەوە پانتاییەکی بەربڵاوی، لە دەریای ئەژەوە تا لێوارەکانی (سێند)ی یەکپار چە و یەک گرتوو کردووەتەوە، بەڵکو لە هەمان حاڵدا ئاکامی پروسەیەکی دووو درێژە کە ئێمە دەربارەی چۆنیەتییەوە کۆمەڵێ ئاگاداری ناتەواو و بچربچر و هەڵسپێراومان هەیە (پی‌یر بریان، تاریخ ئیمپراتوری هخامنشیان، ل٦٥)

لەوانەیە کورش هۆزە نیشتەجێیەکانی نێوان دەریای ئەژە و لێوارەکانی سێندی "یەک پارچە" کردبێت، بەڵام بەبۆنەی سەرهەڵدانی پاشتری ئەو هۆزانەوە یەکگرتوویانی نەکرد. ئەم هەڵەی بریانە کە بخەینە پشت گوی بێگومان بنرخترین بەشی کتێبەکەی ئەم وەرزەیە کە بە چەمکی "پێشەکی" نووسراوە و بە

هۆێ ئەوەوە لە ڕوانگەی جۆربەجۆرەوە سەرسووڕمانی خۆێ لە سەرهەڵدانی کورش و هۆکارە پووچەڵەکەێ دیاری دەکات . ناوبراو کە ئەم بەشەێ بە توانایی و لێهاتووییەوە ڕازاندووەتەوە ، لە کۆتاییدا هەربەۆ سەرسووڕمانەوە دە نووسێ :

(٨ . **ئاکام :** سەرەڕاێ هەموو ئەمانە دیسان پرسیارێک کە لە دەسپێکی ئەم وەرزەدا پێشکەشم کرد" بۆچی کورش"وڵامێکی دڵخوەشکەری بۆ خۆێ نەبینییەوە . شتێک کە دەتوانرێت بکرێت ، کۆ کردنەوەێ کۆمەڵێک زانیاری ناتەواو و دژبەیەکە کە لەگەڵ وێنە و هەستدا تێکڵاو بووە و بەم زانیارییانەوە ناکرێت تەنانەت سنووری ڕواڵەتی ڕاستییەکانیش تێپەر بکرێت . هەڵسەنگاندنی قۆناخی داگیرکردنی وڵاتان بەدەستی کورش ، لەخۆێدا دەتوانێت ڕۆشناییەکی تازە بخاتە سەر پرسەکان ، بەڵام لەم حاڵەتەشدا ریسکی پێشداوەری ڕووداوەکان ، لە جۆری ئەوانەێ دیدور سیسیلی لە ئارادایە کە دەنووسێ :کورش کوڕی کەمبوجیە و ماندانا ، کچی ئاستیاگ پادشاێ مێدیاکان بوو ، لە بوێری و هۆشمەندی و جیاوازییەکانی دیکەدا نموونەێ سەردەم و سەدەکانی دیکەش بوو . چوونکە بابی ناوبراوی بە شێوەێ پادشاهان پەروەردە کردبوو و لەم ڕێگاوە کورشیبۆبەدەس خستنی گەورەترین دەسکەوتەکان ئامادە کرد و ئاشکرا و ڕۆشن بوو کە بەهۆێ بلیمەتە جیاوازەکانییەوە"arete"زۆرتر لە تەمەنی دەێنواند و لە داهاتوودا بە ئەنجامی کردەوەێ زۆر گرنگ هەستا (کتێبێ نۆهەم) ٢٢ .

بەهەرحاڵ ئێمە بەبێ ئەوەێ بمانەوێ وەکو دیودورسیسیلی لە پێشەوەی ڕووداوەکانەوە ڕێکەوین ، ئەبی قبوڵی بکەین کە هیچ زانیارییەکی ڕۆشنمان لە ئارەزوو و نەقشەکانی کورش پاش داگیرکردنی تەختی پادشاهی نییە ، وهەروها شتێک لەوماوەێ ١٠ ساڵەێ پێش لە شەڕی پارس و مێدیا کە پادشای پارس بوو ، نازانین . ئایا کورش لە شەردا دەس پێشخەر بوو ؟ نازانین ! . چوونکە بەڵگەنامەکان ڕاستەخو یان بە پێچ و پەنا لەم بارەوە ئەدون و سەردەستی شەڕ لە ساڵەکانی ٥٥٠ پ.ز ، بە ئاستیاگەوە گرێ ئەدەن وچەن ساڵ پاش ئەوەش بە کرزوسەوە . ئایا داگیرکەرییەکانی کورش بە گویرەی نەقشەیەکی داڕێژراو و لە هەموو لایەنێکەوە هەڵسەنگێردراو بەڕێوەچووە یان قۆناخەکانی ئەو سەرکەوتنانە لە سەر بناغەێ یەکەمین ئاکامی شەڕەکان و

بەرانبەرکی لەگەڵ گۆڕینی تاکتیکەکانی دوژمندا ؟ . **ئەمە پرسێکە شاردراوە و نەزانراوە** که مێژوو نووسانی دیکەشی بۆدۆزینەوەی بیانووی داگیرکەرییەکانی ئەسکەندەر و گەشەکردنی ئەمپریالیستی ڕۆما هەڵخراندووە ، وئەمە باسێکە کە بەڵگەنامە بڕوا پێکراو و فراوانەکان دانی پێدا دەنن . (پی‌یر بریان ، تاریخ امپراتوری هخامنشیان ، ل ٩٦ و ٩٧)

بێگومان تەنیا لەم کتێبە و بەم‌شیوەیَ توێژینەوە لەبناغەی مێژووی ئێراندا هەیە کە دەتووانین وڵامێکی شیاو بۆسەرکەوتنە موعجزەدارەکەیَ کورش ببینینەوە وبێژین ، مێژوو کاتێک ناوبراو بەیاد دەهێنێتەوە کە بابۆلی داگیرکرد . بەڵام چۆن تووانیویە دەرەقەت خەرج و مەسرەفی شەڕ ، دابین‌کردنی لۆجیستیکی ، دامەرزاندنی نەقشەکیش ، هێزی نیزامی و بەڕێوەبەری پێویست ، و بە قەولی بریان ، (ئامێر و ئامرازی هونەری و عەقلی) بۆ وە ها سەرکەوتنێک بێت ؟ . پادشاهێک کە سەرزەوینێکی نەبووە کە سامانێک پاشەکەوت‌بکات ، و شار و بازار و کێڵگەیەک و بەرهەمێک بەنێوییەوە تاپۆ نەکراوە ، تا بە وەرگرتنی باج لە خاوەنەکانیان ، پاشەکەوتێک بۆ پەلامار و داگیرکەرییەکانی دووایی ئامادە کردبێت . کەوابو لە چ‌ڕێگایەکەوە پێداویستییەکانی شەڕی دژی بابۆل و مێدیا و لیدیا ، ئیلام ، ئاشور ، و سەرانسەری ئێرانی دێرینەی بەدەس هێناوە ؟ . (لەڕێگای خەیانەت‌وکودەتاوەـوەرگێر)

لەگەڵ ئەوەشدا ڕەچەڵەکنامەیەک کە کورش بۆخویَ هەڵیبژاردووە زۆر خوێنەویستانەتر و سنووردارتر لەوەیَ داریوش لە بەردە نووسراوەکەی بیستوندایە . مێژوو لەگەڵ نێوی کورشدا تەنیا پاش بەدەسهێنانی دەسەڵات ئاشنا دەبێت . لە ئامادەبوونی مێژوویی وسەلمێندراوی ناوبراو تەنیا هاوکاتی گەیشتنی بەدەروازەکانی بابۆل ئاگادارین و بەڵگەیەک کە ڕاستی مێژووی سەردەمی دەسەڵاتداریەتی کورش (٥٥٩ ـ ٥٢٩ پێش زایینی) سەرڕاست‌بکاتەوە ، بەدەستەوە نی‌یە . ئیستا ئەم ئیمپراتورییە داسەپاوە دەیهەوی ڕەچەڵەکنامەکەی بەشێوەی نەریتەکانی هەرێمەکە بناسێنی .

وەهایە کە لە گڵە نووسراوە بەناو دەنگەکەی کورشدا کە لە بابۆلدا دۆزراوە تەوە ، دەیخوینێنەوە :

"من کورشم ، پادشای جیهان پادشای گەورە ، پادشای بەهێز ، پادشای بابۆل ، پادشای سومەر و ئەکەد ، پادشای چوارگوشەی جیهان ، کوڕی کەمبوجیە ، پادشی گەورە ، پادشای ئانشان ، کوڕەزای کورش شای گەورە ، پادشای ئانشان ، کوڕەزازایَ چیش پیش پادشایَ گەورە پادشای "ئانشان لەتوخمی پادشاهییەکی نەمر ، ئەو پادشاهییە کەخوداوەند و نبو خوشیان دەویَ و بۆ شادمانی دڵی خوێان ، دەخوازن کە ئەو پادشاه بێت .

(عبدالمجید ارفعی ، فرمان کورش بزرگ ،ل ۱۷و۱۸)

پێشتر ووتمان کە ئانشان بەشێک لە سەرزەوینی ئیلام و لە ناوچەیﯚ هەنووکەیی فارسدا هەڵکەوتبوو ودەسەڵاتداریەتی هخامە نشییەکان بەسەر ئەوناوچەدا ، بەهیچ شێوەیێک نەسەلمێندراوە (۱)، و ڕیزی ڕەچەلەکنامەکەیﯚ کورش کە لە گڵە نووسراوەکەیﯚ بابوٚلدا بوٚ باب و باپیرانی نووسیویە ، لەو گڵە نووسراوەدا نەبیﯚ ، لەشوێنێکی دیکەدا نایدوٚزینەوە و ووتنی چ مێژوویەک بوسەردەمی دەسەڵاتد- اریەتی ئەم هەموو پادشایﯚ مەزنە لەلایەنی ژمێریارییەوە لە شوێنی خوٚیدا نییە و زوبەی مێژوونوسان بەرانبەر نێوی ئەم پادشا مەزنانە بەجێگای تەمەنی پادشاهییەکەیان نیشانەیﯚ پرسیاریان داناوە (۲) چوٚنە کە ئیستا وردەکارییەکانی مێژووی ناوەڕاستی هەزارەیﯚ یەکەمی پێش زاینی لە میسر ڕوٚژهەڵاتی ناوڕاست و مێدیا و ئیلام ئاشکرایە بەڵام هیچ سەرچاوەیەکی بروا پێکراو دان بە ڕەچەڵەکنامەکەیﯚ

۱ـکارل مایسلز لە کتێبەکەیدا (سەرهەڵدانی شارستانیەت) پراوێزی لاپەڕەیﯚ ۱۹٤ دا دەنووسی : (ئانشان نێوی خوٚداوەندی دەخڵ و دان لە ئێرانی دێرینەدا بوو) باڵکێشە کە ئانشانی هەنووکەیی ، واتا پارس ، هێشتا گرنگترین ناوچەی بەرهەم هێنەری دەخل ودانی ئێرانە . ئە م باسە لە پراوێزی لاپەڕە۱۹ی بەرگی دووەمی مێژووی ئێران کەمبریج شدا نووسراوە : تا ساڵ ۱۹٦۹ وادەزانرا شوێنی ئانشان لەدەور و بەری ڕوٚژهەڵاتی شوش هەڵکەوتووە ، بەڵام هەر لەم ساڵەدا دوٚکتور جان هانزمان شوێنی ڕاستەقینەی لە ۵۵۰ کیلومەتری باشووری ڕوٚژهەڵاتی شوش لە فارسی هەنوکەیدا دابین کرد ـ

۲ـهەندی ڕوٚژهەڵات ناس ، دەسپێکی پادشاهی ئارشام باپیرە گەورە و ئیدعایی داریوش بە ساڵی ٦۱۵ی پێش زاینی دەزانن و لەبەرئەوە کە دەسپێکی پادشاهی داریوش ساڵی ۵۲۲ی پێش زاینییە ئێوان ئەم دوو دەسپێکە ئەبێتە ۹۳ ساڵ . بەبیری دەهێنینەوە کە داریوش لە نوسراوە کەی شوشدا ڕاێگەیاندووە کە کاتی دەسەڵاتداریەتی خوٚیﯚ باپیرە ئارشامی لە ژیاندا دیووە!! بەم جوٚرە ئاریارەمنە هاوکاتی کورشی یەکەم ، ئارشام هاوکاتی کەمبوجیەی یەکەم و ویشتاسپ هاوکاتی کورش ، برانبەر ئیدعای ڕەچەڵەکنامەکان ، لە سنوورێکی بچووکی ئانشان و پارسدا دوو نێو بوٚیەک سەرزەوین هاوکات پادشای بزرگ و پادشاهی جیهان بوون!

کورشدا نانێت ؟ کەوابوو ڕاگەیاندنەکانی کورش و داریوش کە ئەڵێن پشتاوپشتی ئەوانە لە پارس و ئانشاندا پادشا بوون ، بەرانبەر پرسیاری مێژوونووسان تا چرادەیەک خوٚیان ڕادەگرن ؟ بەڵگەیﯚ بناغەیی ئێمە ، واتا کتێبەکەیﯚ گیرشمن ، هیچ کاتێک خوٚیﯚ لە توٚژینەوەیﯚ ڕچەڵەکنامەکەیﯚ کورش نادات و بەگشتی نووسەرانی مێژووی هخامەنشییەکان زوٚر هەوڵیان داوە لە بچووکترین بواریشدا لە پراوێزی باسەکەوە دەرباز بن ، چوونکە هاتنە نێو باسی ڕەچەڵەک نامەی هخامەنشییەکان لە هەر ڕێگایەکەوە لەگەڵ بەربنددا ڕوو بەڕوو دەبێتەوە و ئەبێتە هوٚیﯚ فەشەلبوونی ڕوونکردنەوەکانی چیش پیش

(٦٧٥-٦٤٠ پ ز) کوڕ و جێگری هخامەنش پلەیّ (پادشاهی شاری ئانشان)ی بەدەس هێنابوو و **ناوچەیّ** هەرچەن چیش‌پیش لە ژێر دەسەڵاتی ئیلام دەرچووبوو، لەگەڵ ئەوەشدا ئەگەر لە وتەکەی هێرودیتس دڵنیابین چیش‌پیش (دەوروبەری ٦٧٠) ناچار بوومل بۆدەسەڵاتی مێدیاکان لە ژێر سەرکردایەتی فرەوەرتیش- خشتریتە دانەوێنی. هەروەها کە دەزانین، ئەو پادشایە بەئامانجی پەلاماربۆسەر ئاشور یەکیەتییەکی مەزنی دامەرزاندبوو. بەهۆی تێکشکانی ئەم‌خەباتە و تیاچوونی خشتریتە (٦٥٣)، کە پاش ئەوە هێرشی سکاییەکان بۆسەر مێدیا ماوەیّ ٢٨ ساڵ ئەو وڵاتەیان داگیرکرد وچیش‌پیش لە ژێردەسەڵاتی مێدیا ئازاد بوو. هاوکاتی ئەم ئاڵوگۆڕانە، دەسەڵاتی ئیلامیش لاواز بوو و دەسەڵاتی چیش‌پیش گەشەی کرد و ناوچەی پارس-فارسی ئیستایّ خستە سەر وڵاتەکەی. لەوانەیە چاوڕوانی و دەروون فراوانی ناوبراو بوویێتە شانسی ئایندەیّ دەوڵەتە گەنجەکە و دەودەورێکی گرنگی لەم بارەوە گێرابێت. چیش‌پیش بە سیاسەتێکی بوێرانە و لە هەمان حاڵدا پارێزکارانە زوربەی سەرزەوییەکانی داگیرکرد و تا ڕادەیەک کە دەکرا لە شەڕ و کێشەی نێوان دەوڵەتە گەورەکان خۆیّ دەپاراست، و بەم شێوە چیش پیش ئەندیشمەندانە داخوازەکانی ئیلامی ڕەتکردەوە. ئیلام لە شمش شوموکین پادشایّ بابۆل پشتیووانی کرد، کە لەلایەن براگەورەکەیەوە، واتا ئاشوربانی‌پاڵ لە پادشایی بابۆل بیبەری کرابوو.

(ر.گیرشمن، ایران ازآغاز تااسلام، ل١٢٥)

ئەمە دەسکاریکراوترین شێوە لە جوغرافیای هەرێمەکەیە. لە ماوەیّ ساڵەکانی (٦٧٥ - ٦٤٠) دایە، وهیچ جۆرە پاسایەکی مێژوویی نی‌یە و لە بناغەدا بۆ بەدەسەڵات گەیاندنی چیش‌پیش مونتاژکراوە گیرشمن بە کوڕ و جێگری هخامەنشی دەزانی. لەگەڵ هەمو ئەوانەدا و لەبەر ئەوە کە لە گڵە نووسراوەکەیّ کورشدا نێوی هخامەنش نەبراوە. گیرشمن ئەو نێوەی کە یەکەمین جار لە بەردە نووسراوەکەی داریوش لە بێستوندا خوێندووتەوە، لەگەڵ ڕەچەڵەکی کورش کە لە گڵە نووسراوە-کەی بابۆڵدا تاپۆکراوە، بە شێوەیەکی ناڕاست پێکەوە لکاندووە. ئەگەر هەبوون و سەرهەڵدانی چیش‌پیش هەروەها کە وتراوە، لە دەسپێکی ٦٧٥دا بەڕاست بزانین، هیچ نەبیّ پێویستە لە دەسپێکی ساڵی ٧٠٠ی پێش زایینی‌دا وەکو بناغەدانەری زنجیرەی هخامەنش لە ئانشاندا سەری هەڵدا بێت. بەڵام پێشتر ئاگادار بوین کە گیرشمن لە شوێنێکی دیکەی کتێبەکەیدانووسیبووی:

"دەربارەیّ پارسەکان، ئەبیّ بوتری کە ئەوانە لە دەوروبەری ساڵی ٧٠٠ی پێش‌زایینی لە پارسوماش، کە لە چیا لاوەکییەکانی بەختیاری لە ڕۆژهەڵاتی شوشتەر، ناوچەیەکی هەڵکەوتوو لەم‌بەر و ئەو بەری ڕووباری کارون نزیکی کەوانە درێژەکەیّ ئەوڕووبارە، پێش لەوەیّ کە بولایەنەی باشوور بگەڕێتەوە نیشتەجیّ بوون" (گیرشم،

از آغاز تا اسلام، ل ١٢٢)

گیرشمەن دەنووسێت کە کە سێک بەنێوی هخامەنش بناغەی زنجیرە پادشاهییەکی بچووکی پارسەکانی لە"پارسوماش" کە لەڕۆژهەڵاتی شوشتر هەڵکەوتووە و بەشێک لە ئیلام بوو، داڕشت، بەڵام ڕوٚشنی ناکاتەوە کە ئەو زانیارییە پڕنرخانەی لەکام سەرچاوەوە وەرگرتووە.

هوٚکاری کێشە و پێکدادانەکانی نێوان پادشاکانی ئیلام و ئاشور، زوٚرجار پەیوەندی لەگەڵ پرسەکانی بابوٚلدا هەبوو. بەم بوٚنەوەیە کە لە سەردەمی هوبان ئیمنە (٦٩٢ - ٦٨٨ پ-ز)- بەپاڵپشتی داواکارییە یاسایەکانی دەسەڵاتداری بابوٚلی دژی ئاشور، سوپایەکی بەهێز کوٚدەکاتەوە - **و ئەمە یەکەم جارە کە نێوی پارسەکانی پارسوماش دەبیسترێت.** (ر.گیرشمن، ایران از آغاز تا اسلام، ل ١٢٤)

کاتێ کە مێژوو نێوی پارسوماش بوٚیەکەمین جار لە زمانی هوبان ئیمنە دەگێڕێتەوە، کە دەسپێکی دەسەڵاتداریەتی ناوبراو ساڵی ٦٩٢ بووە، چوٚن ئەبێ ئاغای گیرشمن دیاری بکات کە ١٥ ساڵ پێش لە سەرهەڵدانی هوبان ئیمنە، هخامەنش، کە داریوش بە مێژووی ناساندووە، بناغەی ئیمپراتورییەک دابڕێژێت؟ بەم جوٚرە ئیدعای دوایی بەڕێزی کە چیش‌پش، ڕوٚڵەی هخامەنش، لە ٦٧٥دا لە پارسوماشەوە تا ئانشان، واتا سەرانسەری ئیلامی داگیر کردووە، نادورستی خوٚی دەسەلمێنێت، چوونکە ئەوێ ئیلامیانە کە ئەو کاتە لەگەڵ ئاشوری پڕهێزدا ململانێیان دەکرد، ژیرانە نیێە کە هێشتبێتیان هوٚزێکی بچووک و بێناونیشان، لە پارسوماشەوە تا ئانشان داگیر بکات. بەم بوٚنەوەیە ئاغای گیرشمن بە پێویستی دەزانێ کە ئیلام بوٚ ناکوٚکییە ناوەکییەکان هەڵخرێنێت، تا مەجالی مێژوویی بوٚ چیش‌پش برەخسێنێت کە سەرانسەری ئیلام داگیر بکات.

ئاشور لە ئیدامەی شەڕەکانی دژی دوژمن، هەموو قورساییەکینێزامی و سیاسی دژی ئیلامی لاواز بوو بەکاربرد. لەلایەکەوە سیاسەتی جیابوونەوە و بچووک‌کردنەوەی دادەسەپاند، لە لایەکی دیکەوە ئەو دەسەڵاتدارانەی ئیلامی پشتیبانی دەکرد، کە بە تاج و تەختی ئاشور وەفادار بوواینەن. ئیمپراتوری ئاشور بە ئیرادەی خوٚی پادشاکانی ئیلامی دەگوٚڕی. لە حاڵەتێکی پڕ لە دڵەڕاوکێ وەهادا، کە بەبوٚنەی کێشە نێوخوییەکانی نێوان ئاشور و ئیلام، کە زوٚرجار ئاڵوٚز و دوایی کوٚتایی پێدەهات و ئیلامییەکان بە چەن کوٚمەڵێکی بچووک دابەش دەبوون، حکوومەتی بچووکی پارسەکان قوٚناخی گەشەکردنی هەنگاو بە هەنگاوی خوٚی دەرباز دەکرد. (گیرشمن، ایران از آغاز تا اسلام، ل ١٢٤)

لەمێژووە دەسکردەکەی ئاغای گیرشمەندا، کە باسی ناکوٚکیە نێوخوییەکانی ئیلامییەکان دەکات،

نیشانەیەکی گرنگ لە چۆنیەتی گەشەکردنی خاونە دوواییەکانی ئیمپراتوری هخامەنشییەکان نابینین و وەکو شتێک کە شەڕ و پێکدانەکانی چش‌پش وئیلامییەکان بۆ داگیرکردنی ئانشان تاشوشتەر ، لە بێدەنگیی تەواوی مێژوودا ئەنجام دراوە ، چوونکە مێژوو جیا لە پێداگرتنەکەی ئاغای گیرشمەن ، بۆ شێواندنی کەش و هەوای ئیلام ، نیشانەیەکی دیکەی بۆ سەلماندنی ڕاستی پرسەکەی بەدەسەوە نی‌یە . بەڵگەنامەکانی دیکە ئەڵێن کە ئیلامییەکان لە ساڵی ۷۰۰ تا ٦٤٥ پ ـ ز لە بەرزترین پلەی دەسەڵاتداریەتی خۆیاندا بوون و بە پشتیووانی کردن لە بابۆل هەمیشە پرهێزترین ئیمپراتوری ڕۆژ هەڵاتی ناوڕاستی بۆ شەڕ هەڵخراندووە .

بەرانبەر ساڵنامەکانی بابۆلی ، پاش کۆچی هومبان نیکەشی یەکەم خۆشکەزاکەی بەنێوی ئوشوتروک ـ نهونتەی دووەم(٧١٦ـ٦٩٩ پ ـ ز) بوو بەپادشای ئیلام . لە کۆمەڵی بەڵگەنامەی ئەو سەردەمەدا ، ناوبراو خۆی بە پادشای ئانشان و شوش و گەشە پێدەری سەرزەوینی ئیلام ناساندووە . ئەم ڕاگەیاندنە تارادەیەک لە جێگای خۆیدایە . چوونکە یەکێ لەو بەڵگانە باسی هێرش‌بردن بۆسەر کرین ـ داش دەکات . (یوسف مجیدزادە ، تاریخ تمدن ایلام ، ل٢٩ )

بەم جۆرە مێژووەکەی ئاغای گیرشمەن نەتەنیا بەگریمانەی ڕاستبوونی ڕەچەڵەک‌نامەکەی کورش و داریوش ڕێکوپێک کراوە ، بەڵکو ناوبراو ئاڵوزی ئاشکرای ناوەڕوکەکەی بە گۆڕینی ڕواڵەتی مێژوو پینە دەکات و تەنانەت سەرنجی گڵە نووسراوەکەی کورشیش نادات کەباپیرەکەیان لە چش‌پش بەو لاوە ناڕوات و ئەڵێ باپیرانی لە ئانشانەوە سەریان هەڵداوە وئەوەش هەروەها کە دەیبینین ، بەهیچ شێوەیەک دەرفەتی مێژوویی و جوغرافیایی نی‌یە .

بەڵام ئێمە لەم سەردەمە دوور و درێژەدا ، شتێک لە مێژووی ئانشان نازانین و لە ئاکامی کردەوە نێزامییەکانی ئەوسنوورە ئاگادار نین . ئەم باسە کە ئایا پادشاکانی ئانشان لەو کاتەدا توانیویانە لە پرسە نێوخوییەکانی دەوڵەتانی دەوور وبەردا دەس‌تێوەردان بکەن یا نە ، باسێکی شیاوی لێکۆڵینەوەیە ، بەتایبەت کە لەم ڕێگاوە دەتووانین گرنگی و قورسایی سەرزەوینێک کە باپیر و پاش ئەو بابی کورشی دووەم(مەزن) دەسەڵاتداری بوون ، ڕۆشن بکەینەوە بەڵام بەئاگاداری لەم پرسە کە تاساڵی ٥٥٣ ، هیچ سەرچاوەیەکی بابۆلی ئاماژە بە دەسەڵاتدارانی ئانشان ناکات ، **ناچارین کە ئەم مژارە بە نەشیاو و نەکراو بزانین.** (پی‌یر بریان ، تاریخ ئیمپراتوری هخامنشیان ، )

بەڵام ڕەحمەتی پیرنیا لەم بارەوە لە گیرشمەن خۆپارێزترە و لە سنووری چیروکەکانی هێرودیت ئەولاتر ناڕوات .

وەکو هێرودیت ئەیژێ ئەم بنەماڵە لە خێڵی پاسارگادیەکانەوە سەریان هەڵدا و هخامەنشییەکان پێش لە ئاژاوە گێرییەکەی کورشی مەزن بەرانبەر دووا پادشای مێدیا ، لەپارسدا نیشتەجێ بوون .دەربارەی ئەوە کە چ کەسێک بناغەدانەر و چ کەسانێک پێش لە کورش دەسەڵاتداربوون ، نووسراوەکانی هێرودیت ڕۆشنی دەکاتەوە کە رەچەڵەکی کورش و داریوش و خەشایارشاه دەچێتەوە سەر هخامەنش و پاش کەسانێک بەم ڕیزەی خوارەوە دەبن پادشای پارس: چیش پیشی یەکەم ، کەمبوجیەی یەکەم ، کورشی یەکەم و چیش پیش دووەم . لێرەدا زنجیرەی هخامەنش دوو لەقی لێدەبێتەوە ، لەقی باپیرانی کورشی مەزن و لەقی باپیرانی داریوشی یەکەم . لەبەر ئەوە دانەری پادشاهی پارس کورشی مەزن بووە ، ئێمە ئەم لەقەبە لەقی سەرەکی و لەقەکەی دیکە بە لاوەکی نێو دەنین . وەکو هێرودیت ئەڵێ لەقی سەرەکی ئەمانەن :کورش دووەم ، کەمبوجیەی دووەم ، کورش سێهەم (مەزن) . لەقی لاوەکی ئەمانەن: ئاریارەمنە ، ئارشام ، ویشتاسپ ، داریوشی یەکەم . ئەمە ئەو زانیاییانەیە کە هێرودیت ڕایدەگەیەنێت . (حسن پیرنیا ، ایران باستان ل ۲۲۸ )

**ئاغای پیرنیا کە لە کۆکردنەوەی بەڵگەنامە کۆنەکانی مێژووی ئێراندا نە تەنیا لە ئاغای گیرشمەن خۆپارێزترە ، بەڵکو لەوەش بەرپرسایەتی زۆرتر و بە ئاماژە نیشانی ئەدا کە لە پڕۆپاگاوی ڕاگەیاندنەکانی کورش ، داریوش و هێرودیت دەربارەی ئەم بەشەی مێژووی هخامەنشییەکان**

ئاگادارە . کەوابوو یەکەم پادشای بنەماڵەکە هخامەنش بوو و ڕیزی پادشاکانی زنجیرەکە تا دەگاتە کورشی مەزن ، وەهابوو کە ڕاگەیندرا . دژواری لە پرسێکی دیکەدایە و هێرودیت ئەڵێ : کەمبوجیە بابی کورش لەپارسدا نیشتەجێ بوو و کاتێ کورش لە بارەگای مێدیا دوور خرابووەوە ، گەڕایەوە بۆپارس و چووە کن دایک و بابی ، لە حاڵێکدا نبونید پادشای بابوڵ بەوشێوە کەڕاگەیندرا ، کورشی بە پادشای ئانشان زانیووە و خۆی کورشیش لە جاڕنامەکەی بابوڵدا ، باب و بابەگەورە و چیش پیشی باپیرە گەورەی بە پادشاهانی مەزن و پادشاهانی ئانشان ناساندووە و ئەوەش دەزانین کە ئانشان بەشێک لە ئیلام بوو . کەوابوو جیاوازییەک لە نێوان نووسراوەکانی هیرودیتو نبونید وجاڕنامەکەی کورشدا دەرئەکەوێ و ئەڵبەتە پێویستە کە نووسراوەکەی نبونید و کورش بەڕاستتر بزانین ، چوونکە ئەم نووسراوانە لە کاتی سەرهەڵدانی ڕووداوەکاندا تاپۆکراوە ، لەحاڵێکدا هێرودیت نزیکەی سەد ساڵ دوواتر ئەوانەی نووسیوە . کەوابوو ئەبێ بڕوامان بەوە هەبێ کە کورشی مەزن پێش لە سەرهەڵدانەکە دژی ئەژدهاک ، یا (دووا پادشاهی مێدیا ) پادشای ئانشان بووە . لێرەدا پرسیارێک دێتە ئاراوە ، زنجیرەی هخامەنشی کە لەپارسدا نیشتەجێ بوون ، بەچ شێوەیەک بۆ ئانزان گواسترانەوە ؟ . ئیستا بەڵگەیەک لەم بارەوە بەدەستەوە نی یە و ئەم پرسە وەکو خۆی دەمێنێتەوە . بەڵام دەتوانین وەها بۆی بچین کە پاش تێکچوونی دەوڵەتی ئیلام لەلایەن ئاشور بانیپاڵەوە ، پارسەکان لە سەرقاڵبوونی ئاشور و مێدیاکان بە شەڕەوە ، دەرفەتی داگیرکردنی ئانزانیان بەدەس هێناوە ، و هەروەها لەبەر پێشینەی کۆنی ئیلام وبێ ناونیشانی پارس کە لە لایەن مێدیاوە داگیر کرابوو ،

کورش بەباشی زانیوە کەبەجێگای پارس خۆیٚ بە پادشایٚ ئانزان بناسێنیٚ . ئەم گریمانە ڕاستتر دەنوێنیٚ ، بەڵام تۆزیٚ گومانی تێدا دەمێنێتەوە . ئەگەر ئەمە باوەڕێکی ڕاست بێت ، ئەبیٚ بێژین کە پێش لە داریوشی یەکەم ١٢ کەس لە زنجیرەیٚ هخامەنشی پادشاهیان کردووە ، لە حاڵێکدا داریوش لەبەردە نووسراوەکەیٚ بیستوندا ئەڵیٚ : پێش لەمن ٨ کەس پادشاه بوونە و من **نۆهەمین پادشاه لە دوو بنەماڵەکەی هخامەنشی** (پیرنیا ، ایران باستان ، ل ٢٣٠ )

ئەڵبەتە لە شوێنێکدا نەبینراوە کە داریوش بنەماڵەکەیٚ بە دوو بنەماڵە ناساندبێت بەڵکو هەمیشە نێوی بنەماڵەی خۆیٚ ئەبات : کە مبوجیە کوڕی کورش لەبنەماڵەیٚ ئێمە ، لێرەدا پادشاه بوو(١) بەمجۆرە لەڕەچەڵەکنامە ئیدعاییەکاندا بەوپەڕی (شێواندنی بەڵگەنامەکانەوە) لە بناغەی مێژووی هخامە ـ نشییەکاندا ڕوو بە ڕوو دەبینەوە کە هیچ کەس نەیتووانیووە بەجۆرێکی شایستە ڕۆشنی بکاتەوە . ئاغای پیرنیاش دەنووسێت کە پارسەکان لەلاوازی ئیلام سوودیان بردووە و ئانشانیان داگیر کردووە ، بەڵام بۆچی مێژوو داگیرکردنی ئیلام لەلایەن ئاشورەوە ڕادەگەیەنی لە بارەیٚ خۆیٚ بەدەستەوەدانی ئانشان بە پارسەکان هیچ ئاماژەیەک ناکات و ئیمرو دەبینین کە پارس و ئانشان دووسەرزەوینی جیاواز نین ، دەزانین کە هەڵسەنگاندنی مێژوو بەم شێوە تاچڕادەیەک بیٚنرخە ؟ .
بریان بە هۆشمەندی تایبەتی مێژوونووسێکی نوێ ، سووک و ئاسان خۆیٚ ڕادەستی بەڵگەنامە مێژووییە کۆنەکان ناکات ، بەوشێوە کە بچێتە نێو لێکدانەوەی ڕەچەڵەکنامەکەی کورش و داریوشەوە ، چوونکە دەزانێت بەم بەڵگەنامانەی ئیستاوە داکۆکی لە شەجەرەنامەیٚ هخامەنشییەکان وٚهەر مێژوونووسێکی ووردبین کارێکی نەکراوە .
**پادشاکانی ئانشان (ئانزان)** : پارسەکان ، لەخویانەوە چبەڵگەنامەیەکیان لەمێژووی خویانەوە بەجیٚ نەهێشتووە . تەنیا شێوەی مێژوونووسینی ئەوسەردەمە هەمان ڕەچەڵەکنامەیە کە پادشاکان لەخۆیانەوەبەجیٚیان هێشتووە . داریوش لەبەردە نووسراوە بەناوباگەکەیٚ بیستوندا ، پەیوەندی خویٚ بەبنەماڵەیٚ هخامە نشییەوە ، بەشیوەیەکی ڕەزایەتمەندانە ڕاتادەگەیەنێت .
من ، داریوش ، شاه مەزن ، شاه شاهان ، شاه سەرزەوینی پارس ، شاه وڵاتان ، کوڕی ویشتاسپ ، کوڕی کوڕی ئەرسامس هخامەنش ، وەها ئەیژێ : بابی من هیستاسپ ؛ بابی ئەرسامس ، ئاریارەمنس ، تِس پِس ؛
هیچ کام لەمێژوونوسان سەرنجی ئەم باسە بنەڕەتییانەیان نەداوە کە لەڕاستیدا ووتنی وشەیٚ پارس بەواتایٚ مێژوویی وجۆغرافیاییەکەیٚ سەردەمی پێش لە داریوش ، بەتەواوی بیٚواتایە .

١ـ داریوش ، نووسراوەکەیٚ بیستون ، ستون اول ، دێری ٢٦ .

تس‌پس ، هخامەنش . داریوش شاه وەها ئەڵی : بەو بۆنەوە بە ئێمە ئەڵێن هخامەنشییەکان . چوونکە باپیرانمان لە زۆر کۆنەوە پادشا بوونە . داریوش شاه ئەیژێ : ٨ کەس لەبنەماڵەی ئێمە پێشتر پادشاه بوونە و من نۆهەمینم . نۆ ، یەک لە دووای یەک ئێمە پادشاهین . (D.B ، یکم بندهای ٢ ـ ٣ ) . بەم جۆرە ئەم ڕەچەڵەکنامەیە ، لەڕاستیدا دەرفەتێک بە ئێمە ئەدات لە پانتایی زەمەندا تا دەسپێکی مێژووی هخامەنشی ، ئەو سەردەمەی کە پارسەکان هێشتا لە سەرزەوینی پارسدا بوون١ ، بگەڕینەوە . پێویستە ئەوەش بێژین کە ڕەچەڵەکنامەی پادشاهی کە هێرودیت لە (کتیبی حەفتەم ١١ ، ) دەیخاتە بەردە ، بەتەواوی ڕوونووسی ئەوەی داریوش نی‌یە ، چوونکە لە ڕەچەڵەکنامەکەی هێرودیت دا ریزی پادشاکان لەزمانی خەشایارشاوە وەهایە : هخامەنس ، تس‌پس ، کەمبوجیە ، کورش ، تس‌پس ، ئاریارامنس ، ئەرساس ، هیستاسپ ، داریوش . دوو نووسراوە بە ناوی ئاریارامنس و ئەرساس بەدەستەوەیە کە داریوش ئەوانەی وەکو باپیر و باپیرە گەورەی خۆی دەناسێنیت . ناوەڕۆکی ئەوانە بەم جۆرەیە : (ئاریارەمنس شاه مەزن ، شاه شاهان ، شاه پارس . . . ئەم سەرزەوینەی پارس کە لەدەستی من دایە ـ ئەسپگەلی باش و پیاوانی بوێری هەیە ، ئەهورا مەزدا بە منی بەخشیووە . . ) .
(ASH;AMA ) بەڵام ئەم بەڵگانە جێگای دڵنیایی نی‌یە . لەڕاستیدا ، لەلایەکەوە ، لەبارەی ڕەسەنیەتی ئەوانەوە گۆمان و دوودڵی تەواو هەیە و لەلایەکەوە ، ووتەکانی داریوش بەڕاستی گومان لێکراو دەنوێنیت . (بریان ، تاریخ ئیمپراتوری هخامەنشیان ، ل ٧٣ ) .

مەبەستی ئاغای بریان لە ڕستەی (ئەو سەردەمەی کە پارسەکان هێشتا لە سەرزەوینی پارسدا بوون ) دیار نی‌یە و نازانین مەبەستی کام پارسە . (پارسوا ) لە دەوروبەری ئوورمیە ، (پارسوماش ) لە دەوروبەری کرماشان و یا (پارس و پارسەی ) پاش داریوش . لە مێژووەکەی بریاندا زۆرتر لە چەن ڕستە و ئاماژەی دیکە ، کە لە شوێنی خۆیدا ئیشارەی پێدەکەین ، باسێکی گرنگی دەربارەی ڕەچەڵەکی هخامەنشییەکانی تێدا نابینینەوە و ئەوانەش کە هەیە گومان و نادڵنیایی لەسەر وەچکیان دەبارێ . دیار نی‌یە بەچ هۆیەکەوە گەڕیان بەدووای هخامەنشییەکاندا هەمیشە لە سنوورێکی دیاریکراودا ڕادەوەستێ ؟ بەبڕوای من پشتگوی خستنی ئەم باسە لەلایەن بریانەوە ترسێکی حیساب بۆکراوە کە ئەگەر بە ئاشکرایی بە دووای ڕچەڵەکنامەی هخامەنشییەکاندا بگەڕێت ، ئەوکاتە ناتووانێ شێوەیەکی ڕاست و ڕەوا بۆنووسینی دووبارەی مێژووی هخامەنشیەکان دابڕێژێت .
وەها چاوەڕوان دەکرێت کە مەبەستی داریوش پاش کۆتایی سەردەمێک پڕ لە سستی و لاوازی دەسەڵاتی حکوومەتەکەی ، دامەزراندنی بناغەیەکی نوێ بۆ پادشاهی پارس و پاساکردنی داگیر

کەرییەکەی بەپێویست دەزانێ . لەبەرئەوە هەڵبژاردنی باپیرە گەورەیەکی (ناسنامە بەخش) بە نێوی هخامەنش، ئە بێتە مژاریکی بەنرخ بو پاساکەری ئەودەسکەوتانە وەکو مافێکی ڕەوا .

لەوانەیە کە کەشو هەوایکی وەهادایە کە بیری (ئەفسانەی بناغەدانەر) دیمەنی خۆی نیشان ئەدات ولەو دیمەنەوە هخامەنش نیشان ئەدرێت کەلە ژێر چاودێری هەلۆیەکدا پەروەردە دەکرێت و گەورە دەبێت (ئەلی ین HA ک دوازدەهەم[٢١])، هەمان پەلەوەر پەیوەندی لەگەڵ دەسەڵاتی پادشاهی پارسدا بە فراوانی نیشان دراوە. بەلام پرسی هخامەنش لەلایەن خۆدی داریوشەوە لە چەمکێکی کۆکراوە و سنووردارادا بەکاربراوە. لێرەدا باسی بنەماڵەیەک، بەو واتایە کە هێرودیت لەرێزی کۆمەڵێک لە بنەماڵەکانی یونانیدا کەڵکی لێ وەردەگرێت، نی یە ; بەڵکو تەنیا نێونیانێکە کە تایبەتی بنەماڵەی بابی داریوشە و **هەروەها بەم مەبەستەوەیە کە پادشای تازە فەرمان ئەدات ئەم نیشانە لەسەر نووسراوەکانی پاسارگادەوە هەڵکۆڵن و سەختەکارانە بیلکێنن بە کورشەوە** (CM a-b-c- Dm a-b-c) ئەگەر دەبینرێت کەلەم نووسراوەدا کورش تەنیا وەکو پادشاە وهخامەنشی ناسیندراوە ، لەبەر ئەوەیە کەداریوش ویستوویە کورش لەپلەی کیانی سەختەکارانەی پادشاهیی تازە دا جێگیر بکات وخۆی بە دەسکاری کردن لە ناسنامەی بنەماڵەکەیدا ، جوانکارییەکی نوێ بخولقێنێ . ئاشکرایە کەلێرەدا مەبەست لە بەکاربردنی چەمکی هخامەنشی ئاماژە بە بنەماڵەیەکی پادشاهییە، چوونکە دیارە کە داریوش بەپەیوەند دانی کورش بە هخامە نشییەکانەوە، وەکو بنەماڵەیەک لە (بنەماڵەکانی یونان،) هیچ شتێک مسوەگەر ناکات. (بریان، تاریخ امپراتوری هخامەنشیان، ل ٢٦٩).

بریان دوودڵی خۆی بەبێ ئاکامێکی دیارکراو دەژمێرێت . کەش و هەوای دڵەڕاوکی ئیستا لەمافیای مێژوونووسینی ئێراندا، هەروەها کە لەداهاتوودا دەوترێ، بۆ زورینەی ئەو کەسانە کە دەوێرن بەشێوەیەکێ جیدی بچنە نێوبناغەی مێژووی ئێرانەوە، نەهێشتووەتەوە و بووە بە هۆی ئەوە کە بریان بەوەها دەسمایەکی ژیرانە و سەلمێندراوەوە، کە بۆ پرسیارەکانی ئەو، وڵامیک ئیلا فەشەل بوونی ناسنامەی هخامەنشییەکان نەبێت ، ناهێڵێتەوە. بێگومان ئەگەر دیسانەوە لە ڕاگەیاندنی وەها ناڕاستبوونی خۆی دوور بخاتەوە، دەتووانین ئەو خۆپاراستنە بەبایکەوە ئری بدەین کە لەبەشەکانی کۆتایی کتێبەکە پێشکەشی دەکەم .

ئومستەدیش لە (مێژووی شاهەنشاهی هخامەنشیدا) خۆی لە ڕەچەلەکنامەی کورش نادات . ئەڵبەتە دوورە پەرێزی ناوبراو، وەکو بریان ، لەڕووی هوشمەندییەوە نی یە، بەڵکو لە ئاستی نزمی

زانیارییەکانی ناوبراودایە . نازانین بۆچی ئومستەد مژاری هخامەنشییەکانی هەڵبژاردووە ، کەپسپۆڕی وەها بوارێک نی یە . نووسینی نووسراوەیەکی وەها بێ مایە کە لێکدانەوەکانی لەسەر بناغەی ئەفسانەیێ هخامەنشییەکان دانرابوو ، خۆیێ بۆ ئەفسانەیەکی تازەتر گۆڕدراوە . پشکینەرانی دیکەش ، وەکو دنداید ، ئامۆلی ، کورت ، ویسهوفر خۆیان لەقەرەی هەڵسەنگاندنی ڕەچەڵەکنامەکە نەداوە ، تەنیا کتێبەکەیێ ئاغای شهبازی دەمێنێتەوە کە نێوی کورشی مەزن و یەکی لە بڵاوکەکانی زانکۆی پەهلەوییە و بەبۆنەی جەژنەکانی ٢٥٠٠ساڵەی شاهەنشاهی ئێرانەوە چاپ کراوە و لەم حاڵەدا ئەگەر ناوەڕۆکەکەیێ زۆرتر فۆرمی و هاوەدەنگی بانگەشەو ڕێکلامی جەژنەکان دەبینین ، جێگایێ سەرسووڕمان نی یە .

نزیکەیێ ٥٠٠٠ ساڵ پێشتر لەباکووری دەشتەبەرزەکانی ئێران و لە پادەشتەکانی ئوکراین و کەنارەکانی دەریای ڕەشدا ، خەڵکانێک جیهانخواز و شەڕاشۆ دەژیان کە ناوبانگیان بە هیند و ئورووپی دەرچووبوو . ئەو خەڵکانە لەڕێگایێ پەروەردەکردنی گاوگوێرو کشتوکاڵەوە بەڕێوە دەچوو و نەریتی کۆمەڵگاکەیان باوکسالارانە بوو . ەسەر چەرخە تۆندرەوەکانیان دادەنیشتن و لەگەڵ ژن ومنداڵەکانیاندا ئەملا وئەولایان دەکرد ( !!! ) . ئە وانە کەوان هەڵگرانی بە توانا و سوارکارانی بوێر بوون . ( ع شهبازی ، کورش بزرگ ، ل ١٩ ) .

١ـ بەگشتی دۆزینەوەی ڕێگایەک بۆڕێکوپێک کردنی بیرکردنەوە مێژوویەکانی ئاغایێ شهبازی تارادەیێک دژوارە مەگەر لێکدانەوەکانی ناوبراو وەکو: لیستەی خواردن و ترشیاتی گەنجە ئێرانییەکان لەسەردەمی هخامەنشییەکاندا . بکەین بەشایەت بۆ دوزینەوە گرنگیمێژووییەکانی . لیستەیێ خواردنی ڕۆژانە و ترشیاتێ گەنجەکان ، پاش وەرزش و خوێندنگا ( !! ) ، لەنان وکولیچە لەگەڵ تەرەتیزە وناوخویێ گەزودا کولاندبوویان ، پێکدەهات خواردنی سەرەکی خەڵک نان بوو کە ئافرەتان گەنمەکەیان دەهاڕیی و دەیانکرد بەنان . گۆشتی مەڕو بزن و مریشکیش لە خواردنی ئاسایی ئێرانییەکان بوو و لەکاتی پێویستدا گۆشتی حوشتر و ئەسپ و گویدریژشیان دەخوارد ، و ئاوگۆشت یان کەبابیان لێ سازدە کرد ، هەندێ جاریش کێک و کفتەیێ(کوبە) گوشتیان بە خویێ و تووی تەرەتیزەوە دەکوتا و لەبریتی خەردەڵ بەکاریان دە برد ، خوەش تامیان دەکرد . (ع ، شاپور شاعبازی ماد و هخامەنشی ، جزوۀ درس تارخ دانشگاه آزاد ایران ، سال ١٣٥٤، ل ٥٥ )

هەر لەم پێشەکییەیێ کتێبەکەیێ ئاغایێ شهبازییەدا ، لێکدانەوەیێ ناوبراو لە بارەیێ دەسپێکی شارستانیەت و مێژوو ئاشکرا دەبێت : گواستنەوەیێ شارستانیەت بۆئیستێپەکانی ڕوسیا ، لە ٥٠٠٠ ساڵ پێش لەئیستا ، واتا دەسپێکی سەردەمی نوێ بەردیندا ، کاتێ کە مێزوپۆتامیا هێشتا بێدەنگە ، ئەوەش بەئەو ووردەکارییانەوە ، بەڕاستی بیرکردنەوەیەکی دوور لە پشکنینی مێژوویی

داخوازەکات، چوونکە دیار نی‌یە کە ناوبراو نیشانەی داهێنانی چەرخی توندڕەو یان ئارامڕەوی لەو سەردەمەدا چۆن بۆ ئیستێپەکانی ناوەندی ڕوسیا گواستووەتەوە؟!(١) لەحاڵێکدا کە بڕواکردن بە هەبوونی وەها شارستانیەتێکی کۆن لە کەنارەکانی دەریای ڕەشدا لەگەڵ ناردنی ئاریاییەکانی ڕۆژهەڵاتی ئێراندا کە تێزی خۆدی نابراوە، ئەبێتە هۆی کێشە و ناکۆکی.

بت‌یان پەرەستش نەدەکرد بەڵام هێزە سورشتییەکانیان بەخۆدا دەزانی. وشەی خۆدا لای ئەوان داو (دێو) بوو، و گرنگترین یەزدانیان میترە ئیزەدی ئاسمانی پاک وڕۆشن-واگنی-خۆداوەندی ئاگر- بوون. ئەم ئیزەدانەش وەکو خەڵکانی سەرزەوین دایک وبابیان هە بوو و ئاسمان باب و سەروەری هەموو خۆداوندان دەژمێردرا. هێند و ئورووپیەکان هەندی لەمەتاڵەکانیان دەناسی و وشەی ئۆیس بەزمانی ئەوان واتای مەتاڵی (فلز) هەبوو. بەئەسپ دەیان‌ووت ئەکواس و زۆر خوشیان دەویست. لەوانەیە ئەوانە ئەم چوارپێیە جوان و ژیر و بە ئەمەکەیان بەجیهان ناساندبێت. ئەوانە ڕوومەتی باب و ڕەدێن سپییەکانیان بەرز ڕادەگرت و بەتەمەنترین زەلامی بنەماڵەکەیان بە پێشەوای خێزانەکەیان دەزانی. هێند و ئورووپییەکان کە ژمارەی خێڵەکانیان گەلێک بوون، لە دەسپێکی هەزارەی دووەم‌دا کەوتنە جموجوڵ و هەموو ڕووبەری ئورووپا و نیوەی ڕۆژئاوای ئاسیایان تێپەڕ کرد(١١١). (شاپور شهبازی، کورش بزرگ، ل ١٩)

لەبەرئەوە ناوبراو دووساڵ پێشتر، لەنووسراوەیەکی سریاڵدا بەنێوی (ارج‌نامەی ایرج)، لەژێر ناونیشانی (ورود پارسیان بەتاریخ) باسێکی بڵاوکردەوە کە ئەم‌جارە ئاریاییەکانی لەڕۆژهەڵاتەوە بۆبەرزاییەکانی ئێران دەرباز کرد. بۆچوونی بەوجۆرە کە بەسەرلێ‌شێواویەوە باکوور و باشوور و ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای جیهان بۆدوزینەوەی ناسنامەی هۆزێکی بێ‌ناونیشان تێپەڕ بکات، ناتووانێ خاوەن ئوسلوب و بیرێکی دیاریکراو بێت و لەمژاری مێژوویی‌دا هیچ جۆرە قورساییەکی نی‌یە. لەگەڵ ئەوەشدا بەو ئاستە لە زانیاری خەڵک ناسی و شارستانیەتی ڕۆژهەڵاتیەوە تۆخنی ڕچەڵەک نامەکە دەکەوی، بەڵام لەکۆتایی کارەکەیدا و پاش لەقوپۆدانێکی زۆر بەباسەکە و بە پارێزگاری تاییەتەوە.

کورشی مەزن لەکوەڵگای پارسدا سەری‌هەڵدا(!) دایکی تووی شاهەنشاکانی مێدیا بوو. **پارسەکان کە خزمی نەژادی مێدیاکان بوون و خۆیان بە ئاریایی دەزانی، لە دەسپێکی هەزارەی یەکەمی پێش زایینی‌دا کۆچبەری ئێران بوون و لە کۆتایی سەدەی هەشتەم پێش زایینی‌دا لە پارسی هەنووکەیدا نیشتەجێ** بوون و تۆزەتۆزە دەوڵەتێکی ناوچەییان پێکهێنا. یەکم فەرمانڕەوای ئەوانی کە لە

مێژوودا نێوی براوه، هخامەنش ناوێکە، کەواتای هخا(دۆست)ە و مەنش ـ کە تائیستاش لە فارسیدا کەڵکی لێوەردگیردرێت ـ درست کراوه ولەگەل یەکدا واتای (دوست مەنش)یان هەیە. لەبارەی ئەم زەلامەوە شتێک نازانین ئیلا ئەوە نەبێ کە ناوبراولە خێڵی ناودار و ئازادەی پاسارگادییەکانن کە ملبەرزترین (مە بەست زۆرافە نییە، بەواتای سەفەرازە ـ وەرگیر) خێڵی پارسی دەهاتنە ژماردن. ئەلیان بەبێ ئەوەی ئاماژ بە بەڵگەیەک بکات نووسیویە کە هخامەنش هەڵۆیەک پەروەردێ کردووەکە دەتووانین ئەم چیرۆکەش وەکو ئەفسانەێ زاڵ و سیمۆرغ بنرخێنین. (ع شاپور شهبازی، کورش بزرگ، ل ۲۸).

ڕۆشن بووەوە کورش، کە خۆێ شتێکی دەربارەێ پارس نەدەزانی، لە کۆمەڵگای پارسدا سەری هەڵداوە!. ناوبراو بە ڕۆشنی و ئەوپەڕی بوێریەوە یەک مێژوو، یەک سەرزەوین، یەک زنجیرە و واتای یەک وشە بۆ ئەو، یەک تایبەتمەندی ئازادیخوازانە و ملبەرزی و هیتر، بۆ باپیرانی ئەم سرکردە ڕیز دەکەن، بەڵام لەکۆتاییدا دەنووسن کە لەمبارەوە شتێک نازانن، ئیلا ئەوە نەبێ کە بیستوویانە سەرۆکی زنجیرەکە کە هەڵۆیەک پەروەردەێ کردووە.

لەڕاستیدا هیچ کاتێک مێژوونووسانی ئێمە ڕووبەڕوو بوونەوەیەکی ڕەخنەگرانەیان سەبارەت بە وتارەکۆنەکان نەبووە. زۆرینەێ ئەوانە تەنیا هەمان بیرەوەریانەیان بە پێنووسە شیرینەکەیان گەیانووەتە دەموبەیان، و لە دووبارەکردنی لێکدانەوەکانی هێرودیت و هاووێنەکانی وەکو (هارولد لەمب) و (ئالبر شاندور) کۆیان نەکردووتەوە و وکو نموونەێ سەرەوە، بەبێ پێداویستی بە هیچ نیشانەیەک ڕایدەگەیەنن کە پارسەکان لە دەسپێکی هەزارەی یەکەمی پێش زایینیدا کوچبەری ئێران بوون، هەرلەو کاتەوە بە خۆیانیان ووتوە ئاریایی و لەکۆتایی سەدەێ هەشتەمی پێش زایینیەوە لە فارس نیشتەجێ بوونە و مێژوو یەکەمین فەرمانڕەوای ئەوانە بەنێوی هخامەنش دەناسێت! لەوانەیە مەبەستی ئاغای شهبازی لەمێژوو، نووسراوەکەێ داریوش لە بیستوندا بووە ئەگینا مێژوویەکی دیکە ناناسین کە پێش لە داریوش، نێوێک لە هخامەنش و پارس و ئاریا برابێت.

بەهەرحاڵ، ناوبراو لە سەلماندنی ڕاستی ڕەچەڵەکنامەێ هخامەنشیەکان، واتا ئەوەێ کە لە گڵە نووسراوەکەێ کورش و بەردەنووسراوەکەی داریوشدا نووسراوە، بەوڕادەیە پێدادەگرێت، کە لە کۆتاییدا هەڵسەنگاندنەکەی ناوبراو لە بناغەی ناسنامەێ هخامەنشییەکان، بەم ئیشارەێ خوارەوە کۆتایی پێدێت کە وێنەیەکی دورشم و مانشێتی پێوەیە.

پێش لەوە کە باسی لەدایکبوون و پەروەردەکردنی کورش بکەین، لەجێگای خۆیدایە کە واتای ناوەکەی کورش لەیەک بدرێتەوە و باسی لێبکرێت. یەکەمین شاهەنشاه تۆخمی هخامەنشی کورو یا کورش نێوی بووە. ئەم نێوە بەئەم دەقەوە لەنووسراوەکانی پاسارگاد دا و بەزمانی پارسی دێرینە دەبینین، بەڵام لەزمانی ئیلامی‌دا کورش و لەبابۆلیدا کورَاش نووسراوە و دەخوێندرایەوە.

لەنێو مێژوونووسانی یونانیدا، ئیسکیلوس لەپرسەنامەی پارسی و هێرودتوس لەیەکەمین کەسانێک بوون کە نێوی ئەو فەرمانفەرما بەناو و دەنگەیان وەکو کورُس بردووە. جووەکان کە خۆیان بە ئازادکراوی کورش زانیوە بەحۆرمەتەوە نێوی دەبەن و بەکورش دەیناسن. کۆمەڵی لەنووسەرە ئیسلامییەکان لەرێگای تەوراتەوە وەکو کەسایەتییەکی بەخشندە و ژیر و بوێر یادی دەکەن. (ع شاپور شهبازی، کورش بزرگ ل ٤١)

سەرچاوەی پاسارگاد سەختەیە، سەرچاوەی ئیلامی و بابۆلی بۆ هەڵسەنگاندن نەناسراوە و هەروەها نێوی ئەوکۆمەڵە نووسەرە ئیسلامییە، کەلە (رێگای تەوراتەوە) لە (کورشی بەخشندە و بوێر و ..) نێویان بردووە نەناسراو و نەنووسراون. لەگەڵ ئەوەشدا تەنانەت لەپەسن‌نامەی سەرەوەش رۆشن ئەبێتەوە کە مێژوو، کورشی پێش لەوەی کە ببێت بە ئیمپراتور نەناساند بووە؛ چوونکە ئاشیل، هێرودیت، بەردەنووسراوەکەی پاسارگاد، بەشی هخامەنشییەکانی تەورات و نووسەرانی ئیسلامی، گشتەکەیان سەرچاوەی پاش کورشن. ئایا نەناسراوێکی رووت کە لە هەموو بناغەیەکی هونەری و پیشەسازی، عەقڵی و ئابووری ئیتنیکی بێبەهرەیە، بەچ‌شێوەیەک ئیمپراتورە کۆنەکانی مێزوپۆتامیا و ئێرانی تێکشکاندووە؟ ئاغای شهبازی بەبێ‌ئەوە سەرنجی ئەو باسە بناغەییە بدات، (لەوانەیە لەروانگەی ناوبراوەوە پووچەڵ) لەمە بەدوواوە دەچێتە سەرزەوینی (لەدایکبوون و پەروەردە بوونی) کورش و دەس‌بەداوێنی هێرودیت و چیرۆک‌وێژانی کۆن ئەبێت، و سەرەرای بەخشینی رەنگ‌ولەعابێکی تۆخی نەتەوەیی بەوانە، دەیسەلمێنێت کە ئەم مێژوونووسە ئێرانییەمان هیچ شتێکی دیکە فێر نەبووە. بەهەر حاڵ پێش لەوە بچینە سەر رەخنەگرتن لە رەچەڵەکنامەکەی هخامەنشییەکان، پێویستە ئاورێک لەروانگەکەکانی ئاغای پیرنیاش بدەینەوە.

بەرانبەر نووسراوەکەی داریوشی یەکەم و ئەردەشیری دووەم و سێهەمی هخامەنشی، **ویشتاسپ، ئەرشام و ئاریارەمنا** پادشاه نەبوونە. هخامەنشیش پادشابوو بەلام نەوەکو کورش پادشاهێکی مەزن و داریوشی یەکەمیش نابێ بەمەزنی بنامەڵەکەی بزانین. کەوابوو، قسەکانی داریوشی یەکەم راستە، ئەگەر بیانژمێرین، ٨ کەس پێش لەئەو پادشابوونە و جیاوازییەک لەنێوان گریمانە و قسەکانی داریوشدا نییە.

کەوابوو ئاکامەکەیّ ئەمەیە: بنەماڵەیّ هخامەنشی لەخێڵی پاسارگادەکانەوە سەری هەڵداوە و لەپارس نیشتەجیّ بوون. دووایی کە ئیلام لاواز بوو یەکی لەپادشاکانی هخامەنشی ئانزانی خستە سەر خاکەکەی و خویّ وەکو پادشاهی ئانزان ناساند. لێرەدا پرسیارێک دێتە ئاراوە کە لەکاتی کام یەک لە پێشینیانی کورش ئەم ڕووداوە قوّماوە. هەرچەن کە بەڵگەیەکی ڕوون و ڕاستەخوّ بوّ ئەم پرسیارە بەدەستەوە نی‌یە، بەڵام لەوەیّ کە کورش لە جارنامەکەیّ بابوّلدا لەخوارەوە ئاماژەیّ پێدەکەین، ڕەچەڵەکی خوّی ئەباتەوە بوّ چیش پیشی دووەم و پادشاکانی ئانشان تادەگاتە ناوبراو و (بەوەشەوە) پادشاە مەزن ناسراون. ئەو پەڕی پێشینەی پادشاکان دەچێتە سەر چیش پیش دووەم و لەبەر ئەوە ئانزان هەیمەنەیەکی مێژوویی هەبووە خوّیّ بەپادشایّ مەزن ناساندووە. **داریوشی یەکەمیش لە ناساندنی ڕەگەزی خوّیّ وەکو کورش کاتیّ دەگاتە چیش پیش دووەم، ڕادەوەستیّ و خەیّرا نێوی هخامەنش ئەبات کە یەکەم کەس لە زنجیرەیّ هخامەنشییەکانە.** (حسن پیرنیا، تاریخ ایران باستان، ل ٢٣٠)

ئەمە هەموو ئەو شتەیە کە ئاغای پیرنیا دەربارەیّ بنەماڵەیّ هخامەنشیەوە دەینووسیّ کە شیاوی تێروانینێکی ڕەخنەگرانەیە. ئەگەر لەسەر بیّ سەرنجی ناوبراو لە ووتنی ڕستەیّ (داریوش یەکەمیش لە ناساندنی ڕەگەزی خوّی وکو کورش کاتیّ کە دەگاتە چیش‌پیشی دووەم، خەیّرا نێوی هخامەنش ئەبات) ڕانەوەستین، پێویستە بێژین کە کورش لەگڵە نووسراوەکەیدا نێوی هخامەنشی نەبردووە، و ووردبینی ئەو کە ژمارەی پادشاکانی پێش لە داریوش، بە ٨ دەزانیّ و داریوشیش ئەو ژمارەیە دەس‌نیشان دەکات، و هەروەها کە کورش سیّ کەسایەتی وەکو باب و باپیر و باپیرە گەورەی دەناسێنێت، زوّر باڵکێشە. دوو دڵی پێشتر و ٧٠ ساڵەیّ ئاغایّ پیرنیا لە ڕەچەڵەکنامەیّ هخامەـ نشییەکان، سەربەرزی پێشەنگی ئەم ووردبینییە بەناوبراو دەبەخشیّ. لەگەڵ ئەوانەشدا ئاغایّ پیرنیا کوّمەڵیّ باسی خستووتە سەر بەڵگەکان کەقسەیّ زوّری لیّ ئەبێتەوە. بەرێزیان بوّ پاساکردنی ڕەقەمی ٨ کە داریوش ڕایگەیاندووە، نەتەنیا لە شێواندنی نێوّ و ڕاگەیندنەکان کوّناکاتەوە، بەڵکو دەنووسیّ کە بەرانبەر نووسراوەکانی داریوشی یەکەم و ئەردەشیری دووەم و سێهەم، ویشتاسپ، ئارشام و ئاریارەمنە پادشا نەبوونە. هەرچەن ناوەڕوّکی ئەو نوسراوانە شتی وەهای لی نابێتەوە، بەپێچەوانە، هیچ نەبیّ ئارشام و ئاریا ڕەمەن لە دوو نووسراوەیّ جیاوازدا خوّیان بە پادشاە ناساندووە و لە بەرئەوە کە ئاغایّ پیرنیا بڕوا بە سەختەبوونی بەڵگەکانی ئارشام و ئاریا ڕەمنە ناکات، دیارە کە بە هەرحاڵ مەبەستی گوّڕینی ڕواڵەتی پرسەکەیە، بەڕادەیێک کە بتوانیّ

بە دڵنیاییەوە قسەکەیٚ داریوش بەڕاست بزانێت و بنووسێت: (کەوابوو قسەکەیٚ داریوشی یەکەم ڕاست دەر ئەچیٚ، ئەگەر بیژمێرین ٨ کەس پێش لە ئەو پادشاه بوونە و جیاوازییەک لە نێوان ئەو گریمانە و ووتەکەیٚ داریوشدا نی‌یە). بادانەوەیٚ ئێران‌ناسان و مێژوو نووسانی ئێرانی دێرینە لە تۆژینەوەی ڕەگەزناسی هخامەنشییەکان، شایەتێکی دیکەیە بۆ پیٚچەقاندن لەبە نرخ بوونی ئەو بنەماڵە، وەکو بناغەدانەرانی شارستانیەتی کۆنی ئێرانی. هەروەها کە ویستهوفر لە کتێبی ئێران باستاندا کە ساڵی ١٩٩٣ بڵاو بووەتەوە، هەرچەن کە ناوەڕۆکەکەی لە ڕیزی ڕوانگە نوێیەکاندایە، بەڵام ئیلا دووبارەکردنەوەی مژارە بیٚنرخەکانی گزنفون نەبیٚ نەچووەتە نێو پرسی ڕەگەزناسی هخامەنشییەکان.

(لەم حاڵەدا ئێمە بەبڕواکردن بەوە کە ئەم کەسایەتیە "کورش" شیاوی هەمەرجۆرە پیٚزانینێکە، بەدووای ڕۆشن کردنەوەی ڕەچەڵەکی ناوبراودا گەڕاوین بۆئەوە بزانین کە ئەوە چ کەسانێیەک و خاوەنی چ توواناییەکی سۆرشتی و لە چ شێوەیەکی پەروەردە و فێرکردن بەهرەمەند بووە کە تووانوییە بەۆجۆرە سووک و ئاسان بێتە سەروەر و فەرمانرەوای مرۆڤی ئەوکاتە. بەم بۆنەوە ئەوەی کە ئیستا لەم بارەوە بینیومانەتەوە ویا وەها بیری لیٚدەکەینەوە کە لەم بارەوە دەیٚزانین، ڕایدەگەیەنین. شاهەنشاه کورش مەزنترین و پرشکۆترین پادشاکانی سەرانسەری ئاسیا بوو- و شایەتی ئەم ڕاستییە خۆدی ئیمپراتورییەکەیە. چوونکە سنوورەکانی لە ڕۆژهەڵاتەوە ئۆقیانوسی هێند و لە باکوورەوە دەریای ڕەش لە ڕۆژئاواوە قیبرس و میسر و لە باشوورەوە دەگەیشتە حەبەشە. وئەم ئیمپراتورییە زەبەلاحە، تەنیا بەئیرادەیٚ تاقانەیٚ کورش بەڕیٚوە دەچوو؛ و نەتەوە بندەستەکان وەکو منداڵەکانی خۆیٚ لەلا خوشەویست بوو و خەمساری ئەوانەیٚ دەکرد. ئەم خوشەویستییە یەکلایەنە نەبوو و ئەوانەش وەکو بابی خۆیان کورشیان خۆش دەویست و لایان بەڕوومەت بوو. **لەگەل ئەوەشدا، کاتیٚ کورش کۆچی دووا"یی کرد، منداڵەکانی بە یەکجاری کەوتنە گیانی یەکتر، هۆز و خێلٚ و دەوڵەتەکان یاخی بوون و هەموو شتێک تێکچوو.** (یزف ویستهوفر، ایران باستان، ل ٦٣)

لەروانگەیٚ گزنفونەوە ناسنامەیٚ کورش هەمان سنووری جوغرافیای وڵاتانی داگیرکراوی ناوبراوە و ڕێگایەک بۆ ڕەچەڵەکی هخامەنشییەکان ناکاتەوە! لەبەشی پێشوودا ووتم کە کورش و داریوش بەوٚ شێوە کە لە بێستون و بابۆلدا تاپۆکراوە، هیچ شوێنەوارێکی ڕەگەزیان لە ئێراندا نی‌یە و ناتووانین نیشتەجیٚ بوونی ئەوانە لە ئانشان، وەکو پادشاه، و تەنانەت لە باەیٚ باپیرانیشیەوە، بەسەلمێندراو بزانین. چوونکە لە هەلسەنگاندنەکانمان لە وەرزی پێشوودا گەیشتینە ئەو شوێنە

که سەرکەوتنی کورش بۆ تەختی ئیمپراتوری گەورەی ڕۆژهەڵات ، گوایە لەپڕ و یەکشەوە ڕوویداوە و بەڵێنم دا کە چۆنیەتەکەی لەبەشی کۆتایی کتێبەکەدا هەڵسەنگێنم . ئێستا ناچارم بەپێچەوانەی داریوش ،کە لە هەشت پلەی پادشاهییەوە سەرکەوت ، بۆ دۆزینەوەی ڕاستی و ناڕاستی گریمانەکەی ناوبراو ، لەو پلیکانانەوە دابەزم . بەرزترین پلە هخامەنشە ، کە گومان دەکرێ لە ٧٠٠ ساڵ پێش زایینی ، لە شوێنێکی نادیاردا بنەڕەتی ئیمپراتورییەکەی داڕشتووە . بۆیەکەم جار نێوی باغەدانەرە لە بەردە نووسراوەکەی بیستوندا دەبینین . ٨٠ ساڵ پێشتریش ، لەساڵی ١٩٢٠دا دوو نووسراوە بەنێوی ئاریاڕەمن و ئارشام ، باپیر و باپیرەگەورەی داریوش ، دۆزرایەوە . ئەم دوو بەڵگە تەنیا بەزمانی پارسی دێرینە نووسراوە و پێکهاتەکەی بەمجورەیە :

(ئاریا رەمن پادشاە مەزن ، پادشاهی پادشاکان . پادشا لەپارس ، کوڕی چیش پیش شاە ،کوڕەزای هخامەنش ، ئاریا ڕەمن شاە ئەیژی : ئەمولاتەی پارس کەمن هەمە ، خاوەنی ئەسپگەلی باش و زەلامانی باشە ، خوادی مەزن ئەهورا مەزدا بە منی بەخشیوە و بە ویستی ئەهورامەزدا من بووم بەپادشاهی ئەم ولاتە .

بەڵگەکەی ئارشامیش دووبارە کراوی ئەم چەمکەیە ، و تەنیا جیاوازی ئەوەیە کە لە دێری یەکەمیدا ، لە شوێنی ئاریا ڕەمن ئارشام ، و لە شوێنی چش‌پش ئاریا ڕەمن دانراوە . ئەم دوو نووسراوە بە شێوەیەک دۆرست کراون کە سێ خاڵی گومان لێکراو سەرڕاست دەکاتەوە . وشەی پارس وەکو سەرزەوینی باوانی داریوش ، نێوی هخامەنش وەکو سەرۆکی زنجیرە پادشاهیەکە و نێوی ئەهورا مەزدا ، کە خوداوەندی دەسکردی داریوشە ، نووسراوە خوڵقێنەران بە ڕوشنی مەبەستیان ئەوە بووە کە پێشەنگی مێژوویی بەم سێ بڕیارە گەورەی داریوش ببەخشن .

سەرەڕای ئەوە لە پاسارگادیشدا کورتە تێکستێک بە پیتی فارسی دێرینە ، ئیلامی و بابۆلی نووسراوە :" من کورش ، شاە هخامەنشی" .

ئوژن فلاندن ڕایدەگەیەنێ کە لە ساڵی ١٨٤١ زایینیدا ، لای سەرووی نەقشەباڵدارەکەی پاسارگادەوە هەمان تێکستی بەهەمان پیتەوە بینیووە . بەمجۆرە نێوی هخامەنش ، کە بەرلە دۆزینەوەی بەڵگە دوو لایەنەکانی ئاریا ڕەمەن و ئارشام و بەردە نووسراوە کورتەکانی پاسارگاد ، تەنیا لە نووسراوەکەی بێستوندا بینراوە . شایەتێکی کۆنتری دۆزیەوە و ناتەواویی گلە نووسراوەکەی کورش کە نێوی باپیرەگەورەی ناوبراوی تێدا نەبوو ، قەرەبوو کردەوە . بەڵام گرێ کوێرەکە لێرەدایە کە کاتی کورش ،

**ئاریارەمن و ئارشام ، هێشتا پیتی پارسی دێرینەمان نەبووە کە ئەوان ئەم نوسراوانەیّ پیّ بنووسن .**
**مێژوونووسان نووسینی وەها پیتێک لەکارە بناغەییەکانی داریوش دەزانن .**

( سەرەڕایّ ئەوەش لەسەر وێنەیّ دیلەکان نووسراوەگەلێک دیسان بە پیت و زمانی ئیلامی نووسراوە . ) بەڵام بابۆلیش لەڕیزی ئیمپراتوریەکەدا بوو و بەوّ بۆنەوە داریوش فەرمانی دەرکرد کە لەلایّ چەپی بەشێک لەو بەردە هەڵکەنراوانە و لەبەشی بەرزتری زنارەکە ، جێگایەک بۆ تێکستێکی بابۆلی ئامادە بکەن و بەزمانی بابۆلی لەسەری بنووسن و بۆ نووسین لەسەر وێنەیّ دیلەکانیش شوێنێک هەربەوزمانە لەبەرچاو بگرن . بەڵام شاە هێشتا دڵخوەش نەبوو . کەشێکی پرقەێران بوو . ئەربابانی ئیمپراتورییەکی جیهانی لەخوێەوە پیتێکی بۆنووسین نەبوو و تەنیا لە پیتی نەتەوەکانی بندەستی کەڵکی وەردەگرت . کەوابوو داریوش فەرمانێکی بۆ نووسەرەکانی دەرکرد تا بەزووترین کات پیتێکی نووسین بۆ ئیمپراتوری پارس دابهێنن . ئەمنووسەرانە ئیلامی بابۆلی و ئارامی بوون . زمانی ئەوانە جیاوازی زۆری لەگەڵ زمانی فارسی کۆنداداهەبوو . زمانی بابۆلی و ئارامی لەبنەماڵەیّ زمانە سامیەکان و پەیوەنییەک لەنێوان زمانی ئیلامی و زمانەکانی دیکەدا هێشتا نەدۆزرابووەوە . بەڵام زمانی فارسی یەکی لەزمانە هێند و ئوروپییەکانە . نووسەرەکان بۆ ئەم زمانە٣٧ نیشانی (پیت) بزماری نویّیان داهێنا . پێکهاتەیەک لە نیشانە سەرەکی و دەنگدارەکان . پیتی تازە لەبەر تایبەتمەندی زمانی نووسەرە داهێنەرەکانی ، پیتێکی یەکدەس نییە . ئێستا پێویستە کە کارنامەیّ گەورەیّ داریوش ، بە پیتی نویّ فارسی دێرینە و بەزمانی دێرینە ، خراێە سەر یادنامەکانی داریوشی مەزن لەبێستوندا . بەڵام ئیتر شوێنێک بۆ نووسین نەمابوو! . پاش ئەوە داریوش فەرمانێکی دیکەی دەرکرد شوێنی ژێر ڕووبەری وێنەیّ دیلەکان سافوسۆڵ بکەن و نووسراوە فارسییە دێرینەکانی تێدا بنووسن . وەستاکارە بەرد تاشەکە بە زانیارییەوە ئەوشوێنەی بەجیّ هێشتبوو لەلایّ سەرووییەوە چەدرز و قڵیشی سۆرشتی لەتەختە بەردەکەدا دۆرست بوو بوو و ڕادەیەکی بەرچاو ئاوی تێدا سەرەوخوار دەبوو . لەبەر ئەوە نووسراوە فارسییەکە تووشی فەوتان بووە . پاش ئەوە ئیتر شوێنێک بۆ نووسین نەمابوو . داریوش لەو بەشە تازەیّ بەردەکەدا دەڵیّ : کە پیتێکی نویّ داهێناوە ( DB ، 70 ) . **لە نووسراوەی تەنشتی دیلەکانیشدا دیارە کە تێکستە بزمارییەکەی زمانی فارسی دێرینە لەڕاستیدا لە قۆناخی دوواییدا خراوەتە سەر کارنامە سیّ زمانەکە** . چوونکە سنووردار بوونی کەشی نووسینە کە بەتەواوی دەبینرێت . بەتایبەت نووسراوەی چوارەمین دیل ، فرە ئۆرتس (فارسی دێرینە : خشتریتە) لەسەر جلوبەرگ و لەخوارپشتوێنەکەیەوە نووسراوە و لەلایەنی راستی لەشیەوە تادەگاتە زەمینەیّ نووسراوەکە ، درێژەیّ هەیە و ئەمە بەوّ واتایە کە چ‌شوێنێک بۆ نووسین نەمابووەوە) . (هاید ماری کخ ، از زبان داریوش ، ل ٢٥ _ ٢٣ ) بەرتەسکی **ڕووبەری نووسینەکە کەتێکستی فارسییەکۆنەکەیان تیدا نووسیوە ، ڕوومەتێکی جوان بە لێکدانەوە**

کەی خانمی کۆخ ئەبەخشیّ . بێگومان ئەگەر پێش لە داریوش ، پیتی بزماری فارسی باستان هەبووایە ، ئیمپراتور چیرۆکەکەیّ لە شوێنێکی باشتردا دەنووسی(١) . تۆژینەوەیّ زۆر هەیە کە سەرهەڵدانی پیتی بزماری فارسی دێرینە بەسەرەتای داگیرکردنەکەیّ داریوشەوە گریّ ئەدەن و هیچ کام لە پشکێنەرانی نوێ ئیستاکە ، نووسراوەکانی ئاریارەمن و ئارشام و هەروەها دێری کۆرتە نووسراوەکەیّ پاسارگاد بەشێوە پیتی بزماری فارسی دێرینە بەڕاست نازانن . پیتێک کە تەنیا زمانحاڵی نووسراوە بەردینەیّ پادشاکانە و لەبەڵگەنامە فۆرمیەکاندا چ شوێنەوارێکی نییە .

(دوو نووسراوە بەنێوەکانی ئاریا ڕەمنس (ئاریاڕەمن) و ئەرسامس (ئارشام) بەدەسمانەوەیە کە داریوش ئەوانەیّ بە باپیر و باپیرە گەورەیّ خۆیّ دەناسێنیّ . بەڵام ئەمبەڵگانە ئەوەندە جێگایّ دڵنیایی نین . لە ڕاستیدا لەلایەکەوە دەربارەی ڕەسەن بوونی ئەوانەوە گومان و دوو دڵی تەواو هەیە و لەلایەکی دیکەوە ووتەکانی داریوش، خۆیّ گومان لێکراو دەکەونە پێش چاو. (بریان تاریخ ئیمپراتوری هخامنشییەکان ، ل ٧٢)

لەم حاڵەدا دیار نییە کە نووسراوەکانی ئاریا ڕەمەن و ئارشام ، واتا باپیر و باپیرە گەورەیّ داریوش ، کە لە نووسراوەکاندا خۆیّ بە "پادشاهی پارس" دەناسێنێت ، لەبەرچی ئەبیّ لە هەمەداندا بدۆزرێتەوە ؟ گیرشمەن دەنووسیّ :

جێگری ئاریا ڕەمنە ، کوڕەکەی ئارشامە بوو کە ئەوەش بەڵگەنامە زێرینەکەی ماوەیەکی کەمە لە هەمەداندا دۆزراوەتەوە . ئارشامەش وەکو بابی خۆیّ بە شاە مەزن ، شاە شاهان ، شاە پارسە ، کوڕی ئاریا ڕەمنە ، دەناسێنێت و ناوەڕۆکی بەڵگەکە لەگەڵ ئەوەی بابیدا جیاوازی نییە . دەکریّ کە کورش ئەم دوو بەڵگەنامەیلە نێو بەڵگەنامەکانی بارەگای ئیمپراتوریدا بۆ هەمەدان گواستبێتەوە . ئێمە ئەم پرسە لە شایەتی تەوراتەوە زانیوە . (گیرشمەن ، ایران از آغاز تا اسلام ل ١٣١)

ئاغایّ گیرشمەن ڕۆشنی ناکاتەوە کەبۆچی کورش بەڵگەیّ زێرینی دوو داواکاری پادشاهی پارسی ، کە بەرانبەر گڵە نووسراوەکەیّ بابۆل لەڕاستیدا کورش دانی پێدا نەناوە ، لە ڕەچەڵەکنامەکەی کورش لە بابۆلدا نێوی نەبراوە ، لەگەڵ خۆیدا وەکو "بەڵگەنامەیّ ئیمپراتوری "بۆ هەمەدان گواستویەتەوە ؟ .

١ـ هەروەها کە لە نووسراوە سیّ زمانەکانی تەختی جەمشید و تەنانەت لە دێری نووسراوە سیّ زمانە سەختەکەی پاسارگاد و نووسراوە سیّ زمانەکانی سەردەمانی دوواییدا ، لە هەموو شوێنێکدا پیتی بزماری فارسی دێرینە پێشتر لە پیتەکانی دیکە نووسراوە کۆتایی ئەم پیتە لە نووسراوەکانی بیستوندا بەئاسانی دەیسەلمێنێت کە لە دەسپێکی کار لە سەر نووسراوەکەی بیستون ، ئەم پیتە هێشتا دانەهاتووە .

ئەگەر بەڵگەنامەی لەو جۆرە بەورادەیە پڕنرخ بوایە، هیچ نەبێ لەرەچەڵەک نامەکەیدا ئاماژەیٚ بەم دوو پادشا مەزنە دەکرد . لە هەمان حاڵدا تەوراتیش ڕۆشنایی نەخستووەتە سەر گواستنەوەیٚ بەڵگەکانی ئیمپراتوری بۆ هەمەدان، هەروەها گیرشمەن بروایٚ پێیە . گیرشمەن نانووسێت کە ئەوٚ مەبەستەی لەکام بەشی تەورات وەرگرتووە، بەڵام لەوانەیە مەبەستی ناوبراوئەم ئاماژەیٚ تەوراتە بێت .

(ئەوکاتە کە داریوش پادشا فەرمانی دا کتێبخانەکەی بابوڵ کە بەڵگەنامەکانی ئیمپراتوری تێدا دەپارێزدرا، پشکینن . لەکۆتاییدا لەکۆشکی ئیکباتانە کە لە سەرزەوینی مێدیاکاندا هەڵکەوتبوو بەڵگەیەکی تۆمارکراویان دیتەوە کە تێدا نووسرابوو : لە ساڵی یەکەمی پادشاهی کورشدا دەربارەیٚ ماڵی خوٚدا لە ئورشلیم ئەم فەرمانە لەلایەن پادشاوە دەرچوو . (عهد عتیق، عوٚزرا، ٣ـ١ :٦)

بەڵام تەنانەت لەم چیروکەشدا دەبینین کە تەورات ، بابوڵی بو پاراستنی بەڵگەنامەکان دەس‌نیشان کردووە نەوەک هەمەدان . دیسان ئەم گریمانە کە هەمەدان ناوەندی پاراستنی بەڵگەنامەکانی ئیمپراتوری بێت، بۆچی لەگەڵ ئەم دوو بەڵگە زێرینە بەڵگەیٚ دیکە نەدوٚزراوەتەوە ؟ ئەگەر بێژین ئەم گەنجینە لەگەڵ ڕەوتی زەمەندا کەوتووەتە بەر پەلاماری دزو تاڵانچییەکان لەوانەیە ئەوانەش بەبوٚنەی سەختەبوونی ئەو بەڵگانە زێرینانە، نرخێکی وەهایان بۆ دانەناوە! . لەکۆتاییدا ئەگەر قبووڵی بکەین کە ئەو ڕوویەلە ئاڵتوونیانە، کورش لە پارسە بۆ هەمەدان گواستبێتیەوە، بۆچی داریوش بەڵگەیٚ گرێدراوی باپیرانی ، کە لە نووسراوەکەی بێستوندا وەکو پادشاه یادی لێکردبوون، بۆناوەندی دەسەڵاتداریەتیخوٚیٚ لەتەختی جەمشیددا نەگواستەوە؟ و لەبەر ئەوە گڵە نووسراوەکەیٚ کورش لەبابوڵدا بە پیتی بزماری بابۆلییە، ناتووانرێت بروا بەوە بکرێت ئیمپراتورییەکی سەرکەوتوو، کە بە پیتی فارسی دێرینە (ئەگەر نووسراوەکانی پاسارگاد بەسەردەمی کورش بزانین) ئاشنا بووە، باسی سەرکەوتنەکانی خوٚیٚ بە پیت و زمانی نەتەوە داگیرکراوەکان بنووسیٚ و لەکۆتاییدا ئەوٚ پرسەیٚ کە داریوش ئەڵێ، کاتی دەسەڵاتداری خوٚی ویشتاسبی بابی و ئارشامی باپیری، هێشتا زیندوو بوون:

( بە ویستی ئەهورامەزدا بابی من ویشتاسب و باپیرم ئارشام هەردووکیان زیندوو بوون، کاتیٚ کە ئەهورامەزدا منی کرد بە پادشاهی ئەم وڵاتە . "نووسراوەکەیٚ داریوش لە شوشDSr، بند٤" )

داریوش لە ساڵی ٥٢٢ ی پێش زایینی و کاتێک ٣٠ ساڵ لەتەمەنی تێپەڕ بووگەیشتە تەختی پادشاهی .

هەر وەها خۆیٚ دەڵێ ، لەو سەردەمەدا ویشتاسبی بابی زیندو بووە و بە پادشا دەیناسێنی .

(داریوش شاە ئەڵی : ٨ کەس لە تۆخمەیٚ ئێمە پادشاە بوون . من نۆهەمینم . ئێمە ٩ کەس پشتاوپشت پاشاهین) .
(کتیبهٔ بیستون ، ستون ١٠ بند ٣)

چۆنچۆنیە کە لە سەردەمی ژیانی پادشاهێکدا کوڕەکەشی ئەبێ بە پادشاە و ئەگەر ئارشام ، واتا باپیری داریوشیش ، لە هەمان کاتدا زیندو و پادشاە بووبێ ، بەپێچەوانەیٚ باوڕەکەیٚ سەعدی شیرازی ، سێ سوڵتان لە یەک هەرێمدا گونجاون و هیچ ڕوونکردنەوەیەک کە دوو پادشایٚ زیندو دەسەڵات بۆکوڕ و کوڕەزاکەیان بگوێزنەوە پەسەنکراو نییە . و لەبەر ئەوە وەها ڕووداوێک بەو شێوە لە مێژوودا بێ پێشینەیە ، هیچ نەبێ پێویستە بەڕۆشنی بنووسم کە داریوش لەبەردە نووسراوە- کەیٚ بێستوندا و لە هەموو هێڵە سەرەکییەکاندا قسەیٚ ڕاستی نەکردووە ، هەرچەن کە جاربەجار ووتویە کە"من ڕاستیم خوەش دەویٚ" . پیرنیا لە کتێبی"ئێرانی دێرینەدا"لەپەڕەی ٥٢٢ ، لە زاری هێرودیت و قەولی داریوشەوە دەنووسی :"لەو شوێنەدا کە درۆ پێویستە ئەبێ درۆ بوترێ ، چوونکە مەبەست لە درۆ و ڕاست یەکە" !

هێشتا ئەبێ سەرنجی خاڵێکی دیکە بدەین : ئەگەر داریوش لە ٥٢٢ پێش زایینیدا ، پادشایە ، دەکریٚ ویشتاسبی بابی دەوروبەری ٥٥ ساڵ و ئارشامی باپیری ٧٥ ساڵ لەتەمەنیان تێپەڕ بووە . لەمحاڵەدا پادشاهی ئارشام کە پادشاهی مەزن و خاونی وڵاتێک کە ئەسپگەلی چاک و زەلامانی چاکی هەبوو ، هاوکاتی دەسپێکی پادشاهی کورش و پادشاهی ویشتاسب ، لە کۆتایی پادشاهی کورشدا بووە ، کە خۆیٚ بە پادشاهی ئانشان ناساندووە . لەبەرئەوە کە ئانشان لەدەور و بەری پارسدا هەڵکەوتووە (وەکو ئەڵێن) ، پادشاهێک وەکو کورش کە خۆیٚ بە پادشایٚ چوارگۆشەیٚ جیهان زانیوە و هەروەها کە دەزانین باپیری خۆیٚ (لەلایە ن دایکیەوە) لە پادشاهی مێدیا بێبەری کرد ، چۆن (پادشاهی مەزن و پادشاهی جێهانی) لەپاڵ دەستی خۆیدا قبوڵ کردووە ؟ ، تەنانەت ئەگەر خزم و کەس وکاری ئەوەش بووبێتن .

(ئاستیاگ سوپایٚ ئامادە کرد و بەمەبەستی شەڕ و سەرکەوتن بەسەر کورش پادشایٚ ئانشاندا بەرێکەوت . سوپایٚ مێدیا دژی ئاستیاگ دەرکەوتن و ناوبراو خرایە بەندیخانە . ئەویان ڕادەستی کورش کرد . کورش ڕوو بەهەمەدان ڕێکەوت . زێڕ و زیو و کەرسە و هەموو دەسکەوتەکانی بۆ ئانشان هەنارد . . . (پی یر بریان تاریخ امپراتوری

هخامەنشییەکان، ل ١٠٢)

ئەگەر من بەوڕادیە کەمترخەم بووایەم کە بۆ ووتەکەی هێرودیت بگەڕێمەوە، ئەوکاتە زۆر پەرێشان ئەبووم، چوونکە هێرودیت، ویشتاسب بابی داریوش بەپادشاە نازانێ و ئەڵێ یەکی لە سەربازەکانی کورش لە شەڕی ماساژتەکاندا بوو و دەنووسێ کە لەبەر خەونێک کە بەداریوشەوە دیبووی ویشتاسبی خستبووە بەر پرسیار و لێکۆڵینەوە!.

پاش ئەوە کە لەڕووباری جەیحون پەڕینەوە، کورش لە سەرزەوینی ماساگتەکان خەوی لێکەوت، لەخەوندا داریوش کوڕی ویشتاسبی بینی کە دووباسک لەسەر شانی ڕووابوو. وباسکێکی لەسەر ئاسیا و باسکەکەی دیکەی سێبەری خستبووە سەر ئوروپا. کوڕەکەی ویشتاسب، کوڕەزای ئارشام لەبنەماڵەی هخامەنشی ونێوی داریوش و لە وکاتەدا تەمەنی ٢٩ساڵ و هێشتا نەگەیشتبووە مەرجی سەربازی. کاتێک کورش خەبەری بووەوە، سەبارەت بەخەونەکەی تووشی دڵەڕاوکی بوو و وەها لەیەکی داپەوە کەڕووداوێکی زۆر گرانی لە پێشداپە. پاش ئەوە ویشتاسبی بانگیش کرد و بەمەبەستی ووتوێژ ناوبراوی بردە سووچێک و ووتی: ئەی ویشتاسب، بۆمن ڕۆشن بووەتەوە کە کوڕەکەت دژی من و تاج و تەختەکەم خەریکی ئاژاوە گێرییە. سەرچاوەی هەواڵەکەش کە بە هیچ جۆرێک گومان لێکراو نییە، باسی دەکەم. دوێ شەو کاتێک نووستبووم و خوداوەندان هەمیشە من دەپارێزن، کوڕ گەورکەتم لەخەودا دیت کە دوو باسک لەسەر شانی ڕووابوو. باسکێکی لەسەر ئاسیا و باسکێکی لەسەر ئوروپا سێبەری خستبوو. بێگومان نیشانەی ئەم خەوە ئەوەیە کە ئەو دژی من خەیاڵی سەر هەڵدانی هەیە. لەبەر ئەوە پێویستە تۆ بۆ ئێران بگەڕێتەوە وکاتێ من لەم شەڕە بەسەرکەوتوویی گەڕامەوە ئەو گەنجە بۆلێ‌پرسین بهێنیتە خزمەتم). (هێرودیت، تواریخ، ترجمه وحید مازندرانی، ل ١٠١)

بەم جۆرە ڕەچەڵەک نامەی داریوش بەرانبەر بەڕەچەڵەک‌نامەکەی کورش نادۆرست دیاری ئەدا و لەبەر ئەوە کە ئیمڕۆ، بەهۆکاری جۆربەجۆرەوە، لەوانە نادۆرستی سەرسووڕهێنەری سێ نووسراوەی ئاریارەمەن، ئارشام و کورش بەپیتی بزماری ئێرانی دێرینە (١)، ئیتر لەدۆرستی دوو بەڵگەنامەی ئاریا رەمنە و ئارشام و بەردەووسراوەکەی کورش لەپاسارگاددا هەواڵێک نییە و لە سەختەبوونی ئەم بەڵگانە کە بەتایبەت بۆ پشتەوانەی ڕەچەڵەک‌نامەی بەردە نووسراوەکەی داریوش لە بێستونداخوڵقێنراون، گومانێکمان نامێنێت و بەبێ جیاوازی مێژوونووسانی نوێ نادورستی ئەوانە دووپاتی دەکەنەوە. کەوابوو ڕەسەنیەتی زنجیرە پادشاهیەک کە بۆ لکاندنی بنەماڵەکەیان بە

١ ـ لەبارەی ئەم هەڵانەوە سەرنجی شارپ بدەن لە پراوێزی خوارەوەی ئە نووسراوانەدا.

بناغەدانەرێک ، سەرزەوینێک و یەک خوّدا و بوّسەلماندنی پێشینەیەکی دوور و درێژی پادشاهی لەبنەماڵەکەیاندا ، ٢٥٠٠ ساڵ پێشتر بە خوّلقاندنی بەڵگەیەکی سەختە هەڵدەستن ، پووچەڵ دەبێتەوە و دەتووانین کورش بە یەکەمین پادشاه بزانین کە لە هوّزێکەوە سەریٚ هەڵداوە کە سەرزەوین و هەرێمێک بوّ ئەوانە ناناسین .

هەمیشە ئەم ئیدعایٚ داریوشە کێشەیٚ لیٚبووەتەوە کە خوّیٚ بە نوّهەمین پادشاه لەبنەماڵەیٚ هخامەنشی زانیوە؛ چوونکە ئەگەرئیدعاکە ڕاست بوواێە ، ئارشام وئاریارەمنە ، باپیروباپیرە گەورەیٚ ئەودەبوون بە نوّهەمین پادشاه ، لەحاڵێکدا هاوسەردەمی کورشی (مەزن) وکەمبوجیەی یەکەم بوون و بە شایەتی بەڵگە فورمیەکەیٚ کورش ، کەمبوجیە یەکەمیش پادشاه بووە . ڕوّشن کردنەوەیٚ ئاساییئەم دژوارییە ، کە ساڵانێکی زوّر دەبوو بە بەڵگەیٚ دڵنیایی پشکێنەرانی سەردەم ، ئەوە بووە کە بەرواڵەت چیش پیش بەرلە مردنی ، وڵاتەکەیٚ لەنێوان دوو کوڕەکەیٚ ، واتا کورشی یەکەم و ئاریارەمەندا دابەش کردوە و لەپارس و ئانشان بوون بە پادشاه . بەرانبەربەم گریمانە ، پادشاهی لەم دووبنەماڵەدا درێژەیٚ هەبووە تا دەگاتە کورشی مەزن و داریوشی یەکەم .

هەرچەن ئەم گریمانەیە سەرنجێک دەنوێنی ، **بەڵام بەداخەوە وەکو یارێیەکی زیرەکانەیە کە وێنەیٚ دەسکرد لە ڕاستیە مێژووییەکان زوّرتر ڕەنگی تێدا داوەتەوە** . تەنانەت بە دوّزینەوەی دوو ڕوویەلە زێرینەکەی ئارشام وئاریارەمەن لە هەمەدانیشدا گروپێک بە مەبەستی سەلماندنی ڕاستی ئەوانە دەستیان بەخەبات کرد . **بەڵام هەڵسەنگاندنەکان سەختە بوونی ئەوانەی زوّرتر دەسەلماند .**

تا ئەم دوواییە شوێنی ئانشان دیاری نەکرابوو وتەنیا لەسەر گومان و گریمانە شوێنێکیان لە دەور وبەری ڕووباری کەرخەدا بوّ دابین کردبوو . بەڵام ئیستا دەزانین کەشارێک بووە لە ناوەندی تەختاییەکانی مەروڤدەشت لەشوێنی تل ملیانی هەنووکەییدا کەتەنیا ١٠٠ کیلومیتر لە تەخت جەمشیدەوە دوورە و بەم جوّرە دەرئەکەوی کە لە خوزستانەوە زوّر دوورە . بەم بوّنەوە ئەبیٚ ئانشان بە بەشێک لە هەرێمەکە بزانین کە لە نووسراوەکانی هخامەنشی فارسدا خوێنراوەتەوە . ئەگەری زوّرهەیەکە ئانشان نێوێکی ئیلامی یان مێزوپوتامیایی هەرێمی فارسی ئیستا **بوویٚ و تەنیا پاش جێگیر بوونی هخامەنشییەکان لە ناوچەکەدا، نێوی پارسیان لیٚناوە؛ هەرچەن بەگویرەی بەلگەیٚ بابوّلییەکان، لە ساڵانی دەسپێکی پادشاهی کورشدا وەکو ساڵانی پێشوو، ووتنی نێوی ئانشان باو بووە. تەنانەت خوّدی کورش لە جاڕنامە بەناوبانگەکەیدا خوّیٚ وەکو پادشایٚ ئانشان دەناسێنیٚ و نێوی پارس پاش جێگیربوونی ئیمپراتوری لە ساڵانی دوواییدا کەوتە سەرزاری خەڵک. بەم جوّرە دەبینین کە مەبەست داریوش لە "نوّ کەس" زوّر ڕوّشن نییە؛ چوونکە ئانشان و پارس دوو سەرزەوینی جیاواز نینە کە کورشی یەکەم و ئاریارەمنە دەسەڵاتداری**

ئەو شوێنە بووبێتن .

هەروەها زۆرینەی پشکێنەران ، کورش پادشای پارسواش کە لەنووسراوەکەی ئاشوربنی پاڵدا هاتووە ، بە هەمان کورشی یەکەم ، باپیری کورشی مەزن دەزانن ، بەبڕوای ئێمە ئەم گریمانەش کەم و کووڕی تایبەتی خۆی هەیە ، بۆچی لە تێکستە ئاشورییەکەدا ، کورش بەپادشای پارساش نێوی براوە؟ لە حاڵێکدا بناغەدانەری ئیمپراتوریی هخامەنشی لەبابۆلدا خۆی بەپادشای ئانشان دەناسێنێ و لەم حاڵەدا باپیرەگەورەش دەبوو هەمان نیشانەی هەبووایە؟ . **دژواری دیکە ئەوەیە کە لە تێکستی پشکنینەکانی ئەم دوواییەی"پارسواشدا", لەگەڵ پارسی هخامەنشییەکاندا بە یەکێ دەزانێ, بەڵام تێبینی نوێتری ناوەڕۆکی نووسراوکانی ئاشور دەیسەلمێنێت کە پارسواشی ئاماژە پێکراو, ناوچەیەکە لە ڕۆژئاوای زاکرۆسی ناوەندی و لە سەرزەوینی مێدیادا هەڵکەوتبوو** . لەکۆتاییدا ئەگەر"کورش" تێکستی ئاشوری هەمان کورشی یەکەم بێت ، باڵکێشە کە نێوی کوڕە گەورەکەی (ئەروکو) کەوەکو بارمتە ناردبووی بۆ ئاشور ، نە پارسی و نە تەنانەت ئێرانییە . **ئاکامەکەی ئەوەیە کە تاڕادەیەک بە دڵنیاییەوە دەتووانین بێژین ناونیشانی ئەو کەسایەتییانە کە لەنووسراوەکانی کورش و داریوشدا دەیانخوێنینەوە, بەڕادەیە بڕواپێکراو نی یە و زانیارییەکانی ئەو دوو بەڵگەیەش لەگەڵ یەکدا نایەنەوە. کورشی مەزن یەکەمین هخامەنشییە کە بە ئەم بەڵگە دژبەیەکانە کە لەبەردە سداڵە, پادشاهییەکەی بە بێ ئەملا و ئەوڵا دەسەلمێندرێت** . (برگرفته و تلخیص از توماس کویلریانک ، تاریخ باستان کمبریج ،جلد چهارم ،۱۹۹۷ ،فصل اول ، ل٢٤و٢٦ ) .

بەمجۆرە سەرۆکی زنجیرە و هەموو تیرەکانی پادشاهی ، کە داریوش دەیانژمێرێت ، لەگەڵ نەبوونی هاودەقی مێژوویی و ڕاگەیاندندا ڕووبەڕوو دەبێتەوە . لەلایەکی دیکەوە داریوش لە نووسراوەکەیدا ئەڵێ کە نۆهەمین پادشای بنەماڵەکەیە بەڵام تەنیا نێوی پێنج کەس دێنێتە زمان و لەبەرئەوە دووا نێو بە هخامەنش واتا سەرۆکی زنجیرەکە کۆتایی پێدێت ، کەوابوو سێ پادشاه لەم ڕەگەزنامەدا بێسەروشوێنن کەناتووانین ئەوانە بۆ پێش لە سەرۆکی زنجیرەکە ، واتاهخامەنش بگوێزینەوە . لەوانەیە داریوش نێوی ئەوسێ کەسەی لەبیر کردبێ ، بەڵام ئێمە نازانین چ نێوێک بۆ ئەوانە بیینینەوە و لە چڕیزێکدا دایان بنین . ڕۆژهەڵاتناسان و هەندێ لە مێژوونووسانی نێوخویی ڕایدەگەیەنن کە مەبەستی داریوش تیرەی دووەمی هخامەنشییەکان ، واتا شەجەرەنامەکەیە کەکورش بڵاوی

کردووەتەوە . لەم حاڵەشدا چ شتێک ڕێگری داریوش بووە کە نێوی کورش کوڕی کەمبوجیە و کوڕەزای کورشی یەکەم ببات ، کەساێتییەک کە داریوش ئیمپراتورییەکی لەنەوەکانی داگیرکرد ؟ . ئاساییە ئەگەر قبوڵی بکەین کە داریوش ئاگاداری گڵەنووسراوەکەی کورش بووە و ڕەچەڵەک نامەکەی خۆی بەشێوەیەک لەگەڵ ئەوەدا هاودەق کردووە . بەم جۆرە دەتووانین قبوڵی بکەین کە داریوش لەدەرەوەی هۆزەکەی کورشدا ، دەستی بەسەر ئیمپراتورییەکەدا گرتووە ، لەبەر ئەوە زانیارییەکانی داریوش لەپێشینەی خێڵەکەی ، لەگەڵ زانیارییەکانی کورشی بناغەدانەردا یەک ناگرنەوە . لەگەڵ ئەوانەشدا ڕۆژهەڵاتناسان ، هێشتا بەبێ سەلماندنی ژیانی مێژوویی چیش پیش ، سەرزەوینێکی وەها بەربڵاویان بەناوبراو بەخشیووە ، کە بتووانێت لەنێوان دوو کوڕەکەیدا ، کە بریار وابوو ببن بەدوو مەزنی مێژوو ، دابەش بکات ! . لەهەمان حاڵدا ئەم سەرزەوینە دوو ناونیشانی هەیە : ئانشان و پارس و لەڕواڵەتدا لەوسنوورە کوڕتەوەیە کە دووتیرەی نادیار لە یەک زنجیرە پادشاهی نادیارتر ، و لەکاتێکی نادیاردا ، چەندین "پادشاهی مەزن و پادشاهی جیهان" سەر هەڵ ئەدەن ! ! .

(ڕاگەیاندنەکانی داریوش ، لەزۆر لایەنەوە بەنرخ و پربەها ناکەوێتە پێش چاو . لەڕاستیدا ناوبراو ئاماژە بەکورش ناکات لەحاڵێکدا کەتی سپس (چیش پیش) لەڕەگەزنامەی بنەماڵەکەیدا جێ دەکاتەوە و بەباپیرە گەورەی خۆی دەیناسێنێت و کورشیش کاتی خۆی ، هەمان تی سپس بەباپیرە گەورەی خۆی دەژمێرێت . تەنیا ئامێرێک بۆ هاوئاهەنگ کردنی ئەم دوو ڕەگەزنامە پێویستە ئەوەیە کە وابزانین تی سپس پادشاهییەکەی لەنێوان دوو کوڕەکەیدا دابەش کردووە و لەو کاتەوە ، لەبنەماڵەیەکی پادشاهی ، دوو لەق سەری هەڵداوە : یەکەم (لە دەسپێکی تی سپس و کورشی یەکەم) بەکەمبوجیە و بەردیە کۆتایی پێ دێت ! و دووهەم لەڕێگای بابی ویشتاسبەوە دەگاتە داریوش . بەڵام ، سەرەڕای نووسراوەکەی هێرودیت (ک حەفتەم ١١ ، ٠) گریمانەی دوو پادشاهی بەردەوامی نی یە و لەهەرحاڵ و بەهەرشێوە ، وەها ئەگەرێکیش ، ئەوهەشت پادشایەی کە پێش لە داریوش پادشاهییان کردووە ، لەکوێ بوون . . . هیچ نیشانەیەک بەدەستەوە نی یە کە کوڕی هیستاسپ ، بەپێچەوانەی ئەوەی کەزۆر کەس بیریان لی کردووتەوە ، ڕەگەزنامەیەکی لاوەکی دیکەی هەبووە . ئەفلاتوون (قوانین ، سوم ٦٩٥٠ ، ) و دیسانەوە الی ین (VHدوازدەم ، ٤٣) دووپاتی دەکەنەوە کە داریوش کوڕی پادشاە نەبووە ! و ئەمە هەمان باسە کە ژوستن (ک یکم ، ١٠ ، ١٣ـ١٤) زیندووی دەکاتەوە) . (پی یر بریان ، تاریخ ئیمپراتوری هخامنشیان ، ل ٢٦٨)

بەم جۆرە ئەگەر مێژوونووسێک بیەوێ سەبارەت بەمێژوو بەرپرسایەتی نیشان بدات ، خەیاڵ لە

شوێنی ڕاستیدا دانەنێت، بەرانبەر بەرەگەزنامەیَ هخامەنشیەکان سەختگیر و تەنیا بەڵگەی دڵنیاکەر وشیاوی داکۆکی هەڵبژێرێت، ئەوکاتە نە هەر هخامەنش، واتا بناغەدانەری زنجیرەکە لە مێژوودا بزر دەبیَ، بەڵکو ناچار ئەبین مێژووی هخامەنشییەکان لەکورش و ئەوەش لە بابۆڵەوە دەس پیَ بکەین.

جگە لە ئەفسانەیَ ئاستیاگ و کورش کە نیشانەیَ پارسی و مێدیایی پێوەیە، **بە گرانی دەتووانین نیشانەیەکی دیکە لە چیرۆکە ئێرانی و ناوچەییەکان لە کورش ببینینەوە. بەڵام بەرانبەر بە دیمەنی جیاوازی ناوبراو لە وێژەیَ یەهود و یونانیدا ئەو نیشانە ئەدۆزینەوە.** لەڕاستیداکاریگەری ڕۆحی کورش لەدەرەوەی چوارچیوەی سنووری کلاسیکەکانی ئێران، واتا لەبەڵخەوە تا مێدیا و لە هەرێمی ڕۆژئاوای دەسەڵاتە بەربڵاوەکەی واتا بابۆڵ و فلستین و یونانیدا شوێنەواری دانا. تەنانەت خەڵک و دەسەڵاتە ئێرانییەکانی پاش کورشیش کە لە و هەرێمانە نیشتەجیَ بوون، بیرەوەرییەکانی سەردەمی ناوبراویان ڕانەگرتووە و لەم سەردەمەدا لەو شوێنانە هیچ چیروک و ئەفسانەیەک وهیچ سەرچاوەیەکی ئەشکانییان ساسانی ناناسین کە ڕاستەخۆ یان ناڕاستەخۆ باسێکیان لە کورشەوە گیرابێتەوە. هەندی زانیاری پڕوبڵاویش کە لەسەرەتای هاتنی ئیسلامدا دەربارەیَ کورش لەمیژوودا تاپۆکراوە، لەوانەیە لەڕێگایَ سەرچاوە یونانی و یەهودییەکانەوە هاتبێتنە نێو ئەو مێژووانە، نە لەڕێگای "بۆنموونە" خودایینامەکانی ساسانییەوە. هەروەها کەئەمرۆئێمە لە ڕێگای بۆچوونی ڕۆژهەڵات ناسانەوە کە لە سەرچاوە یونانی و یەهودییەکانەوە وەرگیراوە، لەگەڵ هخامەنشییەکاندا ئاشنا دەبین و تا سەدسال پێشتر ئێرانییەکان تەنانەت نێوی کورش و چیشپیشی باپیرە گەورەیَ نەدەناسی. نیبرگ ئاماژە بەوە دەکات کە نێوی کورش و (چیشپیش)ی باپیرەگەورەی، هیچیان ئێرانی نینە.

**(بەلعەمی) ش لە یەهودی بوونی کورش، لەسەر دەستی دانیال نەبیدا ئەدوی و ئەڵیَ: "**

دانیال گەورە بووبوو و خوّدای گەورە ئەوی کرد بە پەیغەمبەر، تاکیورش لە هەبوونی خودایَ خۆشەویست و وشکۆمەند ئاگادار بکات. کیورش بەیارمەتی دانیال بوو بە موسڵمان و لە ئاگرپەرەستی دوورکەوتەوە.. وپادشاهی بۆدانیال گەڕانەوە تا خەڵک بهێنێتە ژێر حوکمی تەورات(۱)" (مؤذن جامی، ادب پهلوانی، ل ۹۱)

لەگەڵ ئەوانەشدا هێشتا ئەو گروپە مێژوونووسە، کە شێتگیرانە دەسپێکی مێژووی ئێران بە هخامەنشییەکانەوە گریَ ئەدەن و ئەوان بەئێرانی دەناسێنن، بیانوی دیکەیان بەدەستەوەیَ

۱ - ئاماژەکەیَ بەلعەمی لە ۱۱۰۰ پیشتر، شایەتێکە بۆئەوە کە لە سەدەکانی کۆنیشدا بۆ باسەکانی کۆتایی ئەم کتێبە سەرچاوەیَ تێئوریک هەبووە، تەنانەت ئەگەر ئەفسانەییش بێت.

کە لەنموونەیَ خوارەوە قایمتر نینە. تەنیا نموونەیَ شاهنامەیَ پارسی پێش لە داریوش، مرێکە کە لەسەردەمی

داریوش لە پرسپولیس‌دا کەڵکی لی‌وەرگیراوە، بەڵام لەو بارەوە کە هی سەردەمی کونترە نموونەیْ ئاشکرا بەدەستەوە هەیە. لەسەر ئەم مۆرە وشەگەلێک وەکو کوراش، ئانشان، کوڕی تس‌پس هەڵکنراوە و تس‌پس کەسایەتیکە کە پاش کورشی یەکەم، کورشی مەزنی وەکو نەوەیْ ناوبراو پیْ دیاری کراوە، هەرچەن تس‌پس پلەیْ پادشاهی نەبووە. دیمەنێک کە لە سەر ئەم مۆرە هەڵکەنراوە، گۆرەپانێکی شەڕە کە سەرچاوە سەرەکییەکەی ئیلامییە و دوواتر لە هونەری هەڵکەندنی سەردەمی هخامەنشییەکاندا خوشەویستییەکی گەورەیْ بەدەست هێناوە. مۆرەکەیْ کورش لە ئانزان (PFs۹۳) زەلامێکی ئەسپ سوار نیشان ئەدات کە لە سەرلەشی دوو شەڕکەری بریندارەوە باز دەبەن و شەرکەرێکی دیکە ڕاو دەنێن" (بریان، تاریخ امپراتوری هخامنشیان، ل ۲۲۵)

بەڵام ئەمە "تەنیا "نیشانەیْ شاهانەیە کە لە ڕەچەڵەکی هخامەنشییەکان ماوەتەوە، و هەروەها دووا نیشانە لە سەلماندنی ڕاستی ڕگەزنامەکە نی‌یە. لە ڕۆژهەڵاتی ناوڕاستدا کە نەریتی ساڵنامە نووسین لە ئیمپراتورییەکاندا بەڕێوە چووە و یەهودییەکان مێژووی نووسراوەیْ خۆیان لە تەوراتدا کۆکردووتەوە، سەلماندنی دێرینە بوونی ئیمپراتورییەکی مەزن ئەوندە دژوار دەبیْ کە ناچارین هانا بەینە بەرچیروکە سەختەکانی هێرودیت، نووسراو سیْ لایەنە سەختەکان و مۆرێک وەکو تەنیا نیشانەیْ شاهانە!!.

لەم دووایییەدا نیشانەیەکی سەربەخۆیْ دیکە دۆزراوەتەوە کە دەتووانرێت ئاماژە بە کورش بێت. لە سەر ٥ ڕووپەل (Ps 692-69) لە ڕووپەلی دیوانی یەکی لە بیناکانی تەختی جەمشید، نەقشی مۆرێک بە تێکستی "کورشی ئانشان کوڕی چیش پیش" بە پیتی ئیلامی دۆزراوەتەوە. هەرچەن پشکێنەرانی زۆر، بیْ هیچ شوبهە و گومانێک بەو ئاکامە گەیشتوون کە ئەم کورشە هەمان کورشی یەکەم بابی کورشی مەزنە، بەڵام ئەگەرێکی زۆر هەیە کە ئەم نێوەش لە پێناوی نەریتێکی ڕۆژهەڵاتیدا، واتا کەڵکوەرگرتن لە نێوی پادشاکان، وەکو سەربەرزییەک، بەکاربرابێت و لە سازەیەکی بەکۆمەڵی بارەگایْ هخامەنشیدا پارێزرابێت.. (توماس کویلریانک، تاریخ باستان کمبریج، متن اصلی ۱۹۷، ل ۳۷)

بەلام ئەم ڕووپەلانە ناتوانن بەرلە دارشتنی بیناکەیْ تەختی جەمشید نووسرابێت، (لەوانەیە کاتی نووسینی لە ٥٢٠ ی پ.ز) بوویت. چۆن دەکرێت باپیرە گەورەیْ کورش، کە هیچ نەبی ١٥٠ ساڵ پێش لە بیناکەی تەختی جەمشید، لە گەڵە نوسسراوەکیْ کورش لە بابوڵدا، پادشاهی بزرگ، پادشاهی ئانشان نێوی براوە، شوێنی مۆرەکەیْ لە سەر ڕووپەلەکەیْ تەخت جەمشیددا هێشتبێتەوە؟!

ئەگەر سەلماندنی نرخی ڕەگەزی ئیمپراتورییەکی مەزن بە ووردەباسە بیْنرخەکانی ئەم مۆرەوە

بەسترابێتەوە کە ١٥٠ ساڵ پاش هاونێوەکەی لەمێژوودا ، هێشتا لە تەختی جەمشیددا کاردانەوەی هەبێت ، ئاسانتر و شەرافەتمەندانەتر ئەوەیە پاراستنی ڕاستی ڕەگەزنامەکانی ئەو ئیمپراتورییە بخەینە پشتگوێ . بەم بۆنەوەیە کە من کورش بە یەکەمین کەس دەزانم کە لە میانەی خێڵێکی نەناسراو و بێ وڵاتەوە سەری هەڵدا ، پلەی پادشاهی بەدەست هێنا و بووبناغەدانەری ئیمپراتورییەک بەڵام بەقسەی بریان بۆچی ئەو؟ گرنگتر لەوە ، چۆنچۆنی؟ من هوکارەکانی لە وەرزی دوواییدا دەخەمە بەردەس .

## ئاکام :

١ . بڕیارەکەی کورش و داریوش لە ڕێکوپێک کردنی دوو ڕەگەزنامەکەدا ، کە یەکەمینی تەنانەت ئاماژە بەنێوی هخامەنشیش ناکات ، بۆسەلماندنی دەسەڵات و بنەماڵەی دێرینە لە ئانشان ، فارس و یا هەر سەرزەوینێکی دیکە شیاوی پاراستن نی‌یە . نەتەنیا ڕاگەیاندنی نێوی ئەوانە دەکەونە دژەری و تێکڵاوی ، بەڵکو ڕواڵەت و مادییەتی دەسەڵاتداریەتی وەها زنجیرەیەکی دوور و درێژ ، کە ئەوانە ئاماژەی پێ دەکەن ، لە هیچ ناوچەیەکدا نادۆزینەوە .

٢ـ بەڵگەکانی مێزوپۆتامیا ، تەنانەت دەربارەی هەمان دوو ئاماژەی بچووکیش کە بە سەرزەوینی "پارسوا" و "پارسوماش" کراوە ، لەو شوێنە کە باسی ناسنامەی هخامەنشییەکان لە ئارادایە ، بێدەنگ و تاکاتێک کە ساڵنامەکەی نەبونید ، لە دەور و بەری داگیرکردنی بابۆلدا بەتەواوی بێدەنگیەکەیان ڕادەگرن . پێشتر خوێندمانەوە کە بەشوێنیدا چوونە نوێیەکان ، "پارسوا" و "پارسوماش" بە هخامەنشیەکانەوە نالکێنن . سەرەرای ئەوەش پێش لە داریوش ، هیچ کەس و تە نانەت کورش ، ئاماژە بە هۆز و یا سەرزەوینێک بەنێوی پارس ناکات و وشەی پارس بۆیەکەمین جار لە نووسراوەکەی بێستوندا بینراوە .

٣ـ ئەو بەڵگەنامە نەتەوەییانەش کە ماونەتەوە بەهیچ شێوەیەک ناونیشانێک لە ژیانی وەها زنجیرەیەک ئاشکرا ناکەن و وەهایە کە گوایە هخامەنشییەکان ، بە بەزم و هەرای زۆرەوە لە بێدەنگی قووڵی مێژوودا دەرپەڕیون . هیچ خێل و هۆز و نەتەوەیەکی دیکە ، تەنانەت ئەوانەش کە مێژوو نێوێکیان لێ نابات و ئیمپراتورییەکیان لێ نەکەوتوەتەوە ، بەم شێوە بێ ناونیشان نەژیاون .

٤ـ بەربەست بوونی هۆزێک بۆ دۆزینەوەی سەرزەوینێک کە پێداویستییان بەپشکنینی جوغرافیایەکی پان و بەرین و یاخی، بەبەڵگەنامەیێ نەتەوەکانی دیکە هەبێ، ناسینی ڕیشەی مێژوویی ئەوانە، مێژوونووس ناچار دەکات کەزمانەکان لەهەموو لایەنێکەوە بە بێئاکام بپشکێنێ؛ سەلماندنی ڕەگەزنامەیێ ئیمپراتورییەکەیان ئەبێ بەهەڵگۆز و داگۆزی جۆربەجۆر و سەیروسەمەر ئەنجام بدرێت و لە کۆتاییدا لەبریتی دۆزینەوەی ڕێچکەیەک لەوانە، لەبەڵگەو یا هیچ نەبی لە ئەساتیرەکاندا، سەرزەوینەکەیان لە ئەفسانە هێلێنیستی و کتێبی پیروزی یەهودییەکاندا ئەبینینەوە، سەرزەوینێک کە گوایە شانازی و سەبەرزی و نەمری بۆ ئەوانە بەدوواوە بووە. لەم دوو سەرچاوەیێ دووایەشدا هیچ ئاماژەیەکی ڕۆشن و جێگیر بۆ کۆکردنەوەیێ پشتووانەیێ مێژووی ئەوانە نابینرێت؛ وەها هۆزێک، بەرانبەر بە هەڵسەنگاندنێکی مێژوویی، نەناسراو و سەرهەڵدانیکی وەها پووچەڵ بۆ مێژوونووس نابێتە هۆیێ سەرسووڕمان.

٥ـ ئیستا ئیتر گومان و دوودڵی لەسەختەبوونی نووسراوەکانی ئاریاڕەمەن و ئارشام و دێرە کۆرتەکانی نووسراوەکەیێ پاسارگاد دا نەماوە. گشت بەڵگە تازە دەسکەوتووەکان لە تاوتووکردنی مێژووی ڕۆژهەڵاتی ناوڕاست و هخامەنشییەکان و ڕووبەڕوو بوونەوەیێ لەگەڵ ئەم نووسراوانەدا، بە هۆکاری جۆربەجۆر، وەکو ڕستەیێ ناڕاستی ئیملایی، بەبێ جیاوازی، بەم سەختەکارییەی سەردەمی داریوش دەزانن. بەم جۆرە ئاشکرا دەبێ کە ڕەچەڵەنامەکەیێ کورش و داریوش، هەر لەوکاتەوە ئیدانە کراوە و ئیمپراتوری ناچار بووە بۆلەخشتەبردنی دژبەران و مێژوو، داهێنانی وەهاسەختە بخوڵقێنێت. کاتی لەدایکبوونی مێژوویی ئیمپراتورییەک، هۆکارێکی پەسەندکراو بۆخۆیێ نەبینێتەوە، ناچار دەبێ هانا بۆ وەها سەختەکارییەک بیات.

٦ـ هۆکارێکی دیکە بۆ ناڕاستیی ناونیشانی مێژوویی هخامەنشییەکان، ووردبینی لە باسی "تەواریخی" هێرودیت دایە. ناوبراو کە لە شیکردنەوەی مێژوودا هیچ لێکدانەوەیەکی دیاریکراوی پێ‌نی‌یە، هەمیشە پاڵ بەو ئەفسانە نێونەتەوییانەوە ئەدات کە کاتی ڕووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ نووسراوەکەیێ بیستوندا، تەنیا ئەرکیان ئەوەیە کە بەتەواوی دووپاتی بکەنەوە و قبوڵی بکەن. بەبڕوایێ من نەوەکانی هخامەنشی کەبۆ هەبوونیان لەمێژوودا خۆیان بەڵگەنامەیێ نەتەوەیی دەخوڵقێنن، لە

کرینی پێنووسی چیرۆک نووسێک وەکو هێرودیت دژوارییەکی وەهایان نی‌یە. وبەم‌جۆرەیە کە بەشێک لە تەواریخی هێرودیت، تارادەیێک تەنیا ئەم بەشەیە کە پەیوەندی‌بە رەگەزی هخامەنشییەکانەوە هەیە و بەڕۆشنی ئاشکرایە کە هەوڵی داوە بەدووبارە کردنی بەڵگە دەوڵەتی و فۆرمییەکان لە تەواریخەکەیدا پاسایێکی مێژوویی بۆ ببینێتەوە، بەشێوەیێک کە ئەمرۆ لە تەواریخی هێرودیت وەکو تەنیا شایەتی دۆرستی بەردەنووسراوەکەی داریوش یاد دەکرێت. بەڵام لە مێژووی کەتزیاس کە نەتەنیا بابی کورش بەپادشاە نازانێت بەڵکو وەکو چەتە دەیناسێنێت و دایکیشی وەکو بزن لەوەڕێن. لەو مێژووەی کەتزیاس تەنیا چەن برگەی پژوڵاو لە یاداشتەکانی فوتیوسدا بەدەستەوە هەیە!.

**ووتەکانی کەتزیاس** - مێژوونووسی ناوبراو ئەڵێ: کورش کوڕی شوانێک بوو لە خێڵی مەردەکان کە لەبەر هەژاری ناچار بوو چەتەیی بکات بەپیشە. کورش لە کاتی هەرزەکاریدا بەکردەوەی نزم هەڵدەستا و بەم‌بۆنەوە زۆرجار فەلاقە دەکرا. ناوبراو لەگەڵ ئاستیاکس پادشای میدیادا هیچ‌جۆرە خزمایەتییەکی نەبوو و لەڕێگای فێڵ و تەزویرەوە گەیشتە پادشاهی. (حسن پیرنیا، ایران باستان، جلد اول، ل ۲٤۰)

۷- ناتووانرێت هیچ پەیوەندییەکی بنەماڵەیی، رەگەزی و تەنانەت هۆزی وخێڵەکی، لەنێوان کورش و داریوشدا بەدی بکرێت. داریوش سەرکردەیەکی نیزامی لە سوپاکەی کەمبوجیە و رم بە دەستێکی ناوبراو بوو، کە لەوانەیە پەیوەندی و خزمایەتی بە هەر هۆز و خێڵێکەوە هەبووبێت.

ئەو سەرنجە دەمێنێتەوە کە هەموو نێوەکانی سەردەمە مێژووییەکەی داریوش، کە لەنێوی خۆدی ناوبراوەوە دەست پی‌دەکات: ئاریارەمەن، ئارشام، ویدارنە، ئوتانا، ئەردومەنش، هخامەنش، ئاریا، ئورمەزد، هەر هەموویان لەبناغەدا نامۆ و لەدەرەوەی ناوچەکەوە هاتوون و لەگەڵ نێوەکانی کەمبوجیە و بەردیا و تس‌پس وهی‌تردا، لەیەک قۆماشن. ئەو وشانە کە لەگەڵ داریوشدا هاتوونەتە گۆرەپانی مێژووەوە، لەو نێوانە نین کە لە بارەگای قرالیەتی هخامەنشیدا باو بوون، بەڵکو پێکهاتەیەکە لە دەس‌تێوەردانی بیرمەندانە کە هێزێکی زمانەوانی زانستانە پێکەوە گری‌داون و جۆرە داهێنانێک لە زاراوەکانە. تێکستی نووسراوە دوور و درێژەکەی بێستونیش دان بەئەم لێکدانەوەدا

دەنێت . لەوەرزی دوواییدا دەچمە سەر ئەو خاڵە کە کە سەرچاوەی ئەوجۆرە داهێنانە نوێیە بناسێنم .

٨ـ لە هەمان حاڵدا ، ڕۆژهەڵاتناسان ، لەڕوانگەی جۆربەجۆرەوە ، لە سەر ڕاستی ڕەگەزنامەی هخامەنشییەکان پێدادەگرن . مێژوونووسینی ئەوانە تەمەنێکی کورتی ١٥٠ ساڵەیان هەیە وهەروەها ئەیژم ، لە پێکهێنانی ئەو سیاسەتە جیهانیە دیاریکراوەدا دەستێوەردانیان کردووە . پاش هخامەنشییەکان کە لەکاتی خۆیدا نازناویان "پارسە" بووە ، لە وڵاتی ئێمەدا بەدرێژایی ٢٢٠٠ ساڵ هیچ بیرەوەرییەک نابینینەوە و بەزم و هەرای ئەوانە تەنیا بەو ئامانجەوەیە کە مێژووی ئێران و مێزوپۆتامیا لەڕاستییە ڕۆژانەکانی دوور بخەنەوە و بەعەقڵییەتی خۆیان دابڕێژن . ئەم جۆرە ڕۆژهەڵاتناسانە مێژووەکەیان بەنییەتی ئاژاوە و کێشەنانەوە و لەنێوان نەتەوە ڕۆژهەڵاتیەکان و لە بەرچاوگرتنی بەرژەوندی یەهودەوە نووسیووە تا قۆناخی داگیرکەری سەرچاوەکانی ئەم سەرزەوینە ئاسانتر بکەن . لە بەشی دوواییدا بنەڕەتی وەها بووژانەوەیەکی ناڕاست لە مێژووی ئێران و مێزوپۆتامیا دەسنیشان دەکەم و پەنجە بۆ مێژووی ڕاستی وڵاتەکەمان ڕادەکێشم .

٩ـ مێژوو کەسێک بەنێوی کورش وەکو پادشای ئیلام ، پادشای مێدیا و بەگشتی داگیرکەری ئێران ، پێش لە تێکشکانی بابۆل ناس ناکات و هیچ نیشانەیەک لەڕاستی مێژووی سەردەمی دەسەڵاتی ناوبراو ، ٥٥٩ ـ ٥٢٩ بەدەستمانەوە نی‌یە :

"دەربارەی قۆناخەکانی پادشاهی کورشیش ، هیچ نەبێ باسێک دەتووانرێت بوترێت کە ئەمە جێگای دڵنیایی نی‌یە . جگە لە مێژووی داگیرکردنی ئیکباتان ، کە هەروەها وەکو پرسێک ماوەتەوە تەنیا دوواڕووداوی سەردەمی پادشاهی کورش هەیە کە مێژووەکەی ڕاست و ڕەوایە : داگیرکردنی بابۆل (٥٣٩) و مردنی کورش لە ئاسیای ناوەندی (٥٣٠) . مێژووی داگیرکردنی ساردیش پرسێکی خاوەن کێشەیە . لە "ساڵنامەی نەبونید" ،

(دووەم ١٣، ) لەباسێک کە دەربارەی ساڵی نۆهەم (٥٤٦ـ ٥٤٧) نووسراوە ، یەکەم : لە مردنی دایکی نەبونید لە کاراشو یادکراوە ، دووەم : ساڵنامەکە ئاماژە دەکات کە لە مانگی مای هەر ئەم ساڵەدا ، کورش لەشکەرێکی کۆکردەوە و لە شوێنێکی لای خواروی ئەربل لە دیجلە پەڕیەوە و لەپاش ئەوە لەلەشکەرکیشی کورش بۆ سەرزەوینێک کە نێوەکەی ناخوێنرێتەوە ، باس کراوە : "کورش ، پادشای (ئەو شوێنەی) کۆشت ، کەلوپەلەکی تاڵان کرد ، سەربازخانەیەکی دامەرزاند وخۆی و لەشکەرەکی لەوێ نیشتەجێبوون" . تاماوەیەکی دوور و درێژ پێچەوانەی ئەوە جێگای باوربوو ، ناوەڕۆکی "ساڵنامەکەی نەبوونید" هیچ ئاماژەیەک بەشەڕی کورش دژی لیدی

ناكات . لەم حالەشدا داگیرکردنی سارد سەردەمێک ساڵی ٥٤٦ و کاتێک ٥٤١ـ ٥٤٢ دیاری کراوە" . (بریان ، تاریخ ئیمپراتوری هخامنشیان ، ل١٠٨)

ئەو باسانەی سەرەوە لە هەستیاری سالنامەکانی مێزوپۆتامیا ، سەبارەت بەڕووداوەکانی ڕۆژهەڵات ئاگادارمان دەکات . لەوەرزی دووایی‌دا ئەیژم کە یەهود کورشی لە ئیستێپەکانی ناوڕاستی روسیاوە و لەوانەیە لەنێوان سکاکانی سەرەوەی دەریادا ، بەمەبەستی داگیرکردنی بابوڵ ، هێناوە و تەیاری کردووە . ئەگەر ناوبراو لەساڵی ٥٣٩دا لەبابوڵ ئەبینینەوە ، زۆر سورشتی و ڕاستە کە لەساڵی ٥٤٢دا لەگەڵ سارد بەشەڕ هاتبێت ، کەتەنیا بەرگر بو داگیرکردنی بابوڵ لەباکووری قەوقاز تا مێزوپۆتامیا بووە . و دەبینین کە مێژوو پێش لەساڵی٥٤٢ کورش نایناسێت ، و ووتنی ساڵی ٥٥٩ بۆدەس پێکردنی ئیمپراتورییەکەی ، باوڕێکە کەبەبۆنەی داگیرکردنی ماد و ئیلام ، پێش لە داگیرکردنی بابوڵ لە مێژوودا بڵاو بووەتەوە . ئەم باسە پێش لە هاتنی کورش بۆبابوڵ بێ‌بەڵگە و شوێنەوارە و بەرهەمی خەیاڵی هێرودیتە ، کە نەزانینی دەربارەی هخامەنشیەکانەوە ، بەهۆنینەوەی خەیاڵ پڕکردووتەوە و تائیستاش درێژەی هەیە و بەهەوڵی ڕۆژهەڵات ناسانی ڕقەبەر ، خۆدی و نەیار ، هەمیشە بەربڵاوتر دەبێتەوە .

# ڕێگاچارەی یەهود۱

بەواتایەکی ڕاست ، مێژووی هخامەنشییە مەزنەکان ڕووپەلێکی تازە لەمێژووی یەهودە و ئەگەر هخامەنشییەکان یەکی لە "اسباط" (نەوەکانی بەنی ئیسرائیل) بزانم ، زیادەبێژیم نەکردوە .
دەربارەی پێکهاتەکانی ئەم وەرزەوە ، ئەبێ بێژم کەهیچ دیاردەیەکی هاوسەنگی لەم بابەتە بەدەستەوە نی‌یە و ناچارم بۆنزیکبوونەوە بەمژارەکە پاڵ بەم بەسەرچاوە وێژەیی و ئەدەبییەکانی یەهودەوە .
بەڵام بەڕواڵەت بریان ، هەروەها کەلە مژارەکانی دیکەدا بۆ کردنەوەی ڕەمزی پرسەکانی کورش و یەهود هەنگاوی هەڵگرتووە ، ئاماژەکانی بەشێوەیەکی شاردراوە بریار لەسە سیاسی بوونی مەسەلەکە ئەدات . بەڵام ئەمجارەشیان نەیتووانیووە لەکوێ بریارەکان ئاکامێکی مێژوویی دیاریکراو وەربگرێت و لەلووتکەی کردنەوەی پرسەکاندا ، درێژەپێدانیان دەخاتە پشت گوی ، و بو بۆفەلستینییەکان ، مافێک ناناسن .

۱ـ ململانی لەسەر تەوەرەی ڕگەز ، ئایین ، فەرهەنگ و تەنانەت وڵات ، بەرزەفری و نیشانەی نەزانی مرۆڤە . جیهانی خاوەن شارستانیەت ، جگە لەباوڕەئایینییەکانی ، یەهودی‌سر (دژی یەهود) نی‌یە . یەهودییەکان یەکی لەچەن هۆزی دێرینەن کەسەرەڕای ستەمی مێژوویی زۆرکە لەوانە کراوە ، هێشتا هەبوون و باوڕە کۆنەکانیان بەقایمی ڕاگرتووە . ئەگەر کەسێک باسەکانی ئەم بەشە بە یەهودی سرین لێکبداتەوە ، لەنزمی بیر و بۆچوونیدایە کە ناتووانێ باسە جیدی و ڕاستەقینەکان لێکبداتەوە . بەبڕوای من دەس‌تێوەردانی یەهود لە مێژووی ڕۆژهەڵاتی ناوڕاستدا ، هاوکاتی دەسەڵاتداریەتی هخامە نشییەکان ، نیشانەی ئەندیشمەندی و دووربینی گەورە پیاوانی یەهود بوو کە بەکەڵک وەرگرتن لەو دەرفەتە مێژووییە ، بۆئازادی نەتەوەکەیان دوو دڵییان نیشان نەدا . ئیستا خەڵکی ڕۆژهەڵاتی ناوڕاست و تەنانەت زۆربەی یەهودییەکان لەگەڵ سەهیونیزمدا شەڕ دەکەن . گرووپێکی جیاوازی نێوخوییی کە وەکو گرووپە دژبە یەهودییەکان مافی ژیان بۆئەم هۆزە یەکەپەرەستە لەپێش‌چاو ناگرن و بۆ شارستانیەتی دێرینی هەرێمەکە ، وەکو عارەب وفلیستینییەکان مافێک ناس ناکات .

خوێندنەوەی نووسراوەکانی یەهوود ، ئەم هەستە لەمرۆڤدا هەڵدەخرێنێ کە گوایە مەنشی بەرز و جیاوازییەکانی کەسایەتی کورش سەبارەت بەنەتەوەی یەهود ، لەچوارچێوەی ئاسایی پەیوەندییەکانی پادشاهێکی ڕۆژهەڵاتی نزیک و کۆمەڵگایەکی نەتەوەیی ـ ئاینی تێپەڕی کردووە . لەم شانۆەدا کەسایەتییەکیان بەکورش داوە کە نموونەی کورشی بەبابۆلی کراوی گڵەنووسراوەکەیە و هەوڵێکی بەرچاو دراوە بۆئەوەی تا لە داگیرکەرییە جیهانییەکەی

هخامەنشی ، دیمەنی پادشاهێکی ئاشتیخوازو سازشکار بخرێتە پێشچاو کەرەوشتی لەگەڵ رەوشتی توقێنەر و بێبەزەییانەیٚ ئاشور و بابوڵدا جیاوازە و ئەمە هەمان کورشە کە لە سەردەمی ئیستاشدا بە بناغەدانەری"مافی مرۆڤی" دەزانن؟ . ئەڵبەتە لەم باسەدا ، تا ئەوئاستە چوونەتە پێشەوە کە لەخو و رەوشتی کورش وەکو کردەوەیٚ باورمەندێکی راستی "ئاینیی زەردەشتی" یاد بکەن ، بەو هوێەوە کە لەبوێت پەرەستی بایٚ‌دایەوە ، بەتایبەت بە ئایینی یەهودایی‌ئیسرایلی نزیک بووەوە؟ . ئایا دەتوانین ئەو دیاردانە بکەین بەنیشانەیٚ چاککردنی ئایینی چەنخوٚدایی کە لەرەهەندی پەیوەندییەکانی یەهود و هخامەنشییەوە تاپۆ کراوە؟ . راستییەکەیٚ ئەوەیە کە سنووری ئەم پرسە بوٚ کورش و بەرێوەبەرانی یەهودایی ، تەنیا بەم چاککردنەوە دیاری ناکرێت . لەبەرئەوە، کە لەکوٚمەڵگایٚ رۆژهەڵاتی ناوراستی سەردەمی کوٚندا ، ئایین و سیاسەت دووچەمکی بەتەواوی نزیکی یەکتر بوون ، بەوٚ بوٚنەوە لەجێگایٚ خوێدایە کەسەرچاوە یەهودییەکان ، مێژوویان بەبوٚچوونە ئایینیەکەیەوە بخەنە پێشچاو ، بەڵام هەربریارێکی"ئایینی"ش تایبەتمەندی وئامانجی سیاسی خوٚی لەگەڵدایە . بەبوٚنەوە ، لەوٚسەردەمەدا هەر شار و نەتەوەیەک بوٚ خوٚیان خوٚداوەندانێکیان هەبووە کە ئەوٚ شار و نەتەوەیەیٚ لەژێر دەسەڵاتیخوێدا دەپاراست . کەوابوو ، سوٚرشتییە ئەگەرئەو شارە و نەتەوانە بەرانبەر بەخوٚداوەند یان خوٚداوەندەکانیان هەستیاری پەرستنی ئەوانەیان بکردایە و بەوٚبوٚنەوە پەرەستنگە وشوێنی ئایینیان دروٚست کردبیٚ . وهەروەها ئاساییە کەپادشاهێکی داگیرکەر ، کاتی داگیرکردنی شارێک ، خوٚداوەندان و بنەماڵەیٚ پادشاهی وهەڵبژاردە سیاسی و نیزامییەکانی ئەوشارەی لەگەڵ خوێدا ببردایە و بەم جوٚرە دەرفەتی گەیاندنی هەرجوٚرە یارمەتییەک ، کاتی ئەگەری شورش و سەرهەڵدانی دژی هێزی داگیرکەری لەوانە دەسەند . پێچەوانەیٚ ئەو باسەش راستە ، واتا کە گەرانەوەی دەسەڵاتی سیاسی و ئایینی پێشوویوٚ یەک شار یان کوٚمەڵگایەک هاوسان بوولەگەڵ گەرانەوەیٚ پەیکەری ئەو خوٚداوەندانە کە داگیرکەران بوٚ پاتەختەکانی خوێان گواستبوویانەوە . کەوابوو تایبەتمەندی"جیاوازی" کورش ئەو بریارانە بوو کە بەقازانجی ئورشلیم دەری‌کردبوو و ئەمەیە کەبووەتە تیوری ئەوسەرچاوانە کە بڕوایان بە ناوەندبوونی یەهودیەت هەیە و ئیستا لەدەستی ئێمەدایە . ئەگەر رووداوەکە لەواتا و چوارچێوەی ئایدولوٚژیکی و سیاسی رۆژهەڵاتی ناوراستی ئەوٚ سەردەمەدا دابنین ، ئەبێتە هەمان شت کە لەراستی و بنەرەتەکەیدا بووە ، واتا باس و وەرزی بێگومان گرنگ بوٚ یەهودییەکان لەناوەروٚکە تایبەتەکەیدا . بەڵام ئەم وەرز و باسە بوٚزوٚرینەیٚ نەتەوەکانی رۆژهەڵاتی ناوراست ، بەدرێژایی دەسەڵاتی ئاسوری و باوٚبوٚلیدا ئاسایی بووە .

گریمانەیٚ مێژوونووسان هەمیشە ئەوەبووە کەکورش ، بەبوٚنەیٚ مەنشی ئازادیخوازیەوە ، یەهودی لەکویلەتی بابوڵ دەرباز کردووە ، و دوزینەوەیٚ ئەم نهێنییە ئاسان نییە . بوٚچوونی من ئەوەیە کە یەهودییەکان کورشیان لەنێو خێڵێکی بێ‌ناونیشان و نەیار ، بەڵام خوێنرێژ ، بەیارمەتی مادی و عەقڵی ، تاپلەیٚ ئیمپراتوریەک سەرخست ، بەوئامانجەوە کە کویلەکانی یەهود و سامانەکەیان

لە ژێردەسەیی بابۆلدا ئازاد بکات و ئەو شارستانیەتە چەن خۆدابیە و ملۆزمە لە ڕۆژهەڵاتی ناوڕاستدا هەڵپێچێت . بیرنەکردنەوەی کورش بەفەرهەنگ و باوڕەکانی هەرێمەکە ، بەشێوەیەک کە ئاماژەی پیدەکەم ، بەجێهێنانی بەپەلەی ئارەزووەکانی یەهودی بەدواوە بوو . ئەمە بۆچوونێکە کە بۆ یەکەمین جار شێوەی هەڵسەنگاندنی بەمێژوو ومێژوونوسان پێشکەش کرد و سەلماندنی ئەوە شۆڕشێک لە لێکدانەوەی مێژووی ڕوژهەڵاتی ناوڕاست و لەوانەیە مێژووی سەردەمی ئەم هەرێمە پێکدەهێنێ . تێڕوانینێک لەڕوانگەی سوننەتی مێژوونووسان لەم بارەوە ، ناوبەینێکی دوور و درێژ لەنێوان ئەو دوو بۆچوونە ئاشکرا و گومانە سەرەتاییەکانی پرسەکە دەسڕێتەوە . بۆنموونە ئاغای شهبازی لە هەڵسەنگاندنەکانی خۆی لەم بارەوە ئیدەیەکی زۆر بالکێشی هەیە .

" گرنگترین ئاکامی ئەم سەرکەوتنە گەڕانەوەی یەهودییەکان بۆ پلستین بوو کە دوو بەرهەمی دیکەشی بەدوواوە بوو . یەکەم : ئەم هۆزە سەرلێشێواو و ڕقەبەرە ، بۆیەکەمین جار لەگەڵ خەڵکانێکدا ڕووبەڕوو بوونەوە کە ئازادمەنش و پایەبەرزبوون و ئەو ئازادی و بەخششە کە کورش و جێگرەکانی بەوانەیان بەخشی ، هێشتا نیشان نەدرابوو و هەروەها کە مێژوو نیشانی داوە ، ئەوانە تەنیا لە ئێراندا لە یارمەتی و پاڵپشتی سەکردەکان سوودمەند بوون . کەوابوو دەتووانرێت بووترێت کە ئازادی خۆیان قەرزداری هخامەنشییەکانن و **ئەمە هخامەنشییەکان بوون کە تەوراتیان کرد بە ناسنامەی فۆرمی یەهودییەکدن (!!!)** . بەرهەمی دووەم ئەوەیە کە ئایینی ئیسراییلیەکان بەرانبەر بەئایینی مەزدیسنا تووشی گۆڕینێکی فراوانی بوو بیری وەرگرتنی ڕزگارکەری جیهان کەپێشتر یادمان لیکرد لە باوڕەکانی سوشیانسەکانی زەردەشتە (١) . (بیری سوشیانسی زەردەشتی سێ قوناخی زەمەنییە کە بەباوڕی ئایینی زەردەشت ، تەمەنی ژیانی مرۆڤ و تۆپی زەوین پێکدەهێنێ - وەرگێر ) . خوداوەندێک کە باوڕمەندانی موسا پەرەستشیان دەکرد ، ڕقاوی و تووڕە و هەندێ جار کاولکەر بوو بەڵام کاتێک لەگەڵ خۆدای زەردەشتدا ڕووبەڕوو بووەوە لە کەفوکوڵ کەوت و هێمن‌تر بووەوە ، فریشتەکان لە ئایینی موسادا نایینرێن و ئەشاسپندان لاسایی‌کراوی ئایینی زەردەشتن و نێویان میکاییل و ڕافاییل جیبراییلە . جگە لەوانە دێوەکان و سەرکردەکەیان شەیتانە هەیە کەلەڕەگەزی دێو و ئەهریمەنن ، تەنانەت دێوی مەزنی یە هودییە کان ، واتا ئاسمودە هەمان ئەئشەم دێوی ئێرانییە کەبە دێوی تووڕەیی بەناوبانگە . جیهانی داهاتوو ، و دۆزەخ و بەهەشت و ڕۆژی سەرهەڵدان و هەڵسەنگاندنی تاوانەکان و پردی سیرات (هەمان چینوتی زەردەشتین ) و گشتەکەیان لە ئایینی ئیرانییەکانەوە گەیشتووتە یەهودییەکان و لەڕووی تەوراتەوە بۆئایینەکانی دیکەی سامی بڵاو بووەتەوە و ئەمانە هەمووی بەرهەمی سەرکەوتنی کورش بەسەر بابۆلدایە ) . (ع . شاپور شهبازی ، کورش بزرگ ، ل ٣١٩ و ٣٢٠ ) .

لەو تێکستەیٚ سەرەوەدا لەگەڵ زەردەشتیگەلێکدا رووبەڕوو دەبینەوە کە هەرچەن هەبوونی مێژوویی ئەوانە ، هیچ نەبیٚ لە سەردەمی کورشدا نەسەلماوە ، بەڵام بەڕادەیەک پڕهیز بوونە کە توانیوویانە سۆرشتی یەهودییە تۆند و تیژەکان هێمن‌تر بکەنەوە و ئازاد مەنشی و پایەبەرزی کورش ئەوانەیٚ فێرکردووە کە "تەورات" یان خۆش گەرەک پێت ١ ( ! ) .

هەرچەن کورش هەروەها کە لە بەڵگەنامەکانی بابۆل و جاڕنامەکەی خوێدا دیاری ئەدا ، بەرانبەر بە هەموو نەتەوەکان میهرەبان بوو ، بەڵام لەتەوراتدا دەرئەکەویٚ کە ئەو سەرنجێکی تایبەتی لەسەر یەهودییەکان هەبووە . ئەم خاڵە سەرنجی زانایان و پشکێنەرانی بولاییٚ خویٚ ڕاکیشاوە و هەرکامەیان بۆئەو مەبەستە بیر لە هوکارێک دەکەنەوە : هەندێکیان ووتوویانە ، لەبەر ئەوە کە یەهودییەکان لە کاتی داگیرکردنی بابۆلدا یارمەتی کورشیان داوە کورش ویستویە پیٚزانینی خویٚ بەوانە نیشان بدات . هەندێکیان لەو باوەڕەدان کە بەبۆنەیٚ نزیکبوونی نەتەووەیٚ یەهود بەسنووری میسر ، لەباری سیاسییەوە کورش خوازیاری ئەوە بوو کە نەتەوەیەکی پی‌زان و گویڕایەڵی لەو سنوورەدا هەبیٚ . ژمارەیێک لەوانە ئەڵێن : سەرنجی تایبەتی کورش بۆیەهودییەکان ، پیویستە کە نزیکبوونی ئایینی موزی بەنی ئیسراییل و ئێرانییەکانی سەردەمی کۆن ببینین چوونکە هەردوو ئایینە کە بەرانبەر بە ئایینەکانی ئەو کاتە بەرزتر و بەنرخ‌تر بوونە و لە باری پەرەستنی خوٚدایٚ تاکانەوە کە تەنیا و بیٚجێگا و شوێنە وهەمیشە زیندووە و هەروەها نەمری ڕۆح و بڕوا بە ڕۆژی قیامەت تاڕادەیێک لە یەک دەچوون . لەوانەیە کورش هەموو ئەو خاڵانەیٚ لە پێش‌چاو بوویێت ، بەڵام ئەو شتە کە لەجارنامەکەیٚ بابۆلدا دەبینرێت کورش بەیک ڕەوشت لەگەڵ هەموو نەتەوە بندەستەکاندا هەڵسوکەوتی کردووە ، واتا بۆبیر و باوەڕی گشت ئەوانە ڕیزی داناوە ، هەرشتێکیان کە بۆبابۆل هێنابویان بۆ شوێنی خویٚ گەڕانیەوە ، و ئاسایشی فیکری ئەوانەی دابین کرد .

١ ـ مێژوونووسە مەزنەکەمان بە کۆن بوونی تەۆرات بەرانبەر بە ئاویستا تەنانەت بەشێوی پێش لە ئیسلامیش سەرنج نادات . لەوانەیە بتوانین سەرجەم گریمانەکانی بەڕاست بزانین ، بەڵام بە پێچەوانەوە . ئیشپیگڵ هەوڵی دا تا نیشانی بدات کە یەهود نەتەنیا بیری خوٚداپەرەستی ، بەڵکو بیری ئافراندنی هەبوون لەهیچ و گرنگی ڕەقەمی شەش لە ئافراندن و زریانەکەی نوٚحی پەیغەمبەری بە ئێرانییەکان فێرکرد . هارلز و بەدووایٚ ئاوبراودا پتانزونی سەرچاوە پەیوەندی ـ دەرەکانیان تایبەت بە هناردراوەکانی هۆزیبەنی‌ئیسراییل دەزانن کە پەیامەکانیان هەرچەن ناڕاستە خوٚ ، گەیشتبووە زەردەشت . ( ژ . دوشن گیمن ، زردشت و جهان غرب ، ل ٤ ) .

لجیاوازی تەنیا لەوەدا بوو کە هەستی پیٚزانین و ماڵئاوایی هەموو نەتەوەکان جگە لەبابۆل تاپۆ نەکراوە و لەبەر ئەوە نەگەیشتووتە دەستی ئێمە ، بەڵام خۆشحاڵی نەتەوەی یەهود لەتەوراتدا ڕەنگی داوەتەوە . (پیرنیا ، تاریخ ایران باستان ، ل ٣٩٧ )

ڕەحمەتی پیرنیا ، جگە لە هێمایەک لە یارمەتی یەهود بو داگیرکردنی بابۆل ، هیچ باسێکی لەبارەی پەیوەندی کورش و یەهود ڕانەگەیاندووە . هەرچەند مەبەستەکەیٚ لەڕستەیٚ( هەندیٚ کەس ووتوویانە

ڕۆشن نەکرووتەوە، بەڵام من لەشوێنی خۆیدا تارادەیەک کەپێم زانیوە، ئاماژە دەکەم. بەگشتی ئاغای پیرنیاش پەیوەندی کورش و یەهودی لەسەر "زێهنییەت" و "دلووانی" و "مەنشی" کورش داناوە و دەسپێکی ئەم پەیوەندییە ئەباتەوە بۆکاتی داگیرکردنی بابوڵ.

کاتێک کورش بوو بەدەسەڵاتداری بابوڵ، و سووریاش کەوتە ژێردەسەڵاتی ناوبراو، هەمان سیاسەتی خەیرخوازانەی بەرانبەر بەو وڵاتە گرتە پێش. پادشاکانی فنیقیە گەیشتنە خزمەتی کورش و زانیارییەکانی خۆیان ڕاگەیاند، و گەمیە دەریاییەکانیان ـ کەژمارەیان بەقەدەرکەشتییەکانی یونان دەبوو، خستە ژێردەسەڵات پادشاه.

کورش لەهەمان یەکەمین ساڵی پادشاهییەکەی لەبابوڵدا فەرمانێکی لەسەر ئازادی کویلە یەهودییەکان و کەگەڕانەوەیان بۆوڵات و نوێکردنەوەی بینای پەرستنگەکەیان (هەر بەو شێوە کەپێشتربوو) لە ماڵی پیرۆزدا (بیت‌المقدس) ڕاگەیاند ئەوەشی بخەینە سەر، فەرمووی تا گشت دەفرە ئاڵتوون و زیوییەکان کەپێشتر تاڵانکراو و لەبابوڵ ڕادەگیران، بۆئورشلیم بگەڕێنەوە. لەساڵی ۵۳۷دا زۆرتر لە ٤٠٠٠٠ یەهودی لەژێر سەرکردەیی زرو بابوڵ، بابوڵیان بەئامانجی سەرزەوینی ژوانگە (ارض موعود) بەجێ هێشت. کەسایەتییەکی پلەبەرزی پارسی بەجێهێنانی باش بەڕێوەبردنی فەرمانەکەی چاودێری دەکرد. لێرەشدا هەمان **خوولق و خوی بەرزی کورش دەکەوێتە پێش چاو کە هەوڵ ئەدات ئارامش بە مرۆڤایەتی پێشکەش بکات،** بەڵام لەبەر ئەوە کە زەلامێکی سیاسەتمەند بوو، ئەوەی لەبیر نەکرد کەفلستین بەردەبازێکە بۆ بەدەس‌خستنی میسر کەهێشتا داگیر نەکرابوو. نابێ لەبیرمان بچێت کە کاتی پادشاهی کورش سیاسەت بە تەواوی نزیکی ئایین بوو، و ئەگەر کورش و پاش ئەوەش داریوش هەڵسوکەوتێکی خەیرخوازانەیان بەرانبەر بەیەهود گرتەپێش، ئەبێ بڕوا بەوە بکەین کەئەم پرسە تەنیا لەبەرئەوە نەبوو کەئەوانە تەنیا قازانجی خۆیان لەوەدا ئەدی، **بەڵکو هەروەها بەو بۆنەوە کە ئامانجی ئایینی یەهودییەکان ـ کە ئایینیان بەرزتر لەپرسەکانی دیکە دەزانی و لەڕوانگەی ئەوانەوە زۆر باش لەگەڵ مرۆڤدا سازگارتر لە باوڕ ئایینییەکانی کەلدانی و میسری دەکەوتە پێش چاو** (گیرشمەن، ایران از آغاز تا اسلام ل ١٤١ و ١٤٢)

بۆئەوە گیرشمەن خۆی یەهودییە، هۆکاری هەڵسوکەوتی تایبەتی ناوبراو، بەرانبەر بە هۆزەکەی، لە لێکدانەوەی فەلسەفی کورشدا دەبینی کە یەهودی دەخاتە سەرەوەی ئایینی هەرێمەکە و ئەڵی کورش باوڕی یەهودی لە ئایینەکانی دیکەی کەلدانی و میسری بەباشتر زانیوە. هیچ نەبێ گڵە نووسراوەکەی کورش باسێکی دیکە دەکات و مەردوک بە بەرزترین خوادا، سەرکردە، ڕێنموونی کەر و پشتیووانی خۆی دەزانێت!. بەم جۆرە چوار بەڵگەکەی ئێمە دەربارەی هخامەنشییە ـ

کان بۆڕۆشن کردنەوەیٚ هەڵسو کەوتی کورش لەگەڵ یەهوددا ، (جگە لە بریان) تاڕادەیەک پاڵی داوە بە خەیاڵ و ئیخلاقەوە و دیارنی‌یە بەچ‌شێوەیەک ئەبێ ڕاستی سەرهەڵدانی سەرکردەیەک کە ٢٥٥٠ ساڵ پێش لە ئیستا سەرقاڵی پێکهێنانی ئیمپراتوریەکەیٚ بووە ، هەلسەنگێنین . وەهایە کە بۆمن و ناچار ، ناوەڕوکی تەورات و مێژووی یەهود کە لەبەر دەستدایە ، سەرکەوتووتر لە لێکدانەوەی مێژوونووسانی دیکەیە .

لە ساڵی یەکەمی داسەڵاتداری کورشدا ، پادشاهی پارس هەموو ڕاسپاردەکانی ئەرمیای نەبی بەجیٚ‌هینا . خۆداوەند ئەمری بە کورش کرد کە بریارێک دەربکات و لەنووسراوەیەکدا بۆ هەموو وڵاتە بەربڵاوەکەیٚ بەڕێ‌بکات . ئەمە ناوەڕۆکی فەرمانەکەیە : من ، کورش پادشاه پارس ، ڕاێدەگەیەنم کە خۆداوەند ، خۆدایٚ ئاسمانەکان ، هەموو وڵاتانی جیهانی بەمن بەخشیووە و ئەمری فەرمووە کە لە شاری ئورشلیم‌دا ، شاری یەهود ، خانوویەک دۆرست بکەم . کەوابو هەموو ئەویەهودییانە کە لەسەر زەوییەکەیٚ من‌دا دەژین و کەسانێکیان تێدایە کە دەخوازن بۆ ئەو شوێنە بگەڕێنەوە و بنەڕەتی خانووی خۆداوەند ، خۆدایٚ ئیسرائیل لە ئورشلیم‌دا داڕێژن ، خۆدایان لەگەڵبێت ! دراوسیەکانی ئەم یەهودییانە ئەبیٚ زێر و زیو و تۆشەیٚ ڕێگا و چوارپیٚ پێشکەش بکەن و هەروەها پێشکەشی بۆماڵ خۆدا پێشکەش بکەن . (عهد عتیق ، عزرا ، ٤ـ١ : ١) .

عزرا ، کە تەورات ناوبراوی لەڕیزی کویلەکانی بابوڵدا نووسیوە ، کورش بەپادشاهی پارس نێودەبات . لەبەر ئەوە کورش تەنیا لە ئانشان نێوی براوە ، کاتی دەسەڵاتداریەتی ناوبراو کەس نێوی پارسی نەناسیووە و داریوش بۆیەکەم‌جار نێوی پارسی بردووە ، لەوانەیە و ئەبیٚ کتێبی عزرا پاش داریوش خرابێتە سەر ڕوویپەلە کۆنەکانی تەورات .

هێدی هێدی ئاشکرایٚ دەکەم کە بۆچی زنجیرەیەک لە مێژوو نووسانی ئێرانی یەهود ، وەکو گیرشمەن ، اشپولر ، ویستهوفر ، دارمستتر ، و بەشێوەیەکی دیکە گلدزیهر ، آستروناخ و کەسانی دیکە ، مێژووی ئێمەیان بەشێوەیەک نووسیوەتەوە کە دەسپێکەکەیٚ لە هخامەنشییەکان ئەولاتر نابەن و ئەم دەسپێکەش بەهەڵە زۆر بەشانازییەوە ڕازاوەتەوە . ئەمانە ڕێگایەکیان تێپەڕ کردووە کە ووتارەکەیٚ" تەورات لە "مەسیحی خۆدا" بکەن بەشایەتێکی مێژوویی بۆ کورش .

لەیەکەمین ساڵی دەسەڵاتداریەتی داریوشی مێدیایی ، کوڕی خەشایارشاە کە دەسەڵاتداری بابوڵ بوو ، من دانیال لە کتێبەکەیٚ ئەرمیایٚ نەبی ئاگادار بووم کە بەرانبەرکەلامێک کە خۆداوەند بە ئەرمیایٚ ووتبوو ، ئورشلیم دەبووا حەفتا ساڵ کاولکراو بمایەتەوە . (عهد قدیم ، دانیال ، ٢ ـ ٩)

دووایی دانیال لەبارەگای خوداوەند پارایەوە کە سەرکەوتنە کردنی هۆزی یەهود ببەخشی. ئەم ڕاپۆرتە لەڕوانگەی مێژووییەوە بە تەواوی ناڕاستە، چوونکە داریوشی مێدیایی کوڕی خەشایار شاە نییە، کاتی دەسەڵاتداریەتی ناوبراو، ماوەیەکی زۆر لە ئازادی دیلە بابۆلییەکان تێپەڕی کردبوو و پاڕانەوەی دانیال بۆ ئازادی ئەوانە بێ ئاکام مایەوە. جگە لەوە ئەم هەڵانە کە هۆکارەکانی دووبارە دەکەمەوە، دیمەنەکانی تەورات، هیچ نەبێ لە ڕووداوەکانی سەدساڵەی یەکەمی دەسەڵاتداریەتی هخامەنشییەکان، لەڕوانگەی مێژووییەوە تاڕادەیەکی زۆر ڕاستە و لە گەڵ تواریخی پڕ لە ئەفسانەی هێرودیتدا، شیاوی هەڵسەنگاندن نییە.

لەمە بەدووا من لە ناوەڕۆکی تەورات، نەوەکو یەکەمین کتێبی ئایینی ئاسمانی، بەڵکو هاوشانی بەڵگەیەکی مێژوویی کەڵک وەردەگرم. بەم ڕوونکردنەوە و سەرنجە، بە پێچەوانەی قورئان، کە بە تەواوی وەحی ئاسمانی و ووتاری خودای گەورەیە و تەنیا بیسەرەکەی ناردراوەی خودا (ص) بووە، تەورات و ئینجیل پراوێزێکە نە بە ناوبانگترین ناردراوەکان، پەیڕەوان و ئەندامانی یەکەمین بەشەکانی ئایینی یەهود و مەسیح لەسەر قسەکانی موسا (ع) و عیسا (ع) نووسیوویانە و هەروەها کە دەزانین بەشێکی کورتیشیان خۆی لە وەحی ئاسمانیدا نابینێتەوە. کەوابوو سۆرشتییە ئەگەر پراوێزەکانی ئەم دوو کتێبە لە مێژوویەکی دیاریکراو بی بەری بێت. لە حاڵێکدا قورئان کومەڵێک وەحی اللهییە کە لەساڵەکانی ناردن دا (بعثت)، و بەماوەی ٢٣ ساڵ تەنیا بۆ ڕەسوڵی خودا هاتووتە خوارەوە. هەوڵم داوە تەنانەت ئەم ئاوڕدانەوە بەتەوراتە، ئەگەر بە پێویستێکی مێژوویی بزانم، لە گەڵ هاوێنەکانی ئاشکرا و شیاوی شوێن کەوتنی دیکەدا هاودەق بکەم. لەم بارەوە و بە خۆشحاڵییەوە زۆرینەی ئاماژەکانی تەورات بۆ هخامەنشییەکان لەگەڵ دیمانە و ووتار و بەڵگە مێژووییەکانی دیکەدا هاودەق و هاو ناوەڕۆکن.

بەڵام ووتاربێژەکان و ناردراوەکانی من هەرچی بێژن، هەر ئەوە بە ئەنجام دەگەیەنم. ئەوانە ووتوویانە کە کاولگەکانی ئورشلیم چاک دەکرێنەوە و بازێرەکانی یەهودا جارێکی تر ئاوەدانی بە خۆیانەوە دە بینن. کەوابوو بزانن ووتەکانی ئەوان ئەنجام دەدرێت. کاتێک کەمن بەدەریا بێژم ووشک بە، ووشک دەبێت. ئیستاش دەربارەی کورشەوە ئەیژم کە ئەو بەڕێوەبەرێکە کەمن هەڵم بژاردووە و فەرمانەکانی من بە ئەنجام دەگەیەنێ. ئەو دیسانەوە ئورشلیم چاکدەکاتەوە و ماڵەکەم دیسانە وە بنیات دە نێتەوە. (عهد عتیق، اشعیا، ٢٦_ ٢٨ : ٤٤)

باوڕی پەسن و سوپاس کردنی تەورات لە کورش ، ناوبراوی وەکو پەیغەمبەرەکانی یەهود لێکردووە کە ڕاستەخۆ دەبوونە پەیغامگیری خودایٚ گەورە ، و ئەمە دژوارییەکی گەورەیٚ بۆ مێژوونووسان خوڵقاندووە . ئەگەر ئەوانە ڕاگەیێندنەکانی تەورات لەناساندنی کورشدا بکەن بەبەڵگە ، کورش وەکو پەیک و ناردراوەی یەهوە دەناسێنێت و لەگەڵ ئەو بانگەشەدا کە کورش بە پڕوپاگەندەچی ئایینی زەردەشت دەزانن ، دەکەوێتە دژەری و پووچەڵ دەبێتەوە و ئەگەر قبوڵیشی نەکەن ، ئیتر دیار نییە بۆچی ئە بێت کورش بەبناغەدانەری مافی مرۆڤ بزانین . "

١ . خوداوند بەمەسیحی خۆی ، واتا کورشی ووت: کە دەستی ڕاستی ئەوم گرت تا ئۆمەتەکان لەخزمەتیدا بڵاو بکەمەوە و دەروازەکانی تر هەر لەسەر پشتبن و وەها فەرمایش دەکات : **٢ ـ من پێش لە تو بە لەنجەوە ڕێ دەکەوم (خواهم خرامید) و کەندو کوسپی شوێنە ناهەموارەکانت بۆ هەموار دەکەم و درگا برنجیەکان**(جۆرێک مەفرق) **دەشکێنم و کوڵومە ئاسنیەکانی دەبڕمەوە؛** ٣ . و گەنجینەکانی شاردراوەیٚ ستەم بۆتو ئاشکرا دەکەم و بەتۆیٚ دەبەخشم ، تابزانی من یەهوە کەتۆم بەناوی خۆتەوە بانگ کردووە خوداوەندی ئیسرائیلم . (عهد عتیق ، اشعیا ، ٤ـ١ : ٤٥ ، محمد قائمی ، هخامنشیان در تورات ، ل ١ ) .

ئەو پرسانە کەپەیوەندی بەداگیرکەرییە تۆند و بەپەلەکەی کورشەوە بۆ کۆمەڵێ لە نەتەوەو شارستانیەتە بەهێزەکانی ئێران و میزوپۆتامیاوە هەیە ، بەڵێنەکەیٚ یەهوە ئەرکی خۆیٚ بەجیٚ هێنا . چوونکە شایەتییەکان نیشانی ئەدەن کە یەهودییەکان لەبڕینەوەیٚ کوڵومی ئاسنینی دەروازەکانی پاتەختی ئەم شارستانیەتانە نەقشێکی بەرچاوی هەبووە ، تاڕادەیەک گوایە ئەم قەوڵە ئیلاهییە پاش ئەنجام بوونی نووسراوە! باوڕکردنی ئەم پەیامەی تەورات ، هەروەها کەووتم ، نە تەنیا هەوڵی مێژوونووسانێک وەکو خانمی مری بویس و هەندێک لە پاشکۆ نێوخوییەکانی ، کە کورش بەپشتیوان و ڕاگەیێنەری ئایینی زەردەشت دەزانن ، پووچەڵ دەکاتەوە ، بەڵکو ناوەڕۆکی تاکە بەڵگەیەک کە لەکورش ماوەتەوە ، واتا گلە نووسراوەکی بابوڵ ، بەگشتی دەباتە ژێر پرسیار .

مەردوک لەهەموو وڵاتەکان بۆ دۆزینەوەیٚ پادشاهێکی دادمەند ، بەشێوەیەک کەخۆی دەیویست ، دەستی بەپشکنین کرد ، ئەوکاتە دەستی پادشاهێکی گرت . (مەردوک) کورش پادشاهی شاری ئانشانی (بۆ) پادشاهی وەرگیرادراوەکەی ئاغای حەسەنی قائیمی لەگەڵ ناوەڕۆکە عێبرییەکەیٚ تەوراتدا هاودەقتره . لەتەوراتە تازە چاپکراوەکاندا نێو بردنی کورش وەکو مەسیحی خوا ، خراوەتە پشتگوی .

هەموو جیهان بە نێوی خۆیەوە بانگ کرد . . . مەردوک خوداوەندی مەزن لەکردەوێ من شاد بوو و منی کوروش پادشاهێک کە ئەو دەپەرەستی و کمبوجیەی کوڕم و گشت سوپاکەمی بەرز ڕاگرت . (کورش ، گل‌نبشته ، سطرهای ۱۲ و ۲٦)

بەم جۆرە ، لانی کەمی تا ئەو شوێنە کە بە باوەڕە ئاینییەکەێ کورشەوە پەیوەندی هەیە ، ئیستا لەگەڵ سێ کورشدا ڕووبەڕوو دەبینەوە : کورشی یەهودی بە شایەتی تەورات ، کورشی زەردەشتی بە شایەتی خانمی مری بویس و شاگردەکانی وکورشی هەڵبژاردەێ مەردوک خۆداوەندی مەزنی بابوڵ ، بە شایەتی گڵە نووسراوەکەی خۆدی ناوبراو .

لەروانگەێ ئاینییەوە ناکرێت لەنێوان قبوڵی زارەکی کورش بەخوداوەندانی مەزنی نائێرانی و بڕواکردن بەئەهورامەزدای خولقێنەری تاکەخۆدایی پێکەوە ژیان پێک بهێنرێت . بەڵام ئەگەر بە هەبوونی خودایانی بەوجۆرە بڕوا دەکات بەهەر ڕادەیەک کەنائاسایی خۆێ نیشان بدات ئەو لەچوارچێوەی سۆنەتە فەرهەنگیەکاندا کار دەکات کەئەوەشی هێناوەتە ژێر دەسەڵاتی خۆێ . (مری بویس تاریخ کیش زردشت ، جلد دوم ، ل ۹۸) .

خانم مری بویس بریاری نووسراوی کورش لە گڵە نووسراوەکەدا بەبریاری زارەکی دەزانی و بەناسازگاری وەها کورشێک لەگەڵ کورشی زەردەشتی و تاکەپەرەست وڕێزداری ناوبراو ، دیسان بەشێوەی ئاسایی بۆ پرسەکە وڵام ئیخلاقی ئەبینێتەوە ، نەوەک مێژوویی بەڵام بۆ مێژوو نووسێک کە دڵپاکی ساکارانە پەسەن ناکات ، جێگاێ سەرسووڕمانە کە نوێنەرانی هەرسێ ئاینی گرنگی مێزوپۆتامیا ، زەردەشت و یەهوە و مەردوک ، لەم ڕاسپاردەدا کە کورش ئەبی یەهودییە دیلەکان لەبابوڵدا ئازاد بکات و شتومەکی تاڵانکراوی پەرەستنگەکانی ئورشلیم بۆ ئەوانە بگیرێتەوە و گرنگترین ئارەزووی یەهود ، واتا دیسان چاککردنەوەێ ماڵی خۆدا مسوەگەر بکات ، هیچ جیاوازیکی لەگەل یەکدا نەبی !!!

لەلایەنێکی دیکەوە ، خۆداوەند حەزێکی فراوانی خستەدڵی بەرێوەبەرانی تایفەکانی یەهودا و بنیامین و پێشەوایان و لاوییەکان تا بۆئورشلیم بگەڕێنەوە و دیسانەوە ماڵی خۆداوەند دامەرزێننەوە . هەموو دراوسێکان ، پێشکەشیەکانی ماڵی خودایش بخەینەسەری ، پێشکەشی زێر و زیو و تۆشەی ڕێگا وچوارپێ بۆرێبوارانیان پێشکەش کرد . کورشیش کەرسە پربەهاکانی ماڵی خودای کە نەبوکەدنەسر تاڵانی کردبوو و لە پەرەستنگەکان دانایەوە و ڕادەستی یەهودییەکانی کرد . کورش بەخەزانەدارەکەێ "میتراداد" ئەمری کرد کە هەموو شتە پربەهاکان لەخەزێنەکە بهێنێتە دەرەوە و ڕادەستی شیشبصر بەرپرسی یەهودییەکانی بکات کە دەگەڕانەوە بۆ سەرزەوینی

یەهودا . ئەم کەرەسە بەنرخانە بریتی بوون لە : ٣٠ سینی ئاڵتوون، ١٠٠٠ سینی زیو، ٢٩ سینی هەمە جۆرە، ٣٠ جامی ئاڵتوون، ٤١٠ جامی زیوین، دەفری هەمەجۆرە ١٠٠٠ دانە و سەرجەم ٥٤٠٠ شتی بەنرخ لە زێر و زیو، ڕادەستی شیشبصر کرا . (عهد عتیق، عزرا، ١١ـ٥:١)

لانی کەمی، خوداوەندی مەردوک دەبووا بەو بڕیارەی کورش دژبەر بووایە، چوونکە پێش لەوە کە نەبوکەد نەسر ئورشلیم کاول بکات، بەفەرمانی ئەو دیلە ئیسراییلیی و سامانەکەیان بۆ بابوڵ گواسترایەوە! کەوابوو ناچارین بەشی ئایینی ـ ئیخلاقی پرسەکە بخەینە پشتگوی و بیر لە بەشە سیاسییەکەی بکەینەوە کە یارمەتی من ئەدات سەرنج بخەمە سەرپەیوەندییەکانی نێوان کورش و یەهود . مێژووی سەرەکی نەتەوەی یەهود تەورات و پاش ئەوە ئەنسیکلوپدی یەهود، مێژووی یەهود، گرائتز، "مێژووی نەتەوەی یەهود" سیسیل ڕووت "مێژووی ئیسرائیل" برمینویچ و لە ئیراندا کۆی سێ بەرگی "مێژووی یەهود لە ئێران" دوکتور حبیب لوی و مێژووی یەهود پرویز رهبر دەناسین . بەڕوانەت وادیارە، یەهود مەیلێکی بەرچاوی بۆ هەڵسەنگاندنی مێژووی نەتەوەکەی لەگەڵ نموونە و ئیستاندارەکانی سەردەمی تێدا بەدی ناکرێت، چوونکە لەو حاڵەدا بێگومان ڕاستیی مێژوویی چەن بەشێک لە تەورات بەتەواوی نرخەکەی ئەدۆڕێنێ، کەبۆ بەرپرس و کاربەدەستانی "کنیسەکان" ڕۆشن ناکرێتەوە . وەهایە کە مێژووە سەربەخۆکانی نەتەوەی یەهود، هەمیشە دەگمەن و نایاب بووە . ئەوباسانە کە پاشتر لەم کتێبەدا هێمای پێدەکرێت، ڕوانگەیەکە تایبەتی وڵامەکەی بریانە واتا "بۆچی کورش؟" ە کە بۆ یەکەمین جار و بۆ مێژووی دەگیرمەوە . سەرسووڕمانی گشتی مێژوونووسان لە سەرهەڵدانی کورش لە هیچ، ئەوەش لە هەرێمێکدا کە لە ژێردەسەڵاتی یەکەمین و پرهێزترین نەتەوەکانی جیهانی دێرینەدا، ئیستا لەم کتێبەدا وڵامێکی شیاو دەبینێتەوە، دیمەنی شێواوی ئیمپراتوری هخامەنشییەکان بۆرێکوپێکی دەگوردرێت . و بناغەی مادی و عەقڵی دەسەڵاتی کورش دیمەنی خۆی دەنوێنێ . نهێنی ئەم سەرهەڵدانە و دەسەڵاتە چاوڕوان نەکراوەکەی، ئەبی لە سێ سەدەی نائارامیە یەک لە دووای یەکەکان، و لە نێوان نەتەوە و سەرزەوینی یەهود بەدووایدا بگەڕین .

مێژووی یەهود دەورانێک دروشاوەتر لە سەردەمی پادشاهی داوود و سلیمانی لەبیر نییە . تەورات دەربارەی دەسەڵاتی داود ئەوەندە پێش دەکەوێ کە دە نووسێ: ئەو بڕیاری دا کەخانوویەک بۆ

خوداوەند دروست بکات و خوداوەند ئەم ئەرکەی لەناوبراو سەندەوە.

داود شاه لە کوشکەکەیدا بە دلنیاییەوە نیشتەجێ بوو، چوونکە خوداوەند ئەوی لە شەڕی گشت نەیارانی دەرباز کردبوو. ڕۆژێکیان داوود بە ناتانی نەبی ووت: من لەم کوشکە جوانەدا کە بە داری سنەوبەر دروست کراوە ژیان دەکەم، لە حالێکدا سندوقی پەیمانی خوداوەند لە خێوەتێکدا دەپارێزدرێت! ناتان لە وەلامدا ووتی ئەو شتە کە مەبەستتە بە ئەنجامی بگەیەنە، چوونکە خوداوەند لەگەل تودایە. بەلام شەوەکەی خوداوەند بە ناتانی فەرموو کە بروات و بە خزمەتکارەکەی داود بێژێ: تو ناتووانی بو من خانوو دروست بکەیت. من هیچ کاتێک لە خانوویەکدا نەژیاوم لەو کاتەوە کە بە نی ئیسرائیلم لە میسر هێنایە دەرەوە تا دەگاتە ئەمڕۆژە، خانووی من خێوەتێک بووە، و لە شوێنێکەوە بو شوێنێکی دیکە لە جموجوولدا بووم. بەدرێژایی ئەم ماوەیە، هیچ کاتێک لە بەڕێوەبەرانی ئیسرائیل کە ئەوانم بو شووانی هوزەکەیان دابین کردبوو، نەمووتووە کە بوچی خانوویەکم لە داری سنەوبەر بو دروست ناکەن؟. ئیستا خوداوەندی بەرز و توانا دەفەرمێ کە کاتێ لە شووانێکی ساکار زیاتر نەبووی و لە لەوەڕگەکاندا لە مەڕو مالاتەکەت پارێزگاریت دەکرد، توم بو بەڕێوەبەری هوزەکەت هەلبژارد. لە گشت شوێنێکدا لەگەلتا بووم و نەیارانتم فەوتان. تو لەمەش کە هەیت مەزنتر دەکەم، تاوەکو بو یەکی لە بەناوبانگترین زەلامی جیهان سەرکەوی! بو هوزەکەم سەرزەوینێکم هەلبژارد تا لەو شوێنە سەرو سامان بگرن (گەشە بکەن) ئەم شوێنە ولاتی ئەوانە و هوزە بوتپەرەستەکان، ئیتر وەکو ڕابوردوو کە هوزەکەی من کوچبەری ئەم سەرزەوینە بوون، لەوانە ستەم ناکەن. تو لە شەڕی هەموو نەیارانت دەپارێزم. ئەمە منم کە خانووەکەی دروست دەکەم. کاتێک تو کوچی دووایت کرد و لەگەل باپیرانت پەیوەندیت کرد، من یەکی لە کوڕەکانت دەکەم بە میراتبەری تاج و تەختەکەت و دەسەلاتی ئەو سەقامگیر دەکەم. ئەمە هەر ئەو کەسەیە کە خانوویەک بومن دروست دەکات و من پادشاهییەکەی هەتاهەتایە لە سەر پێ ڕادەگرم. (عهد عتیق، دوم سموئیل، ١٤_١:٧)

**مێژووی یەهود، دەورانی داوود بە پەلاماری یەهودییەکان بو سەر فلستینییەکان و دراوسێیەکانی دیکەیانەوە گرێ ئەداتو لەوانەێ ئە مە تەنیا ڕووپەلی مێژووی دێرینی نەتەوەی یەهودە کە ئاماژە بو نیزامیگەری پەیڕەوانی موسا دەکات. لەم بارەوە سەهیونیزمی هەنووکەیی لەوانەیە بە جورێک لە داوودیزم بزانین.**

تەمەنی داوود گەیشتبووە ٣٠ سال کە بوو بە پادشاه و ٤٠ سالیش پادشاهی کرد، ٧ سال لە حبرون و ٣٣ سال لە ئورشلیم کە ئەو شارەی کرد بە پاتەختی خوێ، حەزرەتی داوود هەموو نەیارانی بەنی ئیسرائیل، یبووسیەکان، فلستینییەکان، مواب، صوبە ارام، عمالق، ادوم و عمونی ی تێکشکاند و سنووری ولتی پەرەپێدا و بەرادەیەک کە لە تەوراتدایە، لە میسرەوە گەیاندیە فورات. سامانی ولاتی زورکرد، وێژەو ئەدەب و موزیکی عبری گەیاندە پلەیەکی بەرز، یەکیەتی ڕاستەقینەی بەنی ئیسرائیلی بتەوتر بناغەی خانووی یەکەمی دارشت و نێوی ئیسرائیلی

مەزن و سازمانی ئەرتەشی وڵاتی ڕێکوپێک کرد . (دکتر حبیب لوی، تاریخ یهود ایران، جلد اول، ل ٦٤) .

بەڵام سلیمان، کوڕی داوود ئیتر نیزامی نەبوو . ئەو بازرگانی دەزانی و خێڵەکەی خۆیٚ خۆش دەویست . دەورانی سلیمان لەگەڵ ئەفسانەی نەتەوەکانی ڕۆژهەڵاتدا تێکەڵ بووە و هێشتاش نێوی سلیمان ،فراوانی ،هەبوون، توانینٚ و تەنانەت زانست و عەقڵ دەهێنێتەوە یاد .

سلیمان پادشاە سەرەڕایٚ سەندنی باج و سوودی بازرگانی و باج و زەکات لەپادشاکانی عەرەب و دەسەڵاتدارانی سەرزەوینی خۆیٚ، هەرساڵ ٢٣ تەن ئاڵتوونیش داهاتی بوو . سلیمان لەم ئاڵتوونە دووسەد سپەری گەورە، هەرکامەیان بەقورسایی چوارکیلو و سێسەد سپەری بچووک هەرکامەیان بەقورسایی دووکیلوی دۆرستکرد . پادشاە ئەم سپەرانەیٚ لەتەلاری گەورەیٚ کۆشکەکەیدا کەنێوی "دارستانی لوبنان" بوو، داینا . ئەوٚ تەختێکی پادشاهی گەورەشی لەعاجی فیل دۆرستکرد کەڕووکەشەکەی لە ئاڵتوونی ڕووت بوو . ئەم تەختە شەش پێکڵەیٚ هەبوو و بەشی سەرەوەیٚ لەبازنەیەکی کەوانی پێکدەهات . لەدوو کەنارەکەیدا دوو دەسک و دوو پەیکەر لەنەقشی شێری ڕاوەستاو لەتە نشتی پلیکانەکانیدا دانرابوو . ئەم تەختە لەهەموو جیهاندا بێوێنە بوو . هە موو جامۆڵەکانی سلیمان و دەفرەکانی "کۆشکی دارستانی لوبنان" لەزێڕی ڕووت بوو . لەنێو ئەوانەدا تەنانەت دەفرێکی زێوین دەس نەدەکەوت، لەبەرئەوە بەڕادەیەک ئاڵتوون زۆر بوو کە پێویستی بەزیو نەدەما ! کەمیەبازرگانییەکانی سلیمان پادشاە بەیارمەتی کەشتییەکانی حیرام، هەرسێساڵ جارێک بەباری ئاڵتوون و زیو و ددانی فیل، مەیموون وطاووسەوە دەهاتنە لەنگەرخانەکانی ئیسرائیل . سلیمان لەگشت پادشاکانی جیهان دەوڵەمەندتر و زاناتربوو . هەموو خەڵکی جیهان تامازرۆیٚ دیمانەی سلیمان بوون تا مەگەر شایەتی ئەوزانایی و بلیمەتە بن کەخۆداوەند بەوی بەخشیوە . هەموو ساڵێک کۆمەڵێک لەخەڵک دەهاتن بۆ دیتنی ئەو و سەوقاتی زێڕو زیو و جلوبەرگ و بۆنەرامە و چەکوئەسپ و قاتریان پێشکەش دەکرد . سلیمان خاوەنی ١٤٠٠ ئەرابە و دووازدەهەزار ئەسپ بووە کەهەندیٚ لەوانە لە پاتەخت و هەندێکیان لەشارەکانی دیکەدا ڕادەگیران . کاتێک کەسلیمان لەئورشلیم دەژیا، زیو وەکو لمی چۆڵاییەکان فراوان بوو و لاکێشە تەختەیٚ سنەوبە ر وەکو داری ئاسایی بەکار دەبرا . (عهد عتیق، اول پادشاهان، ٢٩ـ١٤:١٠)

سلیمان خانووی یەکەمی خۆداوەندی دۆرستکرد و لە کاتی ئەودا یەکیتی سیاسی اسباط، بەبۆنەیٚ فراوانی پێداویستی ژیانەوە، لەوپەڕی قایمی وبتەویدا بوو . نەتەوەیٚ یەهود هەمیشە ئەوسەردەمە بەبیرەوەرییەکی خۆش بەیاد دەهێنێتەوە و بە سەردەمێکی زێڕینی خۆیٚ نرخاندووە .

سلیمان حەفتسەد ژن و سێسەد خزمەتکاری ژنی هەبوو . ئەم ژنانە هێدی هێدی سلیمانیان لەخۆدا دوور خستەوە، بەشێوەیەک کاتێک تەمەنێکی تێپەڕ کردبوو، لەجیاتی ئەوە کە وەکو بابی خۆدا پەرستی بکات بەپێشە

ڕچەیٚ بوٚتپەرستی گرتە پێش . . . ئەوٚ بەرانبەر بەخوٚدایٚ گەورە تووشی تاوان بوو و وەکو بابی لەخوٚدا پەیڕەوی تەواوی نەکرد . تەنانەت لەسەر دوو کێوی هەڵکەوتوو لەڕوٚژهەلاتی ئورشلیم ، دوو بوٚتخانەیٚ بوٚ کموش ، بوٚتی نیفرەت لێکراوی موآب ومولک بوٚتی نیفرەت لێکراوی عمون دورست کرد . (عهد عتیق ، اول پادشاهان ۳۰ـ۸:۱۱)

هاوکاتی کوٚچی دووایی سلیمان ، کێشەو چەن دەسەیی دەستی پێکرد . لەوانەیە کە ئەو دوٚخە ئاکامی ململانی بوٚ دابەش کردنی میراتی سلیمان بوویێت کەبوو بەهوٚکاری جیابوونەوەیٚ اسباط بوٚ دوو گرووپی گرنگی یەهودا و ئیسرائیل ، لەدەسپێکی هەزارەیٚ یەکەمی زایینی‌دا . ئەمە سەردەمێکە کە سامانی فراوانی نەتەوەیٚ یەهود و دوو دەستەیی قووڵی نەتەوەیی ، شارستانیەتەکانی مێزوپوٚتامیا کەپێش لەوە نەتەوەیەکی یەک خوٚدایی لەدەور و بەری خوٚیێدا وەرنەدەگرت ، بوٚ تاڵانکردن و پڕوٚبڵاکردنی نەتەوەی یەهود هاندا .

لەچواردەهەمین ساڵی پادشاهی حەزقیا ، سنخەریب ، پادشایٚ ئاشور هەموو شارە دەورگیراوەکانی یەهودای دوڵپێچ و پاشتر داگیری کردن . حزقیای پادشا کە لەلاکیش بوو ، ئەم پەیٚغامەی بوٚ سەنخەریب بەڕێکرد : من هەڵەم کرد ، لەوڵاتەکەم دەرکەوە و بوٚ وڵاتەکەیٚ خوٚت بگەڕێرەوە و من هەر باجێک کە بتەوی پێشکەشی دەکەکەم . پادشاهی ئاشور لەوڵامدا دەهەزار کیلو زیو و هەزار کیلو زێری پێشنیارکرد . حەزقیا بوٚکوٚکردنەوەی ئەم باجە ، هەموو زیوەکەی ماڵی خوٚدا و خەزانەیٚ کوٚشکەکەیٚ هەڵگرت و تەنانەت ڕووکەشی درگا و کوٚڵەکەکانی خانەیٚ خودایٚ کەندەوەو خستیە سەری و پێشکەشی پادشایٚ ئاشوری کرد . سەرەڕایٚ ئەوەش ، پادشایٚ ئاشور سوٚپایەکی گەورەیٚ بەسەرکردایەتی سیٚ فەرماندەیٚ هێزەکانی خوٚیٚ لە لاکیشەوە بوٚ ئورشلیم بەڕیٚکرد . ئەوانە لەسەر ڕێگای "کێڵگەیٚ جل‌شوٚرەکان" لەبندەستی کەناڵی گەنکاوی سەرووی جیٚگیر بوون . (عهد عتیق ، دوم ، پادشاهان ، ۱۸ـ۱۳:۱۸) .

پاش نزیکەی ۲۰۰ ساڵ کێشەیٚ کاولکاری نێوخویی لەنێوان اسباط و یەهوددا ، دووایی دوو پەلاماری لەشوێن یەک بوٚسەرزەوینی یەهود لەسەردەمی سەنخەریب و سەلمانسەردا ، لەبەڵگەکانی ڕوٚژهەڵاتی ناوڕاست ، باسی بڵاوبوونەوەیٚ ئەوٚ هوٚزە دەکات و لەوە بەدوواوە سەردەمی زێرینی سلیمان ، نەتەوەیٚ یەهود بەدرێژایی سیٚسەد ساڵ ، واتا تا سەرهەڵدانی کورش ، داگیرکەری بابوٚل ، ڕووی ئاشتی و هێمنی بەخوٚیەوە نەدیووە ، مەگەر چەن دەورەیەکی کوٚرت . ئاکامی هێرشەکانی ئاشور ، پڕوٚبڵاو بوونەوەی نەتەوەیٚ یەهود و کوٚچ بەر بوون و کوٚچ بەر کردنی زوٚرەملی دوو خێڵی بەدەسەڵاتی هەر دوو پەلی ئەم نەتەوەیە بوٚڕوٚژئاوا ، ڕوٚژهەڵات ، باکوور و باشووری و دەوڵەتی

میدیاکان بوو .

بەڵام دەربارەی حزقیای یەهود کە نەیدەویست لەژێر دەسەڵاتی منداییت . من ٤٦ شار لە شار قایم و قەڵای شارە بچووکەکانیم گەمارودا و بە هێزی بەرانەکانم و ئامرازی تایبەت داگیرم کرد . من٢٠١٥٠ کەس گەنج و بەساڵاچو و ئافرەت ، ئەسپ ، قاتر ، گویدرێژ ، حوشتر ، گا و مەرِم بەدیل گرت و تاڵانم کرد . بەڵام خۆدی ناوبراوم وکو پەلەوەری قەفەسی لەپاتەختەکەی لەئورشلیم بەند کرد . دەور وبەریم بەبورج و دیوار گەمارۆدا . ئەوانەکە دەیانویست لە دەروازەیّ شارەکان وەدەرکەون ، بۆناوشارەکان گەرانمەوە و شارەکانیانم لەپاش تاڵان داگیر کرد و ئەم شارانەم لەنێوان "میتینی" سوڵتانی ئەشدود بە "پادی" سوڵتانی "ئیمکارونا" (ئەکرون) و بە "زلیبل" و "حازیتی" (غزە) دابەش کرد و وڵاتەکەیم بچووک کردەوە: باج و پەرداختی ساڵانەیم بەرز کردەوە کەبەدەوڵەتەکەم پێشکەشی بکات . خۆدی حزقیا لەدەوڵەتە سەرکەوتووەکەم کەوتە دڵەراوکیّ . ئورییەکان (عارەبەکان) ئەوسەربازە وەفادارانە کە بۆ بەهێزکردنی ئورشلیم هاتبوونە نێو شارەکەوە چەکەکانیان تووردا . ئەوّ ٣٠ تاڵان زێر ، ٨٠٠ تاڵان زیو ، و بەردی بەنرخ ،کەبەهاێەکی زۆریان هەبوو ، عاج و تەختی عاج و پێست و ددانی فیل و داری ئودکاریمو وهەمەجۆرە خەزێنە و زەلام و ئافرەتی مووسیقازانی بۆپاتەختەکەیّ من لەنەینەیا بەرێکرد . نوێنەرەکەی بە ئەسپەوە هەنارد کە چاودێری باش بەڕیوە چوونی پێشکەشکردنی ئەو شتانە بکات و نرخ و ڕوومەتم بەجیّ بهێنیّ . (دکتر حبیب لوی ، تاریخ یهود ایران ، ل ٩٦ و ٩٧)

**سامانی یەهود شمشێرە دوو دەمەمەکەیەتی . بەهێزی ئەوّ شمشێرە خۆیّ لەدژوارترین دڵەڕاوکی دەرباز دەکات و نەیارانی لەهێزی ئەو شمشێرە بۆتاڵانکردن ئاگا دەکاتەوە . نەبوکەد نەسر پادشاە بابوّل بۆ دووا جار ئەوانەیّ تێکشکاند ، کەئەوتێکشکاندنە بوو بەهۆی پەرژوبڵاوی تەواوی اسباط ، خۆبەدەستەوەدانی ئورشلیم و کاولبوونی ماڵی خۆدا لەشوێنی پیرۆزدا . نەبوکەد نەسر هەموو هەبوونی پەرەستنگەکەی بۆ بابوّل گواستەوە و ژمارەیەکی زۆر لەبەرپرسان و گەورەپیاوان ، دەوڵەمەندان ، هونەرمەندان ، زانایان و پێشەسازانی یەهودی بەدیلی بۆبابوّل بەرێکرد .**

صدقیا دژی پادشاهی بابوّل سەری هەڵدا و نەبوکەد نەسر گشت ئەرتەشەکەیّ بولاێەنی ئورشلیم سەفەربەر کردو لەڕۆژی دەهەمی مانگی دەهەم لەساڵی نۆهەمی پادشاهی صدقیا ، پادشاهی یەهودا لەئورشلیم دا گەمارۆ دا . ئەم گەمارۆە تا یازدەهەمین ساڵی پادشاهی صدقیا درێژەیّ هەبوو . لەڕۆژی نۆهەم لەمانگی چوارەمی ئەوّ ساڵەدا ، قات وقری بەرادەیەک لەشارەکەدا بڵاو بووەوە کەدانیشتووانەکان هیچ شتێکیان بۆخواردن بەدەس نەدەکەوت . ئەوّشەوە ، صدقیای پادشاە و هەموو سەربازەکانی دیواری شارەکەیان کوّن کرد و لەدەروازەیەک لەنزیک باخەکەیّ پادشاهەوە بۆ دۆڵی ئوردۆن هەلهاتن . سەربازە بابوّلییەکان کەشارەکەیان دوڵێیچ کردبوو ، شوێنی

پادشاهیان هەڵگرت و لەچۆڵاییەکانی ئەریحادا دەس بەسەریان کرد و بەم بۆنەوە هەموو سەربازەکانی بڵاو بوونەوە. ئەوانە صدقیایان بۆ ربلە گواستەوە و پادشاهی بابۆل ناوبراوی خستە ژێر لێپرسین و تاوانباری کرد. پاش ئەوە کوڕەکانی صدقیایان لەبەرچاویەوە کوشت چاوی خۆیشیان دەرهێنا و بە زنجیر بەستیانەوە و بۆ بابۆل بەڕێیان کرد. نەبوزرادران فەرماندەی سوپاکەی نەبوکەدنەسر لەرۆژی حەفتەمی مانگی پەنجەم لەساڵی دووازدەهەمی پادشاهی نەبوکەدنەسردا، دەربازی ئورشلیم بوو. ئەو ماڵی خۆداوەند، کۆشکی پادشاهی و هەموو بینا بەنرخەکانی سووتاند. پاش ئەوە بەهێزەکانی بابۆلی ئەمری کرد کە دیوارەکەی شاری ئورشلیم کاول بکەن و خۆدی خۆی چاودێری ئەم کارەی کرد. ناوبراو پاشماوەی دانیشتووانەکەی لەگەڵ لایەنگرەکانی پادشای بابۆلدا، بۆ بابۆل دوور خستەوە. بەڵام کەسانی هەژار و بەلەنگاز مانەوە تا بەکاری کشتوکاڵەوە سەرقاڵ بین. بابۆلییەکان کوڵەکە مەمفرەقی و قووڵکەکانی خانووەکەی خۆداوەند وماسە گەرۆکێک کەلەو شوێنە بوو، هەموویان شکاند و لەتە مەفرەقەکانیان بۆ بابۆل گواستەوە. هەروەها گشت مەنجەڵەکان، خاکەنازەکان، مقاشەکان، قاپ‌وقاچاخ و هەموو کەلوپەلی مەفرەقی کەتایبەتی قوربانیکردن بوو، تالانیان کرد، ئەوانە تەواوی کوانوو ئاگر و جامۆڵە زێرین و زیوینییەکانیشیان تالان کرد. کوڵەکەکان و حەوزە گەورەکان و مێزەکانی دەوروبەری کەسلیمان پادشاه بۆ ماڵی خۆداوەند دروستی کردبوو، بەرادەیەک زەبەلاح بوون کە قورساییەکەی داپین نەدەکرا. (عهد عتیق، دوم پادشاهان، ١٧-١ : ٢٥)

ساڵی ٥٨٦ی پێش زاینی ئەبی بەساڵی هەڵپێچاندنی هەموو شارستانیەتی یەهودی بزانین. پاش کاولکردنی ماڵی خۆدا، ئەو یەهودییانە کە توانابیان هەبوو، بۆرۆژهەڵات هەڵهاتن کە شوێنێکی جێگای دڵنیایی بوو. بەشی گەورەی دەوڵەمەندان و زانایان لەلایەن بابۆلەوە بەدیل گیران و بۆبابۆل گواسترانەوە. و کۆمەڵێکی بچووکیان وڵاتەکەیان بەجێ نەهێشت و هەر لەوێ مانەوە. ئەمانە ئەو یەهودییانە بوون کە خۆدای موسایان پەرەستش نەدەکرد و ئامۆژگارییەکانی تەوراتیان بەجێ نەدەهێنا. لە شوێنی خانەی خودا پەیکەری مەردوک دانرابوو. و لەکۆتاییدا چەن خۆدا پەرەستەکانی مێزوپۆتامیا تاک پەرەستە یەهودییەکانیان لەگۆڕەپان وەدەرنا.

نۆهەمی مانگی تەمووزی ساڵی ٥٨٦ی پـ.ز، رۆژێکی رەش بۆ نەتەوەی یەهود بوو(١) و ئەو برینە کە لە پەیکەری یەهود درا، بەرادەیەک قووڵ بوو کە پاش ٢٦ سەدە هێشتا شوێنەوارە وەیشومەکەی ماوەتەوە: دراوسێیەکانی دەوروبەری یەهودا کە داکۆکییەکەی صدقیایان بەرانبەر کەلدانیەکان هان ئەدا، خۆدی خۆیان تالانکەر بوون. پادشاه و بەشێک لەگەورەپیاوان و سوپاکە لەلایەنی رۆژهەڵاتی پاتەختەوە هەڵهاتن و بۆدەوروبەری ئەریحا سەرەوخوار بوونەوە، بەڵام دوژمن بەم مەبەستەی زانی و کەوتە شوێنیان و ژمارەیکیان

دەس‌بەسەرکرد و ئەوانە کە مابوونەوە پەردەوازە بوون . صدقیاهو برایە پێش بەخت ئەلنەسر لەرِبلە ، منادالەکانیان لەبەر چاویەوە کوشت و چاوی خۆشیان دەرهێنا و زنجیریان لەدەست وملی کرد و وەکو دیل بۆ بابوڵ گواستیانەوە و بەم جۆرە دڵتەزێنە پادشاهی بنەماڵەی داوود کۆتایی پێ‌هات ، لەم ساڵەدا ٧٣٢ کەس لە چینەکانی سەرووی پاتەخت بەدیلی بۆبابول بەرێ‌کران . ( دکتر حبیب لوی ، تاریخ یهود ایران ، ل ١١٦ـ١١٤ )

**بەگوێرەی مێژووە فۆرمیەکان ئەوکاتە تەنیا ٢٧ساڵ بۆ دەسپێکی دەسەڵاتداری کورش مابوو ، بەرانبەرنەقشەکەی دوکتور لوی ، لەکتێبی تاریخ یهود در ایران کەبەشێوی پراوێز نووسیویە ، و لە لاپەڕەکانی دووایدا دووبارەی دەکەمەوە کەنزیکەی هەمووی پاشکەوتووەکانی موسا لەئێراندا نیشتەجێن ، ماڵی خوا لە ئورشلیم بەکاولکراوی مایەوە ، دیلە یەهودییەکان لەبابول وەستاون و سامان و دەفرە پیرۆزەکانی پەرەستنگەی یەهود لە ژوورەکانی ژێرزەوینی کۆشکەکانی بابوڵدا کۆکرابوونە کە دەبوون بەئامانجی بێ‌ڕوومەتی لەلایەن پادشاهانی بابوڵەوە .**

شەوێکیان بلشصر پادشاه میوانێکی سازکرد و هەزاران کەس لە گەورەپیاوانی وڵاتی بۆخواردنەوە بانگیشی ئەو میوانیە کرد . کاتێک بلشصر سەرقاڵی شەراب‌خواردنەوەبووئەمری‌کرد ئەو جام‌مولکە زێرین و زیوینانە کە نەبوکەد نەسری باپیری لەماڵی خودا لە ئورشلیمەوە هێنابووی بۆبابوڵ ، بهێنن تاکو پادشاه و گەورەپیاوان و ژنان و خزمەتکارانی پادشاه بەوانە شەراب بخونەوە و بوتەکانیان کە لەئاڵتون و زیو و مەفرەق و ئاسن و دار و بەرد دورستکرابوو ، پەرەستش بکەن . بەڵام لەحاڵێکدا نوقمی مەستی و خوەشی‌بوون ، لەپڕ پەنجەکانی دەستی مروڤێک ئاشکرا بوو و لەسەربەشێک لەدیواری بەرانبەر بەچرادانەکە دەستی بەنووسین کرد . پادشاه بەدیتنی ئەو پەنجانە کە خەریکی نووسین بوون لەترسان ڕەنگی ئاڵی دیمەنی دۆڕاند و بەڕادەیەک ترسا کەئەژنوەکانی کەوتنە لەرزین و نەیدەتووانی لەسەرپێ ڕاوەستێ . پاش ئەوە هاواری کرد : جادوگەران ، چارەبینان ، ئەستێرە ناسان ! هەرکەبتووانێ نووسراوەی سەر دیوارەکە بخوێنێتەوە و واتاکەی بەمن بێژێ ، جلوبەرگی پادشاهی لەبەردەکەم ، بازنەی ئاڵتونی لەگەردنی دەهاوێم و دەیکەم بەسێیەمین کەسی وڵات . ( عهد عتیق ، دانیال ٧ـ١ : ٥ )

**بێگومان کۆچبەران و سەرلێ‌شێواوانی یەهود ، بەوڕادەیە زانا بوون کە کاتی هەڵهاتن ، سامان بێ‌سنوورەکەی سلیمان بەجێ نەهێڵن و لەژێر جلوبەرگە دڕاو و پینەکراوەکانیانەوە بەشێکی بچووک لەداراییەکەی سەردەمی داوود لەگەڵ خۆیاندا بگوێزنەوە . دەتووانین بنەماڵە پڕۆڵاوەکانی یەهود بەبیر بهێنینەوە کەچۆن بەئاموژگاری ڕەدێن سپییەکی بەتەمەن وچەن گەنجی بەدەسەڵات ، ١**

١ ئەم مێژووە لەگەڵ تەوراتدا هاودەق نی‌یە ، چوونکە تەورات کولیەتی یەهودی لەبابوڵدا ٧٠ساڵ دەنووسێ (ارمیای ١٣ـ١١ : ٢٥) . لەحاڵێکدا نێوان ئەم مێژووە تا ئازادی دیلەکان ٤٨ساڵە .

لەسەر ڕێگای دوور و درێژی ئورشلیم تاباکوور و باشووری ئێران ، کاتی ڕوو بەڕوو بوونەوە لەگەڵ هۆز و خێلەکانی دیکەدا ، بەڕاکێشانی بەزەیی ، بەخششی چکۆلە چکۆلە ، ئامۆژگاری ژیرانە و لەوانەشە تێهەڵچوونی بچووک بچووک ، ڕێگای خۆیان بۆ سەرزەوینی دڵنیا و کە م کێشەی ئێران کردەوە ، یا لەلایەن ئەودزو جەردانەوە ڕووت دەکرانەوە ، کە ناو و دەنگی سامانەکەی سلیمانی هێشتا لە گوێیاندا دەزرنگایەوە .

ئەوەی کە سەلمێندراو و ڕاستە ئەوەیە کە یەهودییەکانی دانیشتووی کوردستان ، ئازربایجان و گیلان ، مازندەران و لە خۆراسانەوە تاکو سەمەرقەند و بۆخارا تا ئەفغانستان و هەندێ لە خێڵە مۆسڵمانەکانی دوواتر لە تیرەی ۱۰ اسباطەکەی بەنی ئیسرائیلن . (دکتر حبیب لوی ، تاريخ يهود ايران ) .

ڕچەی نێوە یەهودییەکان لە شارەکانی وەکو استرئاباد (گورگان) و دوڵی موسا لەو پەڕی تەپۆڵکەکانی آب علی ، گوندی گیلعاد لە دەماوەند و دەیان گوند و شوێنی دیکە ، کە بەنێوی مزگەوتی سلیمان ، تەختی سلیمان ، دوکانی داوود ، گلکۆی دانیال ، گلکوی استر و مەردخای وهی‌تر . لە مێژوو و جوغرافیای ئێراندا ماوەتەوە ، بەربڵاوی یەهود لە ئێران ، پێش لەسەرهەڵدانی کورش نیشان ئەدات . باسەکانی ئەم بەشە دەرفەتی وەهام پێ ئەدات کە بێژم نێوی "دایکی سلیمان" کە لەسە ر گۆڕەکەی کورش ماوەتەوە بلاوکراوە و ئیدانەی پڕ ناوەڕۆکی ئێرانییەکان ، بۆ گۆڕی کەسێک کە هەوڵی داوە یەهود بۆ سەردەمی مەزنایەتی سلیمان بگێڕێتەوە .

یەهودییەکانی دەماوەند یا گیلعاد پێ لەسەر ئەوە دادەگرن کە لە تیرەی اسباطی ڕئوبن و گاد و نەفتالی‌ن و تەنانەت دەزانن کە لە دیلە ئیسرائیلییەکانی دەستی ئاشورییەکانن کە بۆ ئەو هەرێمە دوور خراونەتەوە . لە مێژووی ئاشوریشدا ئەم پرسە ئاشکرا دەبێ کە تیگلت پیلتسەری چوارەم کە اسباطی بە دیل گرت ، تاچیای دەماوەند و چۆڵاییەکانی لووت ی داگیرکردو لای وابوو کە ئەم دوو شوێنە ئەو پەڕی دنیایە . مژارێکی باڵکێشتر نێوی گیلعادە کە لەسەر ئەم شوێنە دایان ناوە و تائیستاش هەر بەو نێوەوە ماوەتەوە . هەڵبژاردنی ئەم نێوە ، لەوانەیە بەو بۆنەوە بێت کە دانیشتووانی گیلعادی ئیسرائیل بۆ ئەم جێگا دوور خرابێتنەوە ، یاکاتێ کە دیلەکان هاوبەشی ڕواڵەتی ئەم شوێنە تازە و وڵاتەکەی خۆیان بەدی کرد نێوی گیلعادیان لەسەری دانا . لە گیلعادی ئێران ، گۆڕستانێکی کۆن هەیە کە تائیستاش وەکو کێوی زەیتوون لە ئورشلیمبە پیرۆزی دەزانن و ڕاسپاردەی ئیمانداران ئەوەیە کە پاش مردنیان لەو شوێنە بیاننێژن و ئەفسانەی زۆر سەبارەت بە پەیوەندی ئەم شوێنە و ئورشلیم کە قیبلەی یەهودییەکانە ، بەدەستەوەیە . گیلعاد یەکێ لە گەورەترین شوێنەکانی ئیسرائیل‌نشین لە باکووری ئێراندا بووە و درێژایی

ڕووبەرەکەیٚ تاسەدەیٚ ١٧ یٚ زاینی دەگەیشتە ٢٠ فرسەخ یا ١٨٠ کیلومەتر . ناوچەیٚ ناوبراو خاوەنی چەندین دەشتی بەپیٚز و پڕ ئاو و بەروهەمە کە چوار دەوری بەچیای کەم و بیٚش بەرزەوە دەورە دراوە و وەکو گالیلی سەرو لەوڵاتی ئیسرائیلە و میٚرگ و لەوەڕگەی باشی بۆ مەڕ و ماڵات هەیە و هەواش کویستانی و خوەشە . لەسەردەمانی پیٚشوودا شینایی (حەشیمەت) زۆر بووە و دانشتووانەکەیٚ بەڕادەیەک دەوڵەمەند بوونە کەعزرایٚ کاتب لەدووا سەفەرەکەیدا بۆشوش بەباشی زانیوە کە بۆ ئەو شویٚنە سە فەر بکات ، بۆیە ڕەنجی سەفەرەکەیٚ گرتە ئەستۆ و لەشوشە وە تا گیلعادی تیٚپەڕ کرد . گیرانەوەی ئەم سەفەرە و ئاکامەکانی پاش ٢٣/٥ سەدە هیٚشتا هەر لەسەر زاری ئیسرائیلییەکانی گیلعادە . (دکتر حبیب لوی ، تاریخ یهود ایران ، ل ٢٠٣ـ٢٠١)

**ئەمە ڕوونکردنەوەیٚ هەبوونی بەشیٚکی بچووک لە یەهودییەکانی ئیٚرانە ، پاش لابردنی ماڵی خوٚدا لەئورشلیم . دەتووانین ڕوونکردنەوەی زۆرتر و پرسەرنجتر لەبارەیٚ هەبوونی یەهودییەکان لەئیٚراندا ڕاگەیٚنین ، وەکو سەفەرنامەکەیٚ بنیامین تودلا ، دەربارەیٚ کۆمەڵگایٚ یەهودییەکان لەمیٚدیا و شارەکانی هەمەدان ئەبهەر ، زەنجان ، قەزوین ، ئەسفەهان ، ڕەی ، یەزد ، شیراز ، ئەراک ، شوش و کەنارەکانی دەریای خەزەردا و هیٚشتا پاشماوەکانیان لەئیٚراندا ماونەتەوە . ئەوانە زۆر دەوڵەمەند بوون ، سامانەکەیان کردبووە ئامرازی دەسەڵات بەسەر خەڵک و هیٚزە ناوچەییەکاندا و ئەوانەیان بەشیٚوەیەک بۆ بەرژەوەندی تایبەتی خوٚیان بەکار دەبرد . لەمبارەوە بەڵگەیٚ بەنرخ و فراوان بەدەستەوەیە کەهەبوون و کاریگەری یەهودییەکان بەسەر بارگایٚ پادشاهی و ئابووری وڵات و خەڵکی ڕوٚژهەڵاتی ناوڕاست و تەنانەت بابوٚلیش دەسەلمیٚنیٚت .**

ژمارەیٚ یەهودییەکانی دانیشتووی بابوٚل تەنیا ٤٩٨٩٧ یەهودیە کوٚچبەرەکانی بابوٚل نە بوون کەئەوشارەیان بەجیٚهیٚشت ، بەڵکو لەبابوٚلدا ژمارەیەک لە اسباطی یەهودا و ژمارەیەک اسباطی ١٠ لایەنەی دیلی ئاشوری کە لەباکووری وڵاتی کەلدە دەژیان ولەڕیزی کوٚچبەرەکاندا نەبوون . لەماوەیٚ ژیانی یەهودییەکان لەبابلدا ژمارەیەکی زوٚر لەوانە خەریکی کاروباری پیشەیی و بازرگانی وڵاتی کەلدە بوون ، تەنانەت یەهودییانیٚک هەبوون ک خاوەنی بانک و کاروباری گوٚڕینەوەیٚ پارەیان ئەنجام ئەدا . ئیٚرانی دیٚرینە لەڕوویەلی ٩٥٠ دە نووسی : پاش دەرکردنی فەرمانەکەی کورش ، هەموو ئەویەهودییانە کە لە بابوٚلدا ئامادە نەبوون ، بوٚئورشلیم بگەڕیٚنەوە ، چوونکە ژمارەیەکی زوٚر لەوانە لەکاتی دیلیەتیدا ، بووبون بەخاوەنی کارگەیٚ پیشەیی و نووسینگەیٚ بازرگانی و مانەوەیان لەبابوٚلدا باشتر لە گەڕانەوە بوئورشلیم دەزانی . بەڵگەیەک کەلە هەڵکوٚڵینەکانی بابوٚلدا دوٚزراوەتەوە ڕایدەگەیەنیٚ کە دوو کەس لە یەهودییە دیلەکان خاوەنی دووبانکی گرنگ بوون . کەبەبانکی اجی‌بی و کوٚڕەکان و بانکی کوٚڕانی

موراشو لەنیپور بەناوبانگ بوون. لەلایکی دیکەوە، پێش لەکورش و دووایٚ سەرهەڵدانی ناوبراو و تەنانەت لەسەردەمی پادشاهی مێدیاکان، کە ئاشور ڕێو بەلاوازبوون دەچوو، ژمارەیەک لەدیلەکانی بەنی ئیسرائیل و یەهودا بۆنێوخویٚ مێدیا و پارس کۆچبەربوون. کەوابوو ئەو کۆچبەرانە کەبۆلایەنی ئورشلیم گەڕانەوە، زۆرینەیان خاوەنی بیری ئایینی وهەژار و پێشوایانی هۆزبوون. (دکتر حبیب لوی، تاریخ یهود ایران ل ٢٢٤).

بەم جۆرە باکووڕ و باشوور و ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوایٚ ئێران، سەرزەوینی ئیلام، مێدیا، بابۆل و ئاشور، لانی کەمی لەژێر کاریگەری ئابووری یەهوودا بوون کە ئارەزوویان گەڕانەوە بۆئورشلیم و بیناکردنەوەیٚ ماڵی خوٚدا بوو. هەڵبژاردەکانی یەهود، کە هەموویان لەتەوراتدا، وەکو موسا لەگەڵ خوٚایٚ گەورەدا پەیوەندی و ووتووێژیان هەیە، لەبەرباوی ئەم ئارەزووە لە زۆربەیٚ لاپەڕەکانی تەوراتدا باسیان کردووە. ئەوٚ بەشە کە لەکتێبەکەیٚ ارمیادا نووسراوە دەتووانێت پەردەیەک لە نمایشتی نیفرەتێکی تەواو بێت کەئیسرائیلییەکان لەبابۆلییەکان هەیانبووە و دەتووانێت ئەو نەقشانە ڕوٚشن بکاتەوە کەیەهودییەکان بۆتۆڵەسەندنەوە لەبابۆلییەکان کێشاویانە. تەورات نووسینی کتێبەکەیٚ ارمیا بەکاتی سەرهەڵدانی کورشەوە گریٚ ئەدات و بەوٚبوٚنەوەیە کە ارمیا زۆرتر لە ناردراوەکانی دیکەی یەهود لەپلانە سەرەتاییەکانی پەلاماردان بۆسەر بابۆل دەوری هەبووە.

ووەها بەدڵنیاییەوە باس لەگەیشتنی ڕۆژی تۆڵەسەندنەوە و سزادانی بابۆل دەکات کەدەتووانین ناوبراو یەکی لەسازماندەر و ڕێکخەرەکانی رزگارکەری یەهودە بزانین. ووردبینی لەچەند نموونەیٚ کتێبەکەیٚ ارمیا لەتەوراتدا، بەجوانی نیشانی ئەدات کەیەهود لەو کاتەوە سەرقاڵی کۆکردنەوەیٚ هیز بووە تا هێرش بکاتەسەر بابۆل و لەبەرئەوە مێژوو بکەری ئەم هێرشە بەکورش دەزانیٚ، دوودڵی لەم بارەوەنامێنێت کە یەکەم جار کورش لەمێزوٚپوتامیا ودووایی لە ئێراندا سەری سەری هەڵداوە و ئەمە خوٚیٚ باشترین نیشانەیە کەهۆزەکەی ناوبراو، نەتەنیا پەیوەندی بەئێرانەوە نییە، بەڵکو لەبناغەدا لەگەڵ ڕۆژهەڵاتی ناوڕاستیشدا نەیار و بێگانەیە.

ئەمەیە ئەو قسانە کەخوداوەند دژی بابۆل و خەڵکەکەیٚ بەمن فەرمووی. بەگشت هۆزەکان ڕابگەیەنن و بێژن کەبابۆل کاول ئەبێت! بوٚتەکەی مەردوک و بوٚتەکانی دیکەسەروخوارو ڕیسوا دەبن! **چوونکە هۆزێک لە باکووروە هێرش دەکاتە سەر بابۆل** وکاولی دەکات، و ئیتر کەس لەو شوێنە نیشتەجیٚ نابێت بەڵکو، چ مروٚڤ و چ گیان لەبەران، لەو شوێنە هەڵدێن. ئەیٚ خەڵکی بابۆل، ئەیٚ تالانچییانی نەتەوەکەم، ئێوە شادن و

وەکو گاگەلی دابەستە لە لەوەڕگە سەوز و تازەکاندا دەلەوەڕن و وەکو ئەسپە نێرەکان دحیلکێنن و سەرمەستن! بەڵام بزانن کە شارە بەناو و دەنگە کەتان وەکو شارە پیرۆزەکەیٚ ئێمە سووک و بیٚنرخ ئەبێت. بابوڵ بۆ سەرزەوینێکی بیٚنرخ دەگۆڕدرێت، وەکو چۆڵاییەکی وشک وسووتێنەر، لەبەر تووڕەیی و قینی من، بابوڵ دەبێتە شارێکی بیٚدانیشتوو و بە تەواوی کاول ئەبیٚ وهەرکەس لەوێەوە دەرباز بێت سەرسووڕماو دەمێنیٚ. ئەیٚ هۆزانی دەور و بەر، بۆ شەڕ لەگەڵ بابۆڵدا ئامادە بن! ئێ تیرهاوێژەکان، هەموو تیرەکانتان بۆلایەنی ئەو بهاوێژن، چوونکە بەرانبەر بەمن تاوانی کردووە. لە هەر لایەکەوە هاواری شەڕ دژی ئەو بەرز کەنەوە. بڕوانن! خۆیٚ بە دەستەوە ئەدات! دیوارەکانی بابۆڵ دادەڕووخێت! ئەمە تۆڵەیٚ منە! تووشی ئەوکارەساتەیٚ بکەن کە تووشی خەڵکانی دیکەیٚ کرد. بەربە جووتیاران بگرن ، کاتیٚ ویستیان لەبابوڵ تووێەک بچێنن و دورونەیێک بکەن؛ هەموو غەریبەکانی بابوڵ بۆ وڵاتێکی دیکە هەڵبێن، لەبەر ئەوە شمشێری دوژمن مەجالیان پیٚنادات.

ئەی زەلامانی شەڕکەر، دژی سەرزەوینی "مراتاین" و خەڵکی "فقود" سەرهەلدەن! هەروەها ئەمرم کرد، هەموویان بکوژن و تەفروتووناێان بکەن. با هاواری شەڕ و ناڵەی مردن لەو سەرزەوینەوە بەرزبێتەوە! بابوڵ، وەکو چەکوشێکە کە هەموو جیهان دەڕووخێنیٚ. بەڵام لەحاڵێکدا کە ئەوٚ چەکوشە خۆیٚ وورد وخاش بووە. بابوڵ لە نێو نەتەوەکاندا تەنیا وگۆشەگیر ماوەتەوە! **ئەیٚ بابۆڵ، بیٚ ئەوە بزانی، کەوتیتە داوێک کە بۆم دانابووی، بۆ ئەوە لەگەڵ من بە نەیاری و دوژمەنی هەڵسوکەوتت کرد! من درگایٚ شوێنی چەک و جبەخانەکەیٚ خۆمم خستە سەرپشت و چەکی تووڕەیی و قینی خۆمم هێنایە دەرەوە! من کارم بە خەڵکی بابۆڵ هەیە! لە سەرزەوینە دوورە دەستەکانەوە بۆ شەڕی بابۆڵ بەڕیٚ کەون! گەنجینەکانی دەخڵ و دانەکەیٚ بەتاڵ بکەن! دیوارەکانی داڕووخێنن! ماڵەکەیٚ کاول بکەن! شتێک مەهێڵنەوە! سەربازەکانی بکوژن، هەموویان لە ژێر تێخەوە دەرباز بکەن. هاوار لە بەسەرهاتی بابۆلییەکان! کاتی تەفروتوونا کردنیان گەیشتووە!** بەڵام نەتەوەکەیٚ بەساغ و سڵامەت دەرباز ئەبن. ئەوان بۆ وڵاتەکەیان دەگەڕێنەوە تا ڕاێیگەیەنن کە من بە چ شێوەیەک تۆڵەیٚ لەوانە دەکەمەوە کە ماڵکەیان ڕووخاندم. کەمانداران و تیرهاوێژەکان کۆبکەنەوە تا دەربازی بابۆل بىن و شارەکە گەمارۆ بدەن، بە جۆرێک کە کەس توواناێ هەلهاتنی نەبیٚ. هەمان بەسەرهات کە بابوڵ نەتەوەکانی تووش کرد، تووشی دەکەم، چوونکە لەڕووی لووتبەرزیەوە بیٚڕوومەتی بەمن ، خۆداوەندی پیرۆزی ئیسرائیل کرد. کەوابوو گەنجەکانی لە کۆڵانەکان کەوتوون، دەمرن و هەموو زەلامە شەڕکەرەکانی دێنە کوشتن. ئەیٚ سەرزەوینی دەمارگرژ ، من دژی تۆم، چوونکە ڕۆژی تۆلەسەندن بەرێوەیە. ئەیٚ سەرزەوینی خوێنەزلزان، تۆ ترازاوی، دەداریتەوە و کەس نییە دەستت بگرێت و بەرزت بکاتەوە. من لە شارەکانی بابۆلدا ئاگرێک هەڵدەگیرسێنم کە بڵێسەکەیٚ هەمووشتەکانی دەور و بەری بسووتێنیٚ. خۆداوەندی توواناێ پایەبەرز دەفەرمێ : خەڵکی ئیسرائیل ستەم لێکراون.

ئەوانە کە ئەوخەڵکەیان بەدیل گرتووە بەوپەڕی چاودێرییەوە هەوڵ ئەدەن وبەر بە ئازاد بوونیان دەگرن ، بەڵام من کەڕزگارکەری ئەوانم ، پڕهێزترم و ئێوم خوداوەندی توانا پلە بەرزە و پشتیوانیان لێدەکەم ، هێمنی و ئازادی بۆئەوان دەگێرمەوە . بەڵام خەڵکی بابوڵ ، هیچ کاتێک دەرفەتی هێمنی بەخۆیانەوە نابینن ! شمشێری نەمان بەسەر دانیشتووانی بابوڵ وبەسەرگەورە پیاوان و زانایانیدا دەبارێت . مێشکی هەموو زانا درووینەکانی ، بەتاڵ دەبێ ! دڵەڕاوکی دەکەوێتە دەروونی زەلامە بوێروشەڕکەرەکانیان ! ئەسپ و ئەرابەکانیان لەشەڕدا دەدۆڕێنن وسەربازە بە کرێگیراوەکانی لەترسدا دەبوورێنەوە . خەزێنەکانیشی هەمووبەتاڵان دەچن ; تەنانەت سەرچاوەی ئاوەکانیشی دەفەوتن . لەبەرئەوە هەموو ئەو سەرزەوینە پڕە لەپەیکەری بوت کە دەیانپەرەستن . لەم ڕووەوە بابوڵ ، دەبێتە هێلانەی حوشترمر و چەقەڵ و گیان لەبەرانی توقێنەر . ئیترهیچ کاتێک مرۆڤی تێدا ناژیت و بۆهەمیشە بە کاولکراوی دەمێنێتەوە . بەهەمان شێوە کە شارەکانی سدوم وعمورە و گوندەکانی دەوروبەری ئەوانەم کاولکرد ، بابۆلیش کاول دەکەم و ئیتر کەس لەوێ ژیان ناکات . (عهد عتیق ، ارمیا ٤٠ـ٢١ ، ١٦ـ١١ ، ٣ـ١ : ٥٠ )

پاش تێکشکانی ئورشلیم وپەرژ وبڵاوی یەهود لەڕۆژهەڵات ، هیچ کاتێک گەورە پیاوان و زانایانی یەهود بەبێ کار نەمانەوە . ئەوانە لەپاڵ سوودبردن لەو وڵاتانە کە تێدایا نیشتەجێ بووبوون ، هەمیشە لەئارەزووی گەڕانەوە وچاوەڕاوانی دەرفەتێکی مێژوویی بۆ قەرەبوکردنەوەی شکستەکانیان بوون .

خوداوەندی توانا و پلەبەرز ، خودای ئیسرائیل ، بەهەمووی ئێوە کە بەخواستی ئەو لەئورشلیمەوە بۆ بابوڵ دوورخرانەوە ، دەفەرمێ : ماڵی زۆر دورست بکەن و لەوانەدا بژین ، درختی زۆر بچێنن و لەمێوەکانی بخۆن . لەبەر ئەوە ساڵانێکی زۆر لەوشوێنە دەمێننەوە . بژەوجن و ببن بەخاوەنی منداڵ ، با منداڵەکانیشتان بژەوجن و ببن بەخاوەنی منداڵ ، تا لەوشوێنە ژمارەتان بەرز ببێتەوە . ئارەزوی ئاسایش و پێشبەچوون بۆبابوڵ بکەن وبۆ ئەم مەبەستە لەمن بپاڕێنەوە ، لەبەرئەوە هێمنی ئەوێ هێمنی ئێوەیە .(عهد عتیق ، ارمیا ، ٧ـ٤ : ٢٩ )

شارستانیەتی کۆنی مێزوپۆتامیا ، بەخوداوەندە پڕهێزەکان و پەرەستنگەزەبەلاحەکانیەوە ، کە باوڕمەندی لەدەروونی مرۆڤدا نیشتەجێ ڕادەگرت ، بەرگرێک لەسەر ڕێگای وەقرە و یەکیتی اسباطدا دەژمێردرا و تاکاتێک کەلەمێزوپۆتامیادا نەتەوە و ئیمپراتورییەکان بەوڕادەیە بەهێز بووایەن ، نەتەوەی بەنی ئیسرائیل هیوای گەڕانەوەی بۆئورشلیم ، دورستکردنەوەی ماڵی خودا و متمانە کردن بە ڕاگرتنی ئەو پاشەکەوتانە کەلەڕێگای بازرگانی و کشتوکاڵ وبەتاییەت ڕباخواردنەوە بەدەست دەهات ، نەبوو . ئەوانە لەسەردەمی تاڕادەیەک دوور و درێژ و پەرژوبڵاوی دیلیەتی لەبابوڵدا ، بەڵێنەکانی "اشعیا" یان بەبیر دەهینا و دەستەبەربوونی ئەوانەیان چاوەڕوان دەکرد .

خوداوەندی توانا و پلەبەرز دەفەرمێ : من خۆم دژی بابول هەڵدەستم و تەفر وتوونای دەکەم . بەرەی بابۆلییەکان

مرەگوریشە دەردەهێنم تا ئیتر کەس لەوانە بەزیندوویی نەمێنێتەوە. بابوڵ بۆ گەنکاوێک دەگۆڕم تا کۆنەبوو لەناویدا هێلانە بکات. بە گسکی مەرگ، گسکی ئەدەم تا هەموو بوونەوەرەکانی بمرێنم. خوداوەندی توانا پلە بەرز سوێندی خواردووە، و ئەیژێ ئەوەێ کە بریارم داوە و لێ دڵنیابووم بەڕاستی ڕوو ئەدات. (عهد عتیق، شعیا۲٤، ـ ۲ : ۱٤).

پیاوانی هەڵبژاردە و ئەوانە کە بیریان لە داهاتووی نەتەوەێ یەهود لەئێران و ئاشور و بابوڵ دەکردەوە، بێگومان هێڵێکی پەیەوەندی بەربڵاویان لەگەڵ یەکتردا هەبوو، دەبووا ئاڵوگۆڕە چەکدارانە و سیاسی و ئابووریی ناوچەکانی ڕۆژئاوا و باشوور و مێزوپوتامیایان بەووردی لەژێر چادێریدا بگرتایە، تا گەیشتن بەبەڵێنەکانی زانایانی یەهودیان ببینیایە کە زۆرجار لەتەوراتدا ئاماژەێ پێکراوە.

کاتێ کە بیستم خوداوەند دەیفەرموو : چ کەسێ بەناردنی ڕاسپاردەکانم بۆ ئەم هۆزە بەرێ بکەم؟ ووتم : خوداوەندا، من ئامادەم بۆ ڕوویشتن، من بنێرە. فەرمووی : برو ئەم پەیغامە بە هۆزەکەم ڕابگەیەنە، هەرچی زۆرتر ببیسن، کەمتر فام دەکەن و هەرچی زۆرتر ببینن کەمتر تێدەگەن. پاشان فەرمووی : دڵی ئەم قەومە رەق بکە گویچکەکانی قورس و چاوەکانی بنوقێنە بن بەچەشنێک کە نەبینن، نەبیسن و لە چشتێ تێنەگەیەن و بۆلاێ من بگەرێنەوە و چاک ببنەوە. ووتم خوداوەندا تا چ کاتێک ئەم دۆخە درێژەێ هەیە ؟ وڵامی دامەوە : تا ئەو کاتەێ کە شارەکەیان بروخێ و کەسی تێدا نەمێنی و هەموو وڵاتەکەیان کاول بێ، و بۆ شوێنە دوور کەوتووەکان بەرێیان بکەم و سەرزەوییەکەیان لەدانیشتوان بێبەری بێ. هەرچەن ئەو کاتە هێشتا لەهەر دە کەس، یەک کەس لەقەومەکەم لەوێ دەمێننەوە، بەڵام ئەوانەش دەفەوتن .لەگەڵ ئەوەشدا نەتەوەێ ئیسرائیل لەتیرەێ بەڕوو و سپیی‌دارن کە کاتێ ببرینەوە کۆتەرەکەیان لەزەوییی دەمێنێتەوە و دیسان سەر هەڵ‌ئەدەن. (عهد عتیق، اشعیا۱۳، ـ ۸ : ٦ )

ئەم دیمانە تۆقێنەرە لەتوورەیی خوداوەند، کە بەمانەوەێ هۆزی یەهود ڕازاوەتەوە، هێشتا لەگەڵ وێنەگەلێکدا دەخرێنە بەردەس کە مزگێنی دەورانێکی دیکە لە مەزنایەتی سەردەمی داود ڕادەگەیەنێت. تەورات واتایەکی دیکە بەدەستەوە نادات، مەگەر خاڵێکی دڵنیایی خوداوەند بە هۆزێک کە لەسەرەتاێ مێژووی خۆیەوە تووشی کاری هەڵە بووە و لە مەرجی دڵنیایی و نائومێدیدا

(ئەێ ئیسرائیل) هەرچەن بچووک و لاوازی، بەڵام خەمت نەبێ، چوونکە من یارمەتیت ئەدەم.

من خواوەندی پیرۆزی ئیسرائیلم، خوداوەندی ڕزگاربەخشی تو. تو وەکو چانێکی خەرمان کۆتاندنی کە ددانەکانت

تیژه و هەموو نەیارانت تێکدەشکێنێت و وورد وخاشیان دەکات و دەیانکەیت بە کا و لە هەوادا بڵاوەیان پێدەکەیت و دەیاندەی بەدەم گێژەڵوکەوە . ئەو کاتە من خوداوەندی پیرۆزی ئیسرائیل ، ئەبم بەهۆی شادمانی تۆ ، و تۆ بەم بۆنە وە خۆت بە سەربەرز دەزانیێ . (١) (عهد عتیق ، اشعیا ، ١٤ _ ١٦ : ٤١)

یەهودییەکان لە دژوارترین ڕۆژەکانی مێژووی خۆیاندا بە هێزی دووبارەکردنەوەیٚ بەڵێنەکانی تەورات و هەروەها چەکی بەهێز و بڕندەی دارایی و سامانەکەیان پشت ئەستوور بوون و ژیاون . و بەو هۆوە کە لە کاتی دەسەڵاتداریەتی داوود ، و ئیستاش کە سەهیونیزم بەڕێوەبەری نەتەوەی یەهودە ، ئەم قەومە هێزی چەکداریان نە بووە ، هەمیشە وەکو ئەمرو لەڕێگای دەسەڵاتی ئابوورییەوە ، هۆز و نەتەوەکانی دیکەیٚ قەرزدار و ناچاری کردون داخوازەکانی بەجێیە بهێنن .

درختی بنەماڵەیٚ داوود براو ؛ بەڵام ڕۆژێک لەڕۆژان کۆتەرەکەیٚ وەچ دەردەکات ! ئەریٚ ، لەڕەگەوە لقی تازە سەرهەڵدێنیٚ . ڕۆحی خوداوەند دەچێتە دەروونی ئەو لقە ، واتا ڕۆحی زانین و لێهاتوویی و دانووستاندن و هێز و ڕۆحی ناسین و دڵەڕاوکی لەخودا . هەموو حەزەکانی ئەو لە بەجیٚهێنانی فەرمانەکانی خوداوەنددا خۆیٚ دەبینێتەوە . خوداوەند لەسەربناغەیٚ ئەو شتانە کە بینیویە یان بیستوویە ، داوەری ناکات ؛ بەڵکو لە مافی هەژاران و چەوساوەکان پارێزگاری دەکات . ئەوٚ بە یەکسانی و ڕاستی حکوومەت دەکات . ئەو کاتە کە بەرخ و گورگ لەپاڵ یەکدا دەژین ، پڵنگ و کارژەلە پێکەوە دەنوون . گویلک لەتەک شێردا پیاسە دەکات و منداڵێک بۆ هەر شوێنێک بیەویٚ ، ئەوانە لیٚدەخوڕێت . گا لە پاڵ وورچدا دەلەوەڕێت ، پارکوڵەکەیٚ لە تەنشت گوێلک دەنویٚ و شێر وەکو گا ئاڵف دەخوات . منداڵی ساوا و شیرخوەر لەنێو ماراندا بەبیٚ مەترسی یاری دەکەن ! ومنداڵێک کە لە شیر گیراوەتەوە دەستی دەباتە نێو کونی کوڵەکویرە ، بەبیٚ ئەوەیٚ تووشی مەترسی ببێت . هیچ خراپە وئازارێک لە چیای پیرۆزی خوداوەنددا نامێنیٚ ، چوونکە هەر بەوٚجۆرە کە دەریا لە ئاو لێوانلێو ئەبێت ، ناسینی خودایٚ گەورەش هەموو جیهان دادەپۆشی . لەوٚ ڕۆژەدا ئەوٚ پادشاه تازەسەرهەڵداوەیٚ بنەماڵەی داوود بوٚ گشت گەلانی جیهان ئەبێتە ئاڵای ڕزگاری و خەڵک ڕووی تیٚدەکەن و سەرزەوینەکەیٚ لە وریشە و شەوکەت پڕ دەبێت . لەوکاتەدا خوداوەند دەستی بوٚهۆزەکەیٚ خۆیٚ درێژ دەکاتەوە و ئەوانە لە ئاشور و سودان و ئیلام و حەبەشە و بابوڵ و حەمات و گشت دوورگە و لەنگەرخانە دوورە دەستەکاندا بوٚ ئیسرائیل دەگیرێتەوە . ئەوٚ ئاڵایەک لەنێوان گەلاندا هەڵدەکات و خەڵکی ئیسرائیل و یەهود کە پەرژو بڵاو بوونەتەوە ، لە گوٚشە و کە ناری جیهاندا کوٚدەکاتەوە .

ەوانەیە کارە پڕ لە هەڵە و بیٚکۆتاییەکانی یەهوود ، لەم خاڵە دڵنیا بەخشەی تەوراتەوە سەرچاوەیٚ گرتبێت ، ئەوانە لەوٚ باوڕەدان کە هیچ کاتیٚ (یەهوە) بەجیٚیان ناهێڵێت و هەروەها کە خوداوەند بەڵینی پیٚداون ، نەیارانیان وەکو پەڕە کایەک لە ددانە تیژەکانی چانە خەرمان کوٚتەکەیدا دەکاتە توٚز . کەوابوو ، دەتووانن هەرجوٚرە شەڕێک هەڵخرێنن ، تەنانەت ئەگەر شیاوی قەد و قەبارە و بناغەیٚ باوڕەکانیان نەبێت ، وەکو شەڕیی هەنووکەیی ئەوانە ، دژی جیهانی ئیسلام .

(عهد عتیق، اشعیا ۱۲ ـ ۱ : ۱۱)

وەهابوو کە مزگێنییە پەیتاپەیتاکانی تەورات کە بۆ ڕزگاری نەتەوەی هەڵبژاردە ڕادەگەیندرا و چاو و گوێچکەی زانایانی یەهودیی بۆ دوزینەوەی رزگارکەرەکەیان کراوە دەهێشتەوە. ئەوانە پاشەکەوتەکانیان زێدەتر دەکرد تا لەکاتی خوێدا بەخەرج‌کردنیان تۆڵەی یەهود لەبابۆل و مێزوپۆتامیا بستێنن و دیسان ڕێگای ئورشلیم بۆخۆیان بکەنەوە و لەهەمان حاڵدا زانایان و بزیوانی هۆزەکەیان لەژێر نێوی شیکردنەوەی خەون و پزیشک و سیحێر زاندا بۆناوەندی دەسەڵات و بارەگای دەوڵەتانی هەرێمەکە بەڕێ بکەن، تاکاتی خۆی کاریگەریی لەسەر ڕووداوەکان دابنێن.

ڕۆژی بیست‌و پێنجەم لەمانگی دووانزەهەمی ساڵی سی‌وحەفتەمی بەدیل‌گرتنی یەهویاکین پادشاهی یەهودا، اویل کەردوک بوو بەپادشاهی بابۆل و یەهویاکین لەبەندی‌خانە ئازاد کرد. ئەو پادشایە ڕووبەڕوو بوونەوەیەکی شیاوی لەگەڵ ناوبراودا هەبوو و ڕێزێکی جیاوازی لەنێوپادشا بەدیلگیراوەکانی بابۆلدا بۆلەپێش چاوگرت. جل‌و بەرگی نوێ پێ‌بەخشی و لەوەبەدووا هەمیشە لەگەڵ خوێ خواردنی دەخوارد. اویل مەردوک تا ئەو ڕۆژە کە یەهو یاکین دەژیا، بۆ پێداویستییە ڕۆژانەکانی دەرماڵەی پێشکەش دەکرد. (عهد عتیق، جامعه، ۳۱ ـ ۳٤ :۵۲).

لەوانەیە کورش لەم کاتە و لەسووچێکی ئەم‌جیهانەدا سەری هەڵدابێت کەهێشتا بەبوێری و شەڕاشویی و خوێن‌ڕشتن ناوبانگی دەر نەکردبوو. پێشتر خوێندمان کە هۆزی پەرژوبڵاو بەڵام پڕبەهێزی ناوبراو سەرزەوین و پەیوەندییەکی لەئێراندا نەبووە و پێش لەوە ووتمان کە ئەوانە بەرلە بەدەس‌هێنانی ئیمپراتوری، پەتانسیەل و توانایی مادی، زانستی و مێژوییان نەبووە و ووتم کە مێژوو پێش لەداگیرکردنی بابۆل لەلایەن کورشەوە، هیچ نێوێکی ئەوانەی لەبیر نی‌یە.

سەرهەڵدانی سەردارێکی مەزن وەکو کورش لەنێو هۆزێکی بێ‌ناونیشان، کە هیچ پەیوەندێکی فەرهەنگی و پێشینەی مێژوویی و هەستیاریی ئایینی لەگەڵ شارستانیەتی کۆنی ئێران و مێزوپۆتامیادا نی‌یە، بۆ گەورەپیاوانی یەهود، هەلێکی شیاوی لەپێناوی ئازادیدا ڕەخساند.

بەدڵنیاییەوە سەرنجی یەهوود لەسەرکورش، بۆکردنەوەی ڕێگای گەڕانەوە بۆئورشلیم و پاک کردنەوەی هەرێمەکە لەشارستانیەتە کۆنەکان، بەبۆنە و پێداویستی ململانێ درێژخایەن و خوێن‌ڕشتنی فراوان و بێ‌بەزەیی تایبەتەوە، نیشانەی لەناوبانگی کورش لەلایەنی شەڕاشویی و

دڵرەقیەوە بووە . لەبەر ئەوە هۆزەکەیٚ کورش وەکو نەتەوە دێرینەکانی دیکەیٚ ئێرانی جیٚگریی جوغرافیایی نەبووە تالە دایکی نیشتمان بەشی ژیانی خێڵەکەیان بستێنن . و بۆئەو هۆزە هەرێمێک ناناسین کە بەکاری کشتوکاڵ و نەچیروانی و ڕاگرتنی ئاژەڵ، ئابووری کومەڵگاکە یان بەڕێوە بردبێت . کەوابوو، وەهاخێڵێک تەنیا توانیویانە بەهێزی شەڕاشویی و تاڵان و بەکرێگیراوی چەکدارانە، هەبوونی خۆیان بەڕێوە بەرن و مێژوو ئیلا ئاژاوەگیریی نەبیٚ یادگارێکی دیکەی لەوانە لەبیر نەماوە، وەهایە کە سەرکردەکانی یەهود چارەسەری ئازادی قەومەکەیان لەهێزی وەشاندنی شمشێر، ووردبینی و سەرنج لەتووڕدانی ڕم وکەڵکوەرگرتن لەکەوان و خوێنخۆەری خێڵی کورشدا بینیوەتەوە نەوەک لەدیمەنی پەیغەمبەر ئاسایٚ خۆیاندا . ناتووانین ئازادی یەهوود هەر بەوجۆرە کە تەورات و مێژوونووسانی یەهود ئەیژن بەباس و ڕاسپاردەیەکی لەپێشدا دانراوی خوآوەندیی بزانین کەلەدەروون و خوڵق و سۆرشتی کورشدا هەبووە . چوونکە تەنانەت ئەگەر کورش بەخاوەنی وەها تایبەتمەنییەک سەبارەت بەخەێرخوازی یەهود بزانین، کاردانەوەی ئەو تایبەتمەنییانە لەدەسپێکدا پێویستی بە وەها پێشکەوتنێکی چەکدارانە هەبووە کە لە ماوەیەکی کورتدا هەموو شارستانیەتە کۆنەکانی مێزوپۆتامیا گسک بدات، ئێرانی دێرینە ملکەچ بکات و ئیلام و مێدیا و لیدیا هەڵپێچێت و ئەوکاتە ئەم ئازموونە لەخوێنخۆەری و پەلامارەدا، بەبیانووێەکی نادیارەوە و جیاوازەوە بەنێوی مرۆڤایەتی و ئینسان دۆستی پێشکەشی نەتەوەی یەهود بکات! بەم جۆرە سۆرشتییە کە کورش وەکو چەکدارێکی بیٚبەزەیی، نەڕزگارکەرێکی خاوەن هەست، سەرنجی یەهودی بۆلای خۆەی ڕاکێشابێت .

لەڕوانگەیٚ گەورە پیاوانی یەهودەوە، بۆ پێچانەوەی شارستانیەتەکانی ئێران و مێزوپوتامیا کەسایەتی کورش شیاو و ئیدەئال خۆیٚ نیشان ئەدا . ئەوەندە بەس بوو کە ناوبراو لەلایەن بیر و مادیاتەوە یارمەتی بدرێت تا ناوبراو بورێکوپێککەر و بەڕێوەبەرێکی مەزن لەبوواری کاولکردنی دەسکەوتە مێژوویەکانی شارستانیەتی ئێرانی کۆن و مێزوپۆتامیای زانا بگۆردرێت . لەڕوانگەی یەهودەوە بەتایبەت نەبوونی بەرپرسایەتی و پەیوەندی کورش بەپێشینەیەکی فەرهەنگی کۆن و بیروباوڕی ئایینی و هەستیاری هەرێمی، بەرچاوترین تایبەتمەندی ناوبراو بوو . کورش زەردەشت

و بعل و یەهوەیٚ ناس نەدەکرد کە پلەی بەرزی و نزمی ئەوانە بزانێت، ئایینێکی هەڵنەبژاردبوو کە ژیان یان فەوتانی خوداێان لەسەر بریارەکانی کاریگەری دانابیٚ. (١)

ئەگەر وەها کەسایەتییەک لەتوانایی و زانایی و دمارگرژی، پرئەزموونی، چاوەڕوانی داهاتوو، تۆڵەسێن و دەوڵەمەندی یەهود سوودی دەبرد، هەم خێڵەکەیٚ بەنان و نەوایەکی چاوەڕوان نەکراو دەگەیاند و هەم ڕێگای یەهودی ئاتورشلیم دەکردەوە و بەهەڵسپاردنی شارستانیەتەکانی ئێران و ئاشور سومەر و بابوٚل و میسر، نەتەوەیٚ یەهودی بۆ چەندین سەدە لە دڵەڕاوکی دەراوسێەکانی دەپاراست. کەوابوو ئیمپراتوری هخامەنشییەکان لەهیچ لەدایک نە بوو، یەهود بەبیر وسامانی زۆر پاڵپشتی کورش بووو. کورش دیلەکانی یەهودی و سامانەکەیانی لەبابوٚلدا ئازاد کرد و ڕێگای گەڕانەوەیٚ ئەوانەیٚ بۆ ئورشلیم کردەوە.

کاتیٚ بختالنصر کۆتایی بەسەربەخۆیی یەهود هێنا و ئەوانەیٚ کەکو دیل بۆبابوٚل گواستیەوە. **لە نێوان دیلەکاندا کەسایەتی زانا و خاوەن پێنووس و سیاسەتوان و شارەزا و باوڕمەند بە ئایینی موسا فراوان بوون. بەم بۆنەوە توانیان سەرنجی کورشی مەزن، شاهەنشاهی ئێران و پادشاە مەزنەکانی دیکەی هخامەنش بۆلایەنی خۆیان ڕاکێشن و ئەوانە تیٚبگەیەنن کە گەڕانەوەیٚ سەربەخۆیی یەهود بەقازانجی کیشوەری ئێرانە.** و لەئاکامدا پاش ٤٨ ساڵ پەرژو بڵاوی ژمارەیەک لەوانە بۆ وڵاتەکەیان گەڕانەوە. (دکتر حبیب لویی، تاریخ یهود ایران، ل ١٦)

مەبەستی ئاغای لوی لە "کورشی مەزن پادشاهی ئێران" بە تەواوی لەیەک نادرێتەوە. چوونکە مێژوو کورشی بە شاهی ئێران نەناسیووە و تەنانەت خۆدی کورشیش لەگڵە نووسراوەکەیدا وەها بانگەشەیەکی نەکردووە. لەگڵە نووسراوەکەیٚ کورشدا لەبابوٚل، کە تەنیا بەڵگەیٚ سەلماندنی هە بوونی ناوبراو لەمێژوودایە، کورش خۆی بەپادشاە بابول و پادشاە سومەر و ئەکەد، واتا داگیرکەری مێزوپوٚتامیا دەزانێت و داواکاری خاوەندییە تی هیچ گۆشەیەک لەئێرانی نییە. ئەو تەنیا لەناساندنی ڕەچەڵەک نامەکەیدا، باب و باپیر و باپیرەگەورەیٚ بەئانشانی دەناسێنێت کە١

ـجگە لەهێرشی هخامەنشییەکان کە بەکرێگیراویی و بەئامانجی تاڵان و داگیرکەری ئەنجام دەبوو، شێوەکارێکی دیکە لەڕۆژهەڵاتی ناوڕاستدا تاپۆ کراوە کە هەمیشە بەبۆنەیٚ جیٚگیربوونی خوٚاوەندێک لە سەر شوێنی خوداوەندێکی دیکە، کێشەی فەرهەنگی لیٚبووەتەوە.

پێشتر ڕۆشن بووەوە کە ئەمەش بیانوویێک بۆ شاردنەوەی نەیارییەکەی لەگەڵ ڕۆژهەڵاتی ناوڕاستدا بووە.

بابۆل کاول دەبێ! سەری پەیکەرەکەی مەردوک و پەیکەرەکانی دیکەی بابۆل شۆڕ ئەبنەوە و ڕیسوا دەبن! **چوونکە هۆزێک لە باکوورەوە پەلاماری بابۆل ئەدات** و کاولی دەکات و ئیتر کەسی تیدا نیشتەجێ نابێت، و هەمو مرۆڤ و گیانلەبەرانی لەوشوێنە هەڵدێن.. بەڵام ئیستا ئەی هۆزەکەم، بابۆل بەجێبهێڵن! لەوشوێنە وەدرکەون تا کەسانی دیکەش بەدوای ئێوەدا ڕێبکەون. چوونکە **من لەشکەرێکی مەزن لە هۆزە پڕهەیبەتەکانی باکوور هەڵدەخرێنم تاپەلاماری بابۆل بدەن و تەفروتووناێ بکەن**. تیری کەوانەکانی ئەوهۆزانە بەگشتی ئامانجەکەیان دەپێکن و هیچکاتێک بەهەڵە ناچن! بابۆل تاڵان دەکەن و شتی فراوان بەدەس دەخەن **لەسەرزەوینە دوورە دەستەکانەوە** بۆ شەڕی دژی بابۆل بەرێ‌کەون! گەنجینەکانی خەلە و دانەوێڵە بەتاڵ بکەن؛ دیوارەکانی داروخێنن، خانووەکانیان کاول بکەن؛ هەموشوێنێک خاپووربکەن؛ هەموو نەیاران لەدەمی شمشێرەوە دەربازبکەن. هاوار لەحاڵ و وەزعی بابۆلییەکان! کاتی سرینەوەیان گەیشتووە... **بروانن ئەو سوپا گەورەیە کە لە لایەنی باکوورەوە دێت! پادشایان پڕژمار لەوڵاتانی جۆر بەجۆر بۆ شەڕ ئامادە دەبن**. ئەوانە چەکەکانیان هەڵگرتووە و ئامادەێ کوشتارن. **دڵی ئەوانە بەردینە و بەزەییان بەکەسدا نایەتەوە!** هاواریان وەکو شریخەێ شەپۆلی دەریا وایە. ئەی بابۆل ئەوان لەسەرپشتی ئەسپ، بەغار بۆ شەڕی تۆ دێن. (عهد عتیق، ارمیا، ٤٢ _ ٤١، ١٠ _ ٩، ٣_١: ٥٠)

ئەم دیمەنانە لەگەڵ ئەوانەێ کەلەمێژوودا قۆماوە بەتەواوی هاودەقن، تەورات راشکاوانە و پەیتا پەیتا دەنووسێ کە یەهوود لەدەور و بەری کاتی سەرهەڵدانی کورشدا هۆزێکی لەباکوورەوە هەڵخراند و یا لەڕاستیدا بەکرێی گرت تا بابۆلی پێ کاول بکات و لەبەر ئەوە کە دۆزراوەکانی مێژوو ئێمە لەتەک نێو و هەبوون و ناسنامەێ کورش لەبابۆلدا ئاشنا دەکات، و پێشتر هیچ شوێنەوارێکمان لە ئەو نەبینیوە و جگە لەکورش کاولکەرێکی دیکە بۆبابۆل ناناسین، دەتوانین ئەوەێ کە ئیستا لەدەستی مێژوو و دەسەڵاتی مێژوونووسدایە، بیکەین بەنیشانە کە یەهود ئەم هۆزە زۆردار و دڵبەردینەێ باکووری لەسەر پشتی ئەسپ سوارکرد و ڕاستەخۆ بەنەرمەغار لەئیستێپەکانی ناوڕاستی ڕوسیاوە دەربازبوو و گەیشتە ڕۆژهەڵاتی ناوڕاست و پاککردنەوەی بابۆل و ئازادکردنی سامان ودیلەکانی ئیسرائیلی دەس پێکرد. ئەم بۆچوونە زۆر بەنرختر لە مێژوو

خۆلقاندن و ڕەگەزنامەنووسینی سەختەکارانە بۆهخامەنشییەکانە، چوونکە گلە نووسراوەکەیٚ کورش بەپێچەوانەی بەردە نووسراوەکەیٚ داریوش، پێرستی نەتەوە تێکشکاو و بندەستەکانی ئێرانی تێدا نی‌یە. لەسەرکەوتن‌نامەکەیٚ کورشدا ئاماژە بە مێدیا و پارس و ئیلام و لیدی نەکراوە و لەبەر ئەوە کەزانیاریمان دەربارەی سەرکەوتنەکانی کورش، بەزانیارییە پڕ لە ئەفسانەکانی هێرودیتەوە بەسراوە لەو باوڕەداین کە ئێران و لێدی پاش داگیرکردنی مێزوپۆتامیا خۆیان بەدەستەوە داوە و مل‌کەجی کورش بوون. و یەکەمین ئەرکی کورش تێکشکاندنی بابۆل بووە کە لەلایەن یەهودەوە بۆیٚ دابین‌کراوە. چوونکە داگیرکردنی مێدیا و ئیلام و لیدی و بەگشتی ئێران، ڕووداوێکی بچووک نی‌یە کە لە بەگلەنامەکانی میزوپۆتامیای هەستیار و وریادا ڕەنگی نەدابێتەوە(١). بەم جۆرە داگیرکردنی بابۆل بەدەستی کورش لەکاتی پادشاهی ئێران و وەکو ئیمپراتورییەک ڕووی نەداوە، بەڵکو بەدەستی سەرکردەیەکی ناوچەیی و هۆزێکی نەناسراو و یارمەتی لوجیستیکی و شەوکاری یەهود بەئەنجام گەیشتوو. پاش داگیرکردنی مێزوپۆتامیا و بەدەس‌خستنی دەسەڵاتی ئیمپراتورە دیرینە و دەوڵەمەندەکەی کەنارەکانی دیجلە و فورات، ئەم سەکردە پەلاماری ئێران و مێزوپۆتامیای دا کە ٢٠٠٠ ساڵ پێش لەئەوٚ لەوپەڕی ئاشتی و هێمنی‌دا بەگەشەکردنێکی سۆرشتی و هاودەق لەگەڵ دۆخی ناوچەکەیاندا ژیانیان دەکرد. ئەگەر سەردەمی فەوتانی سەرزەوینی سوتاو لەسیستاندا، فەوتانی شارستانیەتی ڕووناکی باشووری دەریای کاسپین، بەتایبەت مارلیک، شارستانییەتی بریقەداری ئەلبۆرزی ناوڕاست و سیەلک و مێدیا و ئیلام و ئورارتو، بەگشتی بۆ ٢٥٠٠ساڵ پێشتر و هاوکات لەگەڵ تێکشکانی مێزوپۆتامیادا دەگەڕێتەوە(١). واتەیەکی بۆدابین ناکریٚ، مەگەر وابزانین کە دارایی وسامان و زانستی یەهود ڕادەستی هۆزێکی نەیاری هێرشبەرکرابێت، تا ئێران و مێزوپۆتامیای دێرین و لووت‌بەرز، بکات بەکۆلونی خێلێکی بی‌ناونیشان و خوێن‌ڕێژ. ڕێگایٚ ئورشلیم بۆیەهود

١ ـ زانستی دیمەن ناسین، ڕواڵەتی پادشاکانی هخامەنشی وەکو ئێرانی وتایبەتمەندی دانیشتووانی باشووری ئیران نیشان نادات. هەڵسەنگاندنی قەبارەیٚ لووت و تۆێڵ و کەلەسەر و خاوبوونی پرچ وقژی ئەوانە، لەوحاڵەتانەدا کە فر نەکراون، پەیوەندی ئەوانە بەنەژادی ئیسلاڤ دەسەلمێنێت. کارکردن لەسەر دیمەن ناسی و هەڵسەنگاندنی ئەوانە، بۆنموونە لەگەڵ دیمەنی ساسانییەکاندا، دەتوانێت ئاکامێکی پڕسەرنجی بەدوواوە بێت. ئایا نەبوونی دیمەنی ڕووبەڕوو لەبەرد تاشیاوەکانی هخامەنشیدا ناتوانی نیشانەی هۆکاری شاردنەوەیٚ ئەم نەیاریە نەژادیە بێت؟ .

بکرێتەوە، بەندی وسامانەکەیان ئازاد و بەسرینەوەیٚ شارستانیەتی مێزوپوتامیا و ئێران، مەرجی حەوانەوە و ئاسایشی مێژوویی بۆ یەهود ئامادە ببێت. بێگومان هەروەها کە مێژوو شایەتی ئەدات، کورش بەدەس خستنی ئاسان و توندی دەسەلات، بەسەر هەموو خەلک و نەتەوە و هۆزەکاندا، تەنیا بەپشتیوانی ڕواڵەتیی یەهود و کێشە خولقاندنی دەروونی لەپەیوەندییەکانی نێوان دانیشتواندا مەیسوور بووە کە یەهود تا دڵی ڕامیاری وئابووری ئەوانەش تەشەنەیٚ کردبوو.

دەربارەیٚ داگیرکەرییەکەی بابۆل نووسراوەیٚ زۆر بەدەستەوەیە: هەندێ لە وانە لەسەرچاوە یونانییەکان و تەورات و چەن نموونە لە هەڵکوڵاندنەکانی بابۆلدا ئامازەیٚ بۆکراوە. پێش لەوەیٚ کە پەنجە بۆ ئەوانە ڕابکێشم ئەوپرسە دەخەمە بەرباس کە هەرچەن کۆمەڵێ جیاوازیی لەنێوان ئەوانەدا هەیە و لە خوارەوە ئیشارەیٚ پێدەکەم، بەلام لەیەک شتدا هاوبەشن. واتا هەموو ئەوسەرچاوانە لەوباوەڕەدان کە شاری سووتاوٚ خاونی کەرەسە و ماتریاڵی پێویست، هێڵی خۆپاراستنی فراوان، لەمپەر و بەرگری قایم و کێڵگە و زەویزارەکانی دەوروبەری بابۆل بەڕادەیەک پربەرهەم و بەپیت بوون کە توانیویانە ماوەیەکی زۆربەر بەداگیرکەران بگرن ولەکاتی هێرشی نەیاراندا شارەکەیان بپارێزن. بەڵام سەرەڕایٚ ئەوانە شارەکە تێکشکاوە. گومان لەوەدا نی یە کە، خەڵکانی تازە نەفەسی ئاریانی لەکاتی خۆیدا ئەوهێلە داکوکیانەیان بەزاندووە و گەیشتوونەتە بابۆل، بەڵام بەوڕادەیە زوو و بەپەلە کە لە مێژوودا دەبینرێت. و دووایی کاتێک کە دەگەیشتنە بابۆل، لەبەر ئەوە کە گەنجینەکانی بابول لەخواردن و ئازووقە پربوو لەناو شارەکەشدا کێڵگەی لەبار بۆ چاندن هەبوو بابۆلییەکان دەیانتوانی ماوەیەکی زۆر پێش بەلەشکەری گەمارۆچی بگرن، تا یارمەتییان بۆبگەیەت. هۆکاری تێکشکانی بابۆل هۆکاری تێکشکانی بەم جۆرە توند و بەپەلە ناتوانێت پەیوەندی بەشتێکەوە هەبێت، مەگەر دووبەرەکی نۆخویی بابوول و حاڵ و وەزعی دەروونی بابۆلییەکان. ئەم خاڵە ئاکامی سۆرشتی دۆخێکە کە لەسەرترەوە ووتم و لەخوارتریشەوە ڕوٚشتری دەکەمەوە. (حسن پیرنیا. ایران باستان، ل ٣٨٣ و ٣٨٤).

## ئایا چ کەسانێک دەیانتووانی دووبەرەکی دەروونی بخەنە نێوان دانیشتووانی بابۆل تا گوی بەپاراستن

١ـ مێژوونووسانی ڕۆژهەڵاتی ناوڕاست، کە زۆرینەیٚ ئەوانە یەهودی بوون، باس لە ڕووخانی پێشوەختی شارستانییەتی ئاشور و ئیلام دەکەن کە لەسەربناغەیٚ کۆمەڵێ بەڵگەنامەیٚ لاواز و کەم نرخەوە هەوڵ ئەدەن تاوانی داگیرکەرییەکە لەسەرشانی هخامەنشییەکان بسرنەوە. بەڵام بەردە نووسراوە و بەڵگەکانی هخامەنشی هیچ نەبێ، تاکاتی داریوش نیشانەیٚ فراوان لەژیانی ئەوانە بەدەستەوە ئەدات. جارێکی دیکە ئەیڵم کە هۆزی یەهود لەبەکاربردنی عەقڵ و سامان بۆ دەربازبوونیان، ئاوپەڕیی ژیرمەندی، دین پەرەستی و بەرپرسایەتی و خولیا بە باوڕەکانی موسا چوونە پێشەوە و لەڕێگای بەهێزکردنی کورشەوە باوڕمەندی خۆیان بەکتێبی سەردەمی کۆن (عهد عتیق) سەلماند. لێرەدا تەنیا قسە لەسەر هۆکارەکانی سەرهەڵدانی هخامەنشییەکان و لە بێئاگاداری ئێرانییەکان لە ئارادایە کە مێژووی یەهود سازی کردووە، بۆئەوەیٚ کە پەرژ و بڵاوە پێکەری هۆز و نەتەوەکانی ئێران و شارستانییەتی ڕۆژهەڵاتی ناوڕاست بەبناغەدانەری شارستانیەتی ئێران بناسێنن و ئەم کارەشیان بەڕەوا و مافدار بزانن!.

و داكۆكی وڵاتەكەیان نەدەن، ئیلا یەهود نەبێ؟ كە كەوتنی بابول هاودەق بوو لەگەڵ ئازادی دیلە یەهوودییەكان و ڕەزامەندی كورش لەم بارەوە. لەكۆتاییدا ئەوكاتەیە كە بانگێشەكەران و یارمەتیدەرانی كورشی بێناونیشان و بێوڵات بۆ بابۆلی بەناوبانگ، وڵام و دەسخوەشانەكەیان لە ئیمپراتور وەربگرن. ئیمپراتورێک كەئەگەر یارمەتی یەهود نەبووایە، وەكو باب و باپیرانی لەهەر جۆرە ناوبانگ و وڵاتێک بێبەری بوو.

لەیەكەم ساڵی پادشاهی كورش ئیمپراتوری پارسدا، ئەوێ كە خۆداوەند بەهۆێ ئەرمیایێ نەبییەوە فەرمووبووی، بەئەنجامی گەیاند، ئەوكورشی هەڵخراند كەفەرمانێک دەربكات ولەنووسراوەیەكدا بۆسەرانسەكری وڵات بەڕێی بكات. دەقی فەرمانەكە بەمجۆرەیە : من، كورش، ئیمپراتوری پارس ڕایدەگەیەنم كە خۆداوەند ، خۆداوەندی ئاسمانەكان هەموو جیهانی بەمن بەخشیووە و فەرمووی كە لە شاری ئورشلیم كە لە سەرزەوینی یەهوودا هەڵكەوتووە، ماڵێكی بۆساز بكەم. كەوابوو، هەموو ئەوێ یەهودییانە كە لە ئیمپراتورییەكەی مندا نیشتەجێن و بیانەوێ، دەتووانن بۆ ئەوێ شوێنە بگەڕێنەوە. خۆداوەند، خۆدای ئیسرائیل پشتیووانی بێت! (عهد عتیق، عزرا، ۲۳ _ ۲۲ :۳٦)

ئایا لەوانەیە كورشێک كە لەهەموو بنەما ئایینیە ناسراوەكانی ئەوكاتە بێبەریی بووبێ وسەربەرزی و پاڵپشتی خۆێ لەبابۆلدا بە مەردوک و نەبووەوە گرێ دابێ، لەهەمان ساڵی یەكەمی ئیمپراتورییەـ كەیدا بەبێ هیچ جۆرە پێشكەشی و وەرگرتنێكی پێشوەخت، كۆتوپڕ لە خۆدایێ گەورە دەستووری وەرگرتبێ كە یەهودییەكان و ماڵوسامانەكەیان بۆ ئیسرائیل بگەڕێنێتەوە تا دیسان ئورشلیم ئاوەدان بكەنەوە؟. بەدڵنیاییەوە وەها فەرمانێک لە كەسایەتی كورشەوە دوورە و فەرمانێک بوو بۆ گەڕانەوەێ سامانە مادیی و زانستییەكانی یەهود، كاتێ كە ناوبراویان بۆ ئیمپراتوری قنج كردەوە، چوونكە نەتەوەكانی دیكە بەشێوەیەكی دیكە یادی كورش دەكەن.

ئەێ پادشاە ئامۆژگاریت دەكەم كە دەس لەم كردەوە هەڵگرە، چوونكە دیار نییە كە ئاكامەكەێ بەقازانجی تو بێت. شاد بە بەوەێ كە خەریكی بەڕێوەبەری هۆزەكەێ خوتێ و لەمن بگەڕێ كە خەریكی دەسەڵاتداری سەرزەوینەكەێ خۆم بم. بەداخەوە كە گوی بەقسەكانم نادەێ، لەبەر ئەوە شتێک كە بیری لێناكەیتەوە ئاشتی و خۆشییە.. لەگەڵ تومە ئەێ ئەو خوێنخۆرێ كەلەخوێن تێر نابێت! كە كوڕەكەمت بەهێزی لە هۆشبەری بادە بەدیل گرت، لەخۆت بایی مەبە، چوونكە ئەوە بێڕەوشتی و شێوەیەكی دوور لەجوانمێرییە و لە گۆڕەپانی شەڕدا بەدەستت نەهێناوە. لەگەڵ ئەوشدا من خراپەێ تۆم ناوێ، گوێ لەقسەكانم بگرە و كوڕەكەم ئازاد بكە و بەبێ

ئەوەیٚ زیانێک ببینی لەوڵاتەکەم دوور کەوە. جیا لەوە کە پێم وتی، بەخوداوەندی هەتاو سوێن دەخوم بەهەر ڕادەیەک کە خوێنخوەر بێت، لەخوێن تێرت دەکەم. (رقیه بهزادی، قوم‌های کهن در آسیای مرکزی و فلات ایران. ل ۹۷)

تومیریس شاژنی ماساژتەکان، پاش ئەو پەیغامانە هەموو شەڕکەرەکانی کۆکردەوە، شەڕێکی خوێناوی دەستی پێکرد، کورش تێکشکا و لەگەڵ بەشێکی گەورەیٚ سوپاکەیدا لەگۆڕەپانی شەڕدا گۆڕران. ئەوکاتە تومیریس سەری کورشی لەکەلاکەکەی جیاکردەوە و لە هومەیەکی گڵینەیٚ پڕلەخوێندا دانا و ووتی هەر ڕادەیک کەدەخوازی بخوەرەوە تا لەخوێن تێر ئەبیت (۱).

لەمانگی تیشرین‌کاتێک کە کورش لەئوپیس، هەڵکەوتوو لە کەنارەکانی دیجلەدا لەگەڵ ئەرتەشی بابوڵدا سەرقاڵی شەڕ بوو، خەڵکی ئەکەد پاشەکشێان کرد و کورش دەستی کرد بەتاڵان و کوشتنی ئەوانە. (آملی کورت، هخامنشیانش ل ٤۱، بەنقل از سالنامهٔ بابوڵ)

ئیستا یەهودییەکان وەکوتەنیاسەروەرانی مێزوپوتامیا دەربازی خانووەکانی خوێان بوون وئیمپراتوری نوێش خەریکی ڕاوڕووت و داگیرکەری و کوکردنەوەیٚ سامان، ناسنامە و سرینەوەیٚ هەبوونی مێژوویی خەڵکانێکە کەبەدرێژایی ۲۰۰۰ساڵ پێش لەئەو، لەئێرانی دێرینەدا بەهێمنی و ئاشتی کوبووبوونەوە. خەڵکانێک کەلەناخەوە بووبوون بەئامانجی ئاژاوەیٚ یەهوودییەکان و لەدەرەوە ڕمی هوزێکی نەیار بەسەریاندا دەباری. لێرەدایە کە بۆیەکەمین جار دانیشتووانی ئێران، نێوی "پارسە" یان بو ئەم هوزە بێ‌ناونیشانە دانا، نازناوێک کە لەئێرانی دێرینە و ئێرانی هەنووکەیی و مێدیا و ئیلامدا- واتایٚ "سواڵکەری" بەرەڵا و هێرش‌بەریان بو داناوە. لەفارسیدا لەم نازناوە جیاکراوەیە، گەڕال ---> "پرسەزن" لەیەک دراوەتەوە و تەنانەت دەنگی تووڕەبوونی سەگیشیان لە هەڵسەنگاندنی دەنگی "پارس"ەوە ناسیووە(۱). وواتایٚ ئەم نازناوە چەندە لەگەڵ هەبوونی مێژوویی ئەم هوزەدا دەگونجیٚ و ووردبوونەوە لەم نازناوەدا چون مروڤ دەباتە قووڵایی نێو ئەو ئازارانە کە خەڵکانی ئێران لەئاکامی سەرهەڵدانی هخامەنشییەکاندا بینیوویانە! . و بوچی ماموستایانێک دەس‌دەکەون کەبو دوزینەوەی واتایٚ پارسە، ڕێگایەکی وەها دوور و درێژ دەگرنە پێش: ۱- ئەمە

ووتەیٚ هیرودیت لە مردنی کورشە، کە من ناوبراو بە مێژوو فروش و چیروک سازکەرم زانیووە، بەڵام ووتەکانی دەربارەیٚ دلوّانی کورشیش لەبەرهەمەکانی ناوبراوە، کەوابوو دەس‌تێوەردانی من بەم وتارەوە لەجێگایٚ خویدایە چوونکە هەردووکیان بێ‌بناغە یاهەردووکیان سەلمێندراون.

**وڵاتی پارسەکان:** ئیستا ئە بێ ژینەواری ڕەسەنی پارسەکان دابین بکەین. ووردبینی لەباسەکانی پێشوودا ئاکامێکی گشتی بەڵام ڕوٚشن بەدەستەوە ئەدات: نێوی زوٚرینەیَ خێڵە پارسیەکان ئەو نێوانەن کە سەرچاوەکەیان لەرِوٚژهەڵاتی ئێران وئاسیای ناوینداِیە و رِێگای کوٚچبەر بوونیان بەرِوٚشنی لەرِوٚژهەڵاتەوە بوٚرِوٚژئاوا و باشووری ئێران دەس پێدەکات. ئەم بوٚچوونە بەچوار نیشانەیَ دیکەوە دەسەلمێندرێت. یەکەم تەنانەت خوٚدی نێوی پارس پەیٚوەندی بەئێرانی رِوٚژهەڵاتەوە هەیە.

دیاکونوف پارسَ و پَرثَوَ دوو زاراوە لەیەک وشە دەزانێت کە ئەمرِوٚ بەشێوەیَ پاڵ (واتا سنوور پراسوو و بەواتایەکی دیکە ناوچەیەکی سەرسنوور) ماوەتەوە. تەنانەت ئەگەر لەگەڵ ئەو بوٚچوونەشدا نەبین، ناتووانین یەکجوٚری دوووشەیَ پارسە وپشتو بخەینە پشت گوی. مارکوارت سەد ساڵ پێش لەئیستا لەوٚباوەرەدا بووکە ئیگلیزییەکان (گوایە بە رِوانگەیەکی سیاسییەوە) داهێنانێکیان لەم بارەوە کردبوو کەبەوٚ پێیە: پشتو، پشتون، پختون و پثان هەموویان لەنێوی پاکتو (کە بەرانبەر وتەکانی هیرودتوس، کتێبی سێهەم، بەندی ۱۰۲ لەئێرانی رِوٚژهەڵاتدا دەژیان) وەرگیراوە. رِەتکردووە و ئەگەر سەرنجی پیتی "ش" لەزمانی ئەفغانیدا بدەین پیتەکانی "س ر" و "ر س" و "ر ش" دەتووانن فارسی بن، بناغەیَ نێوی "پشتو" (و پختون) بەپشتان و پَرشتان بزانین و یا (پارسی تی- تای) - واتا هوٚزی پارس (لەبەر ئەوە تای لەرِەسەنی زمانی سکائییە) بەهاورِیشە بزانین و ئەم هوٚزە، وەکو بەتلەمیوس (جوغرافیا، کتێبی شەشم، بەندی ۱۸) لە سەرزەوینی کابلدا ژیاون. (لەرِاستیشدا بەتلە میوس هەر لەوٚ شوێنەدا بەدوو هوٚز ئاماژەدەکات کە یەکی لەوانە پارسەکانە و هەروەها دوو شوێنیش بەنێوی پارسیانە و پارسیا ناو ئەبات کە هەردووکیان لەهەمان ناوچەیَ کابوٚلستاندا ژیاون) تارن لەسەر نێوی پاسیانییەکان و نزیکییان بەنێوی پارسی و پارسەکان رِادوەستی و بەیەک تیرەیان دەزانیَ و ئەوانە بەخەڵکانێکی پرهێز دەناسیَ کە لە تێکشکاندنی یونانییەکانی رِوٚژهەڵاتی بەلخدا بەشدار بوون، و ژینگەکەیان لە دەور و بەری بەلخ وخوارەزمدا، دەتووانرێت بەم گریمانە رِاگەیندرێت کە گوایە ئەوانە پاشماوەیَ پارسانە بوونە کە لەدەسپێکی هەزارەیَ یەکەمی پێش زاینی لەگەڵ مێدیاکاندا لە نیشتمانی سەرەکی ئێرانییەکانی رِوٚژهەڵاتەوە = (ئێرانویج) نێوی "سەرزەوینی ئەفسانەیی "ئێرانییەکان لەئێرانی رِوٚژهەڵات) بوٚ رِوٚژئاوا کوٚچبەر و لەپارسوا یا پارسوماش و یا پارسە نیشتەجێ بوون. لەهەمان حاڵدا هێرتسفێلد رِایدەگەیەنیَ کەلەوانەیە نێویَ "پارسە" شێوەیەکی پررِەنگ کراو لەسەرچاوە دێرینەکەیَ بێت کە ئاشورییەکان پرسویان پیَ ووتووە. تدسکو و (مرگنستیرنە) ش سەلماندوویانە کەگوٚرِینی دەنگی "رس" ی فارسی بوٚ "ش ت" ی ئەفغانی (بوٚمیناک لە "پرسیارکردن" و "ترسان" ی فارسی و "پشتیدن" و "تشتیدن" ی ئەفغانی)، و ووردبوونەوە لە نیشانەکانی مارکوارت و تارن، "پشتو" ی وەرگیراو لە پارسەیان زانیووە. ئاکامی باسەکەیَ مرگنستیرنە وەها بوو. لەرِوانگەیَ دەنگەوە پشتو لەرِەسەنی پَرسوایە کە نیشانەیەکی مێینەیە و بەواتایَ زمان، رِەگەزە سەرەکیەکەی لە "پەرسو" "برِبرِەیَ پشت" بەجیَ ماوە و پشتون

لە پَرس(و) وانە گیراوە هەڵیسەنگێنن لەگەڵ پاسیانی و نێوی هۆزەکانی دیکەدا کە پاشکۆیَ (اَنە) یان هەیە. گۆڕانی"ر س" بە"ش ت"ئەبێ لەسەردەمێکی تارادەیەک کۆندا ڕووی دابێ چوونکە حاڵەتێکی گۆڕدراو لەشێوە کۆنەکەیە و وەکو"پستانە" بە دیمەنی"پشتان/ پشتن"چوەتە نێو زاراوەکانی سنووری هێندەوە و شێوە هەنووکەیەکەی هێند و ئاریائی"پثان" لەوەوە سەری هەڵداوە. (ع. شاپور شهبازی، ارج نامەی ایرج، جلد اول، ل ٦٠٨ ـ ٦١٠)

ئەوانە بۆدۆزینەوەیَ واتایَ پارس، هانا دەبەنە بەر پرثوا، پشتون، پشتانە، پشتن پشتو، هەرپیتێک بۆ پیتێکی دیکە ئەگویزنەوە، تا ئەوپەڕی جیهان دەپشکێنن، هەموو هۆز و خێڵێک پێکەوە دەلکێنن و تەنانەت دەیخوڵقێنن تا لەکۆتاییدا شتێک وەکو پارس و پارسە ببیننەوە. بێگومان بەم شێوە تۆژینەوە لە گشت زمانە و سەرزەوینەکاندا وشەیەکی هاووێنە یان هاو دەق لەگەڵ پارسدا هەر دەس دەکەویَ. سەرەڕایَ ئەم جۆرە هەوڵانە واتایەکی تارادەیەک ڕۆشن کە تەنانەت لە فەرهەنگەکەی ڕەحمەتی دهخدا و فەرهەنگی کوردیشدا ئەدۆزرێتەوە، نایبیننەوە و یا بەهۆیَ دەمارگرژیە دژە مێژووییەکانیان خستوویانەتە پشت گویَ بەهەرحاڵ ئیمپراتورانی"پارسە" واتایَ ئەم نازناوە بۆدادوەری نەتەوەیی ومێژوویی لەفارسی و مێدیاییدا دەربارەیان ڕاست دەردێت، نازناوێک کە هۆزە ئێرانییەکان پاش خوێنڕژاندنە فراوان و سەرانسەرییەکەیَ کورش بە هۆزەکەیان بەخشییان. داریوش یەکەمین کەس بوو کە ئیمپراتورییەکەیَ بەو نێوەوە ڕازاندەوە (١)، لەحاڵێکدا کە زێروئاڵتوونەکانی یەهوودیانی بۆ خاوەنەکەی دەگێڕاوە، بەسامانی داگیرکراو وکاری زۆرەملی هونەرمەندە ئێرانی و نا ئێرانیەکان کە نەتەوە ونەماڵەکەیان دۆڕاندبوو، بۆ بناغە دانان وتەوکردنی دەسەڵاتەکەیَ بەکاری برد، هەرچەن پێشتر هیچکاتێک خشتێکیان لەسەر خشتێکی دیکە دانەنابوو، کۆشک و تەڵارەکانی پاسارگاد و شوش و تەختی جەمشیدیان بەرپاکرد؛ هەموو ئەو دەسکەوتانە پاش ئاشنا بوون بە مێژووی ڕاستەقینەی هخامەنشییەکان بوون بە خاون نرخێکی بەرز و پیرۆزتر، چوونکە گشت ئەوانە بەڵگەنامەیَ بەرزبوونی ئاستی هونەری هونەرمەندانی ١.

نەریتی کەڵکوەرگرتن لەناو ونازناوی تۆقێنەر و تەنانەت ناپاک و ڕازانەوەیَ دیمەن لە شکڵی گیان لەبەرانی خوێنخوەردا، بۆترساندن و دڵەڕاوکێی خەڵکانی پەلاماردراو، کاری هەمیشەیی هۆزە هێرشبەرەکان بوو و لەسەرانسەری جیهاندا پێویستی بە سەلماندن

تایبەت نییە. بەڵگەکانی بابوڵ و ئاشوریش دان بە کوژران و ئازاردان لەئاست و ژمارەیَ نائاساییدا دەنێن کە بۆ تۆقاندنی نەیاران بەکاربراوە.

سەرکوتکراوی دانیشتووی ئێران و وڵاتانی دیکە بوون، کە لە تەختی جەمشیددا کۆبوونەوە.

ئەم کۆشکە کەلە شوش کردوومە، دیوارەکەیم لەرێگای دوورەوە هێناوە. زەوینەکەیم هەڵکوڵی تاگەیشتە بەرد، پاش ئەوە بە شلەقوڕی تێکڵاو لەگڵ و قسڵ پڕم کردەوە. قووڵایی خەندەقەکە لەهەندێ شوێندا دەگەیشتە ٢٠ تا ٤٠ ئەرەش و لەسەر ئەو بنەڕەتە کۆشکەکەم بیناکرد. هەڵکوڵینی زەوینەکە و سازکردنی شلەقوڕەکە و داڕژاندنی و خشتپێژییەکە کاری بابۆلییەکان بوو. تەختەداری سنەوبەرم لەچیاکانی لوبنانەوە هێنا و گواستنەوەکەی تا بابوڵ کاری هۆزی ئاشور و یونانییەکان لە بابوڵەوە تا شوش هێنایان. داری یکا لە گندار و کرمانەوە هێنراوە. ئاڵتوونێک کە لەو کۆشکە بەکاربراوە هی سارد و بەڵخە. بەردی بەنرخی لاجیوەرد و ئاقیقی سوور لە سەغدەوە هێنراوە. بەردی گرانبەهای کدر کە لە کۆشکەکمدا بەکار براوە، هی خوارەزمە. زیو و داری بەردین وەکو ئابنووس لە میسرەوە هێنراوەکەرەسەی ڕازاندنەوە کە دیواری کۆشکەکەیان خەملاندووە هی یونان، عاج و ددان فیلێ هی حە بەشە و ڕەخج. کوڵەکەبەردینەکان لەگوندێکی خوزستانەوە هێنراوە بەنێوی ئیبرادوش. وەستاکارە بەردتاشەکان خەڵکانی یونان و سارد بوون و زەرگەر و ئاڵتوونکارەکان لەمێدیا و میسرەوە هاتبوون. وەستاکارانی دارتاش خەڵکانی میسر و سارد بوون. خشتبرەکان و کورەچییەکان خەڵکی بابوڵ و ئە وانە کە دیوارەکانیان دەڕازاندەوە، خەڵکی مێدیایی و میسری بوون. (کتیبە شوشDsr، شارپ، فرمان شاهنشاهان هخامنشی، ل ٩٠) سورشتی ڕاستەقینەیٚ ئیمپراتورییەکی نەیار و لەخوێنەوە هاتوو و لەسەرخوێن دانیشتوو کە لە هەریمی سەردانی هونەر و پیشەسازی جیهانەوە کرێکارێکی خشتبڕ، کورەچییەک، یەک زەرینگەر و هونەرمەندێکی شێوەکار لەخێڵەکەیدا دەس ناکەوێ(١)،

و تادووا هەناسەیٚ مێژووە بەد یومنەکەی پاڵی بە ڕمەکەیەوە دابوو. هونەرمەندانی نەتەوە بندەسکراوەکان بەخوڵقاندنی گەورەترین و جوانترین دەقی هونەری، پەیامێکیان بۆ مێژوو داناوە و بە زمانە هونەرییەکەیانەوە هاوار ئەکەن و ئەڵێن بەشبەشی ئەو شاکارانە یادگاری دەست و پەنجەیٚ هونەر خولقێنەری ئەو هونەرمەندانەیە کە لەنێو نەتەوە بندەستکراوەکانی هۆزی خوێنڕێژی هخامەنشەوە سەریان هەڵداوە نەک دەسەڵاتی هخامەنشییەکان. ئیستا مێژوو تەنیا چەن کۆگا کاولگەیٚ لە زورینە ئەو شارستانیەتانەیٚ لەبیر ماوە. بەخۆشحاڵییەوە لە گشت ئەوٚ

١. سایلۆجێکی نەزان دەیگوت کە بێبەری بوون لەخشتبڕ هۆیٚ سەربڵندی ئێرانییەکانە چوونکە ئەوانە کاری نزم و بێبایەخیان نەزانیوە. بەسەرزمانە نەیدەزانی کە خشتبڕێک، کورەچییەک یان بەردتاشێکی جیهانی دێرینە لەوەستاکارانی تونێلە ژێردەریاییەکەی نێوان ئینگلیز و فرانسە لەدەریای مانشدا گرنگتر بووە.

بیرەوەرییە مێژووییانە کە پێشینەکەیان بۆ سەردەمی پێش لەهخامەنشییەکان دەگەڕێتەوە، تەنانەت کەوانەهێڵێکی بچووک یان نەقشێک نابینرێت کە بتوانرێت نێوی هونەری هخامەنشی بۆدابنرێت.
(١) لەتەخت جەمشیددا ئێمە ناوەندی نموونەیەکی کۆکراوە لە شارستانیەتی پێش لەهخامەنشییەکان دەبینین، و لەتەخت جەمشیددایە کە لەگەڵ جل‌وبەرگ، هونەر، بە رهەم، پیشەسازی و تەنانەت خۆ و ڕەوشتی گشت هۆزەئێرانییە خاوەن شارستانیەت بەڵام سەرکۆتکراوەکاندا ئاشنا دەبین.
ئەوەیّ کە دارێژەری ڕووبەری گشتی دیوانخانەکەیّ داریوش لەتەخت جەمشیددا بەجیّ هێشتووە، بەڕاستی کەقسەبێژی بەسەرهاتی نەتەوە بندەسکراوەکانی ئێرانی و نائێرانی لەگەڵ مێژوو و بەرەکانی داهاتوودایە. ئەوهونەرمەندە کەموێنانە، بەجوانی توانویانە ئەوڕێکوپێکی و بێدەنگییە کەهەمیشە لەڕووی ناچارییەوە بەشێوەیەکی کاتی، بەسەر میلەتانی داگیرکراودا داسەپێندراوە بە بلیمەتێکی کەم‌وێنەوە بنوێنن و مروۆڤ وادەزانیّ کە ئەوانە بەحەز و ویستەوە هەبوونی خۆیان پێشکەش دەکەن! . ئەم دارێژەرە هونەرمەندە بەدوو کەرتکردنی تەواوی ڕووبەرەکە، لەلایەکەوە ئیمپراتور، جێگرەکەیّ، گەورەپیاوان، هێزە چەکدارەکان و کاربەدەستانی بارگاکەیّ و لەلایەکی دیکەوە ئەوّنەتەوانە نیشان ئەدات کە بەدەس‌مایە نەتەوەییەکانیانەوە کە بریتییە لە قوماش، خۆری و پەز وجامۆڵکە وگەوهەر، چاوەڕوانی هاتنی شاە و پێشکەشکردنی ئەوّشتانەن. و دانانی نموونەیەکی چاودێری ئاسایش لەنێو ئەوانەدا وەکو ڕیّنیشاندەر ئاشکرایّ دەکات کە خوەش حاڵی و مەزنایەتی سوڵتان زۆرتر لەسامان و دەسکەوتەکانی نەتەوە بندەستکراوەکاندایە.
هەروەها وێنەکان زۆربوونی ژمارەیّ میلەتان، دێرینەبوونی ئەوانە و سەردەستی شارستانیەتی دانیشتووانی ئێرانی کون و مێزوپۆتامیا ئاشکرا دەکەن کە بەجل‌وبەرگ و چەک وکڵاو وشێوەی ١

- لەهەر ڕوانگەیەکەوە کەبڕوانینە هخامەنشییەکان ئاکامی سەرهەڵدانەکەیان جێگایّ داخە. تەنانەت هێرشی هۆزی مەغوّل بۆباشوور، بوو بەهۆیّ کۆمەڵێک سەرنج وسەرسوڕمان لەقوناخی یەکگرتوویی مێلی و لەفەرهەنگ و هونەری هۆزی سەرکەوتوو و تێکشکاودا. لانی‌کەمی مەغولەکان بەرهەمی ئەوّ هێرشەیان بۆ وڵاتەکەیان گەڕانەوە و هەندیّ لە خێلە سەرەتاییەکان لەگەڵ فەرهەنگی باکوور - باشووردا ئاشنابوون. بەڵام هخامەنشییەکان و پاش ئەوانە ئەشکانی و ساسانییەکان، ئیلا کاولکاری و ڕاوەستاندنی گەشە کردووتی و پێشکەوتن لەئێران و مێزوپۆتامیا نەبیّ، شتێکیان نەهێشتەوە و خۆدی ئەوانەش پاش تێکشکان لەمێژوو و جوّغرافیای سەرزەوینی ڕۆژهەڵاتدا ون بوون و ئیستا وەکو خێل، هۆز یان نەتەوە، بەڕادەیەک نەیار و بیّ‌ناونیشانن کەلەسەرەتادا بوون.

ازاندنەوە و هونەر و دەستکردەکانیان دەهێنێتەوە بیری مێژوو. لەم ڕوانگەوە تەخت جەمشید نوشەویستترین بیرەوەری ئەو نەتەوانەیە کە هەندێکیان پاش هێرشی هخامەنشییەکان بتر لە مێژوودا سەریان هەڵنەدا.

مەرەڕای هەموو ئەوانە گشت نەوەکانی ئیمپراتوری مەزن و تەفروتووناکەری نەتەوەکانی انیشتووی ئێرانی کۆن و مێزوپۆتامیا، نەکەوتنە شوێن ڕێچکەکەی بابیان. تەورات لەم بارەوە ە شێوەیەکی ناسۆزشتی بێدەنگە و ئەو هەموو پەسن و پێزانینە کە دەربارەی کورشەوە بڵاو ووبووەوە، لەبارەی نەوەکانی پاش ناوبراو نابینرێت! ئەم بێدەنگیە ماوەی نێوان مردنی کورش و سەرهەڵدانی داریوش درێژەی هەیە. لە تەوراتدا ئاماژەیەک بە کەمبوجیە و بەردیا ناکرێت و شوێنەوارێک لە هۆکارەکانی سەرهەڵدانی دووهەمین شاهەنشاهی مەزن، واتا داریوش نابینین. بەو ڕادەیە کە تەورات لەناساندنی کورش تا ئاستی مەسیحی خوادا تووشی تۆندڕەوی بووە، لەناساندنی داریوشدا ڕژد و دەس وشکە و بەڕاشکاوی تێدەکۆشی کە سەرنجی خوێنەر لەم باسە لابدات. ڕاگەیاندنی مێژووی سەرهەڵدانی داریوش بەڕادەیەک تێکەڵ و پێکەڵە کە مێژوو نووس دەهێنێتە سەر ئەو باوڕە، کە ئەم کتێبە بەئەنقەس یەهود لە ئاژاوە گەورەکەی داریوش لا ئەدات.

بەڵام ئیتر شایەتەکانی دیکەی مێژوو لەم بارەوە وەکو تەورات بێدەنگ نین.

کاتێ کە یەهودا و بنیامین نەیارانی نەتەوەی یەهود، بیستیان کە یەهودییە کوچبەرکراوەکان بۆ وڵات گەڕاونەتەوە و سەرقاڵی چاککردنەوەی ماڵی خوداوەند، خودای ئیسرائیل بوون، چوونە دیتنی زروبابوڵ و گەورەپیاوانی دیکەی هۆز و وتیان ئێمەش ئامادەین لە چاککردنەوەی خانووی خوداوەنددا بەشداری و لەگەڵ ئێوەدا هاوکاری بکەین چوونکە وەکو ئێوە خودایک دەپەرەستین. لەوکاتەوە ئەسەرحەدون، ئیمپراتوری ئاشور ئێمەی بۆ ئەم شوێنە کۆچبەر کردووە هەمیشە بۆخودای ئێوە قوربانیمان کردووە. بەڵام زروبابوڵ و یەوش و گەورەپیاوانی دیکەی یەهود وڵامی ڕەتیان دایەوەو وتیان مە ـالی بەشداربوونی ئەم کارەتان پێنادەین. خانووی خوداوەند، خودای ئیسرائیل، بەهەمان شێوە کە کورش پادشاهی پارس فەرمانی داوە ئەبی لەسەردەستی نەتەوەی ئیسرائیلدا چاک بکرێتەوە، پاش ئەوە دانیشتووانی ئەو شوێنە بۆلاوازکردنی ورەی خەڵکی یەهود دەستیان بەپڕوپاگەندەی خراپ کرد وبەریان بەپێشبەچوونی پلانی ئیسرائیلییەکان دەگرت. لەپاڵ ئەوەشدا بەرتیلیان بە دەوروبەری دەسەڵات ئەدا تا دژی ئیسرائیلییەکان هەستن. **ئەو جۆرە کیشانە لە هەموو سەردەمی پادشاهی کورشدا هەبووە و تا پادشاهی داریوشیش درێژەی هەبووە.** (عهدعتیق، عزرا، ٥ ـ ١ ٤:)

ئاماژەیٚ تەورات کە ئەلّیٚ کیشەسازکردنەکان لەکاتێکەوە دەستی پیٚکرد کەدیلەکانی بابوّل گەرانە وە بوٚ ئورشلیم، تا سەردەمی داریوش ئیدامەیٚ هەبوو و لەم بارەوە فەرمانەکەیٚ کورش دەکات بە بەلّگە، بەئاسانی پەیٚوەندی بەساڵەکانی دەسپێکی چاککردنەوەیٚ ماڵی خوّدا و سەردەمی پادشاهی کەمبوجیەوە هەیە. تەورات بەشیٚوەیەکی بڕوا پیٚنەکراو هەولٚ ئەدات تا ڕووداوەکانی سەردەمی کامبوجیە و داریوش بەنیٚوی خەشایار و ئەردشیرەوە تاپوٚ بکات، بەلّام وتنی نیٚوی زروبابوّل کەلەڕێکخەرانی گەڕانەوەیٚ دیلەکان بوٚئیسرائیل بوو، ئاشکرا پرسی ڕاوەستانی سازکردنی خانووی خوّدا بوٚ کاتی پادشاهی کەمبوجیە کوٚڕ و جیٚگری کورش، دەگیرێتەوە.

لەدەسپێکی دەسەلّاتی خشایارشادا نەیاران خەلّکی یەهود و ئورشلیم سکالّانامەیەکیان دژی ئەوانە بوٚپادشا هەنارد. لەسەردەمی پادشای ئەردەشیرشدا ئەو سکالّانامەیان دووبارەکردەوە. ئەم نامەیە لەلایەن بشلام، میتراداد، طبئیل و هاوڕێکانیەوە و بەپیتی ئارامی هاتە نووسین و بوٚ ئەردەشیر پادشاهی پارس بەرێیان‌کرد. کەسانی دیکەش لەنووسینی سکالّانامەکەی دژبە یەهود و ئورشلیمدا بەشدار و بریتی بوون لە: رحومی فەرماندار، شمشائی نووسەر، ژمارەیەک لەدادوەر و بەرپرسانی دیکە کە لەئەرکی، بابوّل و شوش (کەلەئیلام هەلّکەوتبوو)، هاتبوون. و هەروەها هەندیٚ تیرە و هوٚزی جوٚربەجوٚری دیکە کە ئاشور بانی‌پالّی مەزن و پڕبەهز، ئەوانەی لە سەرزەوینەکانی خوٚیانەوە هێنابوو و لەسامرە و شارەکانی دیکەی ڕوٚژئاوایٚ فوٚراتدا نیشتەجیٚ کردبوون. ئەمەیە دەقی ئەونامەیە کە بوٚ ئەردەشیر پادشاهی پارس ناردبوویان.

" ئیٚمە کویلەکانت کە لەدانیشتووانی ڕوٚژئاوایٚ ڕووباری فوٚراتین، پادشاە ئاگادار دەکەین، **ئەوٚ یەهودییانە کە بە فەرمانی توٚ بوٚ ئورشلیم گواستراونەتەوە, دەیانەویٚ ئەم شارە کە شوێنی کیٚشە و ئاژاوە بووە, دیسانەوە ئاوەدان بکەنەوە.** ئەوانە خەریکی دوٚرستکردنی دیوار و چاککردنەوەیٚ بناغەکانن. پادشاە ئاگاداربێت کە ئەگەر ئەم شارە و دیوارەکانی دیسانەوە دوٚرست بکرێتەوە، بیٚگومان بەزیانی پادشایە، چوونکە پاش ئەوە ئەوٚیەهودییانەئیتر باج و زەکات نادەن.

لەبەر ئەوە ئیٚمە نان‌خوٚری پادشاین، شیاو نی‌یە کەزیانی پادشاە ببینین و هەر بەوٚ هوّوە، نامەیەکمان پێشکەش کرد تا پادشاە لەم کارەساتە ئاگادار بکەین. تکامان هەیە کە بفەرموون لەم بارەوە میٚژووی نووسراوەیٚ باب و باپیرانت هەلّسەنگیٚنن تاڕوٚشن ببێتەوە کەئەم شارە لەسەدەکانی ڕابوردوودا چەندە کارەسات و ئاژاوە تیٚدا سەری هەلّداوە. لەڕاستیدا ئەم شارە بەوٚ بوٚنەوە کاولبووە کە دانیشتووانەکەی هەمیشە دژی ئەوٚپادشاە و دەسەلّاتدارانە دەستی پیٚکرد، کەدەیانویست حوکمی خوٚیان بەسەریدا بسەپیٚنن. پاش ئەوە پادشا ئاگادار دەکەین کەئەگەر ئەم شارە و دیوارەکانی چاک بکەنەوە پادشاە ئیتر ناتووانی ئەم بەشە لەسنووری دەسالّاتی

که له ڕۆژئاوایّ ڕووباری فوراتدا هەڵکەوتووە، ڕابگرێت."
دووایی پادشاه وڵامی ڕحومی فەرماندار، شمشایی نووسەرو هەڤاڵەکانی کەلەسامرە و ڕۆژئاوایّ ڕووباری فوراتدا نیشتەجێ بوون، بەم جۆرە دایەوە: "سڵاوتان لێبێ! ئەوّ نامەیە کەناردبووتان گەیشت و پاش وەرگێران بوّیان خوێندمەوە. ئەمرم کرد شوێنی کەون و هەڵیسەنگێنن. ڕوشن بووەتەوە کە دانیشتووانی ئەم شارە لەمێژەوە دژی پادشاکان کێشە ساز دەکەن و ئاژاوە دەگێرن. هەروەها ئاگادار بووم کە پادشایانی بەدەسەڵات لە ئورشلیمدا بوون کە دەسەڵاتی سەرانسەری ڕۆژئاوایّ ڕووباری فوراتیان بەڕێوە بردووە و باج و زەکات و جەریمەیان سەندووە. کەوابوو، بەئەوّ زەلامانە ئەمر بکە تا دەرکردنی بڕیارێک لەلایەن منەوە دەس ڕابگرن و شارەکە چاک نەکەنەوە. خەێرا دەس بەکاربن و پێش بەکارەسات بگرن."
کاتێ کەنامەکەی ئەردەشێر پادشایّ پارسیان بوّ ڕحوم و شمشائی و هەڤاڵانی خوێندەوە، بەپەلە بەروّ ئورشلیم ڕێکەوتن و یەهودییەکانیان ناچار کرد کە دەس لەکارکردن هەڵبگرن. **چاککردنەوەیّ ماڵی خوّدا تا ساڵی دووهەمی پادشاهی داریوش پادشایّ پارس ڕاگیرا**. (عهد عتیق، عزرا، ٢٤ ـ ٦ : ٤)
سەرلێشێواوی مێژوویی لەم بەشەیّ تەوّراتدا لە ڕادەبەدەر ئاشکرایە و بەهوّیّ هەبوونی چەند ئاماژە لەم کتێبەدا، ئەم ڕووداوانە دەتووانی تەنیا لەکاتی پادشاهی کەمبوجیەدا ڕێکەوتبێت نەک لە سەردەمی ئەردەشیردا. یەکەم، نووسەرانی نامەکە بەئەو یەهودییانە ئاماژە دەکەن کە (بەفەرمانی توّ) بوّ ئورشلیم گواسترانەوە، بەڵام ئەوّ یەهودییانە ئەردەشیر بوّ ئوّرشلیم بەڕیّ نەکردبوون، ئەم کارە لەسەردەمی کورش و هەبوونی کەمبوجیە لەبابوّلدا بەڕێوە چوو. لەلایەکی دیکەوە و لە کوّتایی چیروّکەکەدا، تەورات بەڕوشنی دەنووسیّ." کاری چاک کردنەوەیّ ماڵی خوّدا تاساڵی دووهەمی پادشاهی داریوش ڕاگیرابوو".
دیارە کە ماوەیّ نێوان ئیجازەیّ کورش و نویّ کردنەوە ئەویّ ئیجازەیە لەلایەن داریوشەوە، بوّ گەڕانەوەیّ یەهودییەکانی ئورشلیم، تەنیا دەتووانیّ بەسەردەمی کەمبوجیایّ بزانین، نەوەک تەورات کە بەئەنقەس پرسەکە بەخشایار شاه و ئەردەشیرەوە گریّ ئەدات. هەمان هەڵە لەکتێبی حجی دا دەبینرێت. لێکوّڵەری کتێبی ئەنبیا، لە پێشەکیی کتێبی حجی چاپی "ئەنجوّمەنی نێونەتەوەیی کتێبی پیروّز" ساڵی ١٩٩٥، واتا دووا چاپی تەورات کە گەیشتووەتە ئێران، دەنووسیّ:
" ئەم کتێبەیّ حجی نەبی دەوروبەری ساڵی ٥٢٠ی پێش زایینیدا نووسرابێت. لەم سەردەمەدا یەهودییەکانی

لەتاوراگەیّ بابوڵەوە بۆسەرزەوینەکەیان گەڕابوونەوە و لەئورشلیمدا سەرقاڵی چاککردنەوەیّ ماڵی خوّدا بوون. بەڵام پێش لەوە کەئەو ئەرکەبەتەواوی جیّبەجیّ بکەن، لەنیوەیّ کارەکەدا دەستیان لیّهەڵگرت وخەریکی کاروباری خوّیان بوون. دراوسیّە بەدکارەکانی یەهودیش کە بەقسەوباسی دروّی خوّیان هەوڵیان ئەدا کەئەوانە دڵسارد بکەنەوە و تووشی دڵڕاوکییان بکەن. **لەلایکی دیکەوە ئەردەشیر پادشاهیش ئەمری کرد تا چاککردنەوەیّ ماڵی خوّداوەند ڕاوەستێنن**. (عهد عتيق، حجی، مقدمه)

ساڵی ۵۲۰ ی پێش زایینی، کەحجی نووسینی کتێبەکەیّ دەس پیّکرد، دووهەمین ساڵی پادشاهی داریوش و ساڵیکە کە داریوش فەرمانی چاککردنەوەیّ دووبارەیّ ماڵی خوّداوەندی دەرکرد. لەکتێبەکە حجی دا بەووردی ئاماژە بەباسە کراوە.

"**لەساڵی دووهەمی پادشاهی داریوش**، لەڕوّژی یەکەمی مانگی شەشەم، خوّداوەند پەیامێکی بەحجی گەیاند کە بەزروبابوڵ (کوّڕی شئلتی ئیل) حاکمی یەهود و یهوشع (کوّڕی یهو سادق) قەشەیّ مەزن ڕایّبگەیەنیّ. خوّداوەندی گەورە بەحجی نەبی فەرمووی : ئەم هوّزە ئەیژن ئیستا کاتی چاککردنەوەیّ ماڵی خوّدا نی‌یە. پاش ئەوە خوّداوەند ئەم پەیامەی بەحجی نەبی دا بوّ هوّزەکەیّ نارد : ئایا ئەمە دوّرستە کە ئێوە لەماڵی تازەسازدا بژین بەڵام خانووەکەی من خراپ بێت؟. (عهد عتيق، حجی، ۵ ـ ۱ : ۱)

کەوابوو هەموو هێما و ئاماژەکان دەگەڕێنەوە بوّکاتی نوسینی کتێبەکەی حجی، واتا دووهەمین ساڵی پادشاهی داریوش وورد و ڕاستە. لەم حاڵەتەدا بەچ شێوەیەک دەکرێت کەکاتی پادشاهی داریوش، ئەردەشیر فەرمانی ڕاوەستانی چاککردنەوەیّ ماڵی خوّداوەندی دەرکردبیّ، کە سەد ساڵ پاشتر بووە بەپادشایّ ئێران؟. کەوابووە دوّرستەکەیّ ئەوەیە بێژین مەبەست لەووتنی نێوی ئەردەشیر لەکتێبەکەی حجی‌دا، کەمبوجیەیە کە پێشتر فەرمانی ڕاوەستانی بیناکردنی ماڵی خوّداوەندی دەرکردبوو و لەبەر ئەوە کە ناتووانین لێکوّڵەری کتێبەکەیّ حجی لەساڵی ۱۹۹۵دا لەم‌بارەوە بەنائاگا بزانین، ئەوەمان پیّدەسەلمێنێت کەشاردنەوەیّ هەڵەکانی تەورات بەوّ ئامانجەوەیە کەنەقشی یەهود لەکودەتاکەیّ داریوش و کوّشتنی گئوّماتە و بەردیا کە ندیّای نوّیّ یەهود بوون، بەدروّ بخەنەوە. ووڕێنەکانی داریوش لەبارەی موّغی داگیرکەر و خوّکوّژی بەردیا و هەندی شتی دیکە لەبێستوندا دیکتەو ئاموّژگاری یەهود و گشتەکەی سەرقاڵکردنی مێژوو بەکوّمەڵی چیروکەوەیە کە سەرنجی مێژوو لە یەهودد لابدات.

**دژبەرایەتی سامرییەکان** : کاتیّ کە سامرییەکان لەمژاری چاککردنە وەی پەرەستنگەکە ئاگادار بوون

کەسانێکیان بۆلای زرو بابۆل و سەرکردەکانی دیکەی هۆزەکە نارد و وتیان ئەوانیش دەخوازن لە بینای پەرەستنگەی دووهەمدا بەشداری بکەن بەڵام لەبەر ئەوە بەنیئیسرائیل سامرییان لەتیرەی ڕووت و بێگەردی یەهودی نەدەزانی، پێشنیارەکەیان وەرنەگرت و ئەمە بوو بەهۆی نەیاری سامرییەکان و بەنیئیسرائیل و سامرییەکان لەدروستکردنی پەرەستنگەکەدا گیرەشێوێنی و دوژمنییان دەکرد. کاتێ کەمبوجیە جێگای بابی کورشی مەزنی گرتەوە، سامرییەکان لەگەڵ نەیارانی دیکەی یەهوددا کە سەرکردەکەیان سنبلت بوو، نامەیەکیان بۆ پادشای ئێڤان نووسی و سکاڵای یەهودییەکانیان کرد. ئەمەیە بەشێک لەئەو نامەیە:

"پادشاە ئاگادار بێت، ئەو یەهودییانە کە لەلاین تۆوە بۆلای ئێمە هاتوون، گەیشتوونەتە ئورشلیم و بناغەی و ئەو شارە خراپ و پڕ لەبەڵا بینا دەنەوە و دیوارەکانی دادەمەرزێنن و بناغەکانی چاک دەکەنەوە. با پادشاە ئیستا ئاگادار بێ کە ئەگەر ئەم شارە دیسانەوە بینا بکرێتەوە و دیوارەکانی چاک ببنەوە باج و جەریمەتان پێنادەن و ئاکامەکەی بەزیانی پادشایە." کەمبوجیە فەرمانی دا کەکاری بیناسزی شارەکە ڕاوەستێنن. کەوابوو چاککردنەوەی پەرەستنگەکە تا کاتی پادشاهی داریوش نزیکەی ۱۵ ساڵ تووشی ڕاوەستان بوو. (پرویز رهبر، تاریخ یهود، ل ۱۷)

وەها دەردەکەوی کە ئاغای پرویز رهبر زۆرتر لە لێکۆڵەری کتێبی حجی ئاگاداری هێما وئیشارە مێژووییەکان بووە و بەبێسەرنج بەنێودانانی ناڕاستی تەورات، ڕووداوەکانی ئەو ڕۆژانەی بە سەردەک کەمبوجیەوە گرێداوە. **سەرەتای پادشاهی بابۆل ۵۳۵، دەسپێکی دەسەڵاتداری بەسەر ئیمپراتورییەکەی کورشدا لە ۵۲۹ تا ۵۲۲ی پێش زایینی**: لەم کاتەدا زۆرتر لە ۷ـ۸ ساڵ لەگەڕانەوەی کوچبەرانی یەهودی لەبابۆل، دەرباز نەبووبوو، و لەهەموو ئەم ماوەدا پێشەواکانی میلەت لەگەڵ دژواری گەورەدا ڕووبەڕوو بوونەوە. کاتی گەیشتنی کۆچبەرەکان، وڵاتی یەهودا تاڕادەیەک لەحەشیمەت بەتاڵ وکەشوهەوایەکی ناحەزی هەبوو. جووتیارانێک کە بەدیل نەگیرابوون، لەشارەکاندا سەرلیشێواو، و بەشە جۆربەجۆرەکانی سەرزەوینی ئیسرائیل لەلاین دراوسێانی ئەدومی و ئەشدودییەکانەوە داگیر کرابوون. لەڕۆژهەڵاتی ئەردنەوە پۆلپۆل عەمنییەکانیان هێناوە و لە یەهودیە نیشتەجێ بوون. لەباکووریشدا شومرونییەکان دەژین کەپێشتر ئاشورییەکان هێنابوونیان و نیشتەجێیان کردبوون. ئاینەدەور وبەرییەکان هێدیهێدی لەنێوان جوتیارەنیشتەجێیەکاندا تەشەنەی کرد و زمانی عێبری بۆ زمانی ئەشدودی و زمانی نەتەوەکانی دیکە گۆڕدراوە. **ڕاوەستانی بیناکردنی خانووی خۆداوەندیش ئەم دژوارییانەیان بەرزتر**

کردووەتەوە. سەرەڕای ئەوە پێشواکانی میلەت کە بۆ باشتر کردنی پەیوەندییەکانی خۆیان و کەمبوجیە، چەن خەباتێکی جۆربەجۆریان ئەنجام دابوو، ئاگامێکی باشیان دەس نەکەوت، چوونکە سەرنجی کەمبوجیە چووبووە سەر چەن پرسێکی دیکە. (دکتر حبیب لوی، تاریخ یهود درایران، ل ۲۳۱) مێژووەکەی لوی هەم کەموکووڕییەکانی نەبوونی نێوی کەمبوجیە لەتەوراتدا قەربوو دەکاتەوە، هەم بەهەوڵی سەرکردەکانی یەهود ئاماژە دەکات کەدەیانویست ناوبراو بۆ ڕێگا و ڕەوشتی کورش بگەرێنێنەوە. ئایا کەمبوجیە لەبیری ئەوەدا بوو کەبەشێکی زۆرتر لە بابی، لەسامانی یەهود داوا بکات و یا بەڕاستی لەبەر ئەوە نەکەوتە ژێر کاریگەری هاندانی نەیارانی یەهود کە بەنی ئیسرائیل دەسەڵاتێکی بەهێزی بەدەست هێنابووەوە؟، هەروەها کە میسیرییەکان بیریان لێ دەکردەوە. گرنگتر لەوە، ئەوموغانە کە باوڕیان بەئایینی کۆنی ئێرانییەکان کە پەرستشی چەند خوداوەند هەبوو، دەسەڵاتی یەهودییەکانیان بۆسەرخۆیان بەمەترسی دەزانی و لەوانەیە هەڵوێستیان لەم بارەوە کاری کردبێتە سەر کەمبوجیە.
لەم کاتەدا سامرییەکان کەمبوجیەیان ئاگادار کردەوە کە هەبوونی ٤٠ـ٥٠ هەزار یەهودی کۆچبەر، و جووتیارانی یەهودی پێشوو لەیەهودا، کە ژمارەی ئەوانە بەڕێژەی نەتەوەکانی دیکە گرنگ نەبوو، مەترسیدارە. لەحاڵێکدا لەوڵاتی کەمبوجیە، لەچیاکانی ئاشور و لەمێدیا، (ئازەربایجان تا هەمەدان) ژمارەیەکی زۆرتر لەم نەتەوەیە ژیانیان دەکرد. دیلە ئیسرائیلییەکان لەماوەی ۲٦۰ساڵ ژیانی دیلیەتییاندا، ئیتر وەکو وڵاتی ئیسرائیل لەشەڕ و پێکدادانددا نەدەژیان. ئەوانە سەرقاڵی ئاژەڵداری و کشتوکاڵ و ژمارەیان پەیتا پەیتا پەرەی دەسەند.
کەمبوجیە کەڕووبەڕوو بوونەوەی سامرییەکان کاری تێکردبوو بیری لەوە دەکردەوە کەژمارەیەکی زۆر لەساباطە ئیسرائیلییەکان کە تا ئەو کاتەش هەر بەڕەوشتی سبطی و خێڵەکی مابوونەوە، لەنێو جەرگەی وڵاتدا دەژیان. کەمبوجیە بۆسڕینەوەی ئەو مەترسییە بڕیاری دا کەئەوانە بۆ چیا دوورکەوتووەکانی ئەفغانستانی ئێستا کەئەوکاتە کەسی تێدا نەدەژیا، کۆچبەر بکەن، بەڵام چ زەرەر و زیانێکیان پێ نەگەیێنن. دژبەری کەمبوجیە سەبارەت بەیەهودییەکان تا ڕادەیەک هەستی پێدەکرا و ڕاوەستانی بیناکەی ماڵی خودا لەو سەردەمەدا، بەشێوەیەک کاری کردبووە سەر یەهودییەکان کە هەندێ لەمێژوونووسانی ڕۆژهەڵاتی هەڵسوکەوت و کۆچبەرکردنی

یەهودیەکانیان لە لایەن کامبوجیەوە وەکو کارەکەی بەخت ئەلنەسر نرخاند و بە هەڵە لە ڕیزی بەخت النەسردا هەڵیانسەگاند. یەهودییەکانی یەهودییە کە لە ڕووی ناچاری ەوە چاککردنەوەی ماڵی خوداییان ڕاوەستانبوو، لەم ماوەیەدا بەدەست بەسراوی نەمانەوە و ئەو دژوارییانە کە لەسەرەتای ئەم بەشەدا هێمام بۆکرد سریەوە و لەم بەشەشدا سەرکەوتوو بوون. و درێژە پێدانی چاککردنەوەی ماڵی خوداوەندیان دانا بۆسەردەمی پادشاهی شاهەنشاهێک کە گرنگییەکگرتووبی لەگەڵ یەهودییەکاندا بۆ ڕۆشن بووبووەوە. ماوەی پادشاهی کەمبوجیە لە٦ساڵ ژیانی لەبابۆلدا و ٧ساڵی پاش مردنی کورش زیانی زۆری بە بەرژەوەند و بەرنامە نەتەوەییەکانی یەهودگەیاند. کۆچبەربووانی یەکەم کە لەساڵانی ٥٣٨ تا٥٣٦ پیش زاینی لەبابۆلەوە بۆ یەهودییە گەڕانەوە و ئەگەر ڕەوشتی کەموجیە وەکو بابی درێژەی هە بووایە، کەش و هەوایەکی گونجاو ڕوو بە ڕووی کۆچبەربووانی دەبووەوە. بەڵام کاتێک کە یەهودییەکانی دانیشتووی بابۆل، مێدیا و پارس، بەتایبەت چینی دەوڵەمەند چاوەڕوانی ئاکامی گەڕانەوەی کۆچبەرانی گرووپی یەکەم بوون، و ئیستا پاش سێ ساڵ لەم ماوەیە ئاگاداری ئەوە بوون کە بڕیارەکەی کورشی مەزن دەربارەی پێکهێنانی دەوڵەتی یەهود لەبیرچووەتەوە، بەم جۆرە هەستێکی ڕەش بینی لەوانەدا سەری هەڵدا و ئەو ڕەش بینییە بوو بە هۆی ڕاوەستانی گەڕانەوەی کۆچبەر کراوەکان بۆ ئورشلیم. ئەوانە بەدوای وڵامی ئەم پرسیارەدا دەگەڕان کە بۆچی بۆ یەهودییە بگەڕێنەوە و خۆیان بخەنە نێو مەترسی شەڕ و قەیرانی ئابووری؟. ئایا باشتر نی‌یە کە لەبابۆل و شارە گەورە و پڕدانیشتوو و دەڵەمەندەکان ژیان بکەن؟، یان باشترە بۆناوەندی وڵاتی کورشی مەزن، ولاینی هەمەدان و شوش و پاسارگاد بجوڵێن کە ئەو کاتە سامانی جیهان بۆئەو وڵاتە سەرەوخوار دەبووەوە و دڵنیایی باڵی بەسەریدا کێشاوە، لە نێو میلەتی مێهرەبان و مێوان پەروەری ئێراندا بژین کە ئاینەکەیێن جیاوازییەکی ئەوتۆی لەگەڵ یەهودەکاندا نی‌یە. ئەوانە کەنزمی ئیخلاق و دەروونی بابۆلی و دراوسێکانی یەهود زوێر بووبوون و ڕوویان هەڵدەچەرخاند، بەگەیشتنیان بۆ وڵات پارس کە خەڵکەکەیان خاوەنی ئیخلاق و باوڕێکی بەرزبوون، ئیتر خەمێکێن نەبوو. ئەوانە کاتێک لە بەڵێنی ناردراوەکانی خودای گەورە تووشی دوودڵی بوون، چوونکە پاش ئەو هەموو شادی و خۆشحاڵیە لەدەرچوونی بڕیارەکەی کورش،

بەچاوی خۆیان دەیانبینی کە نەگەیشتووەتە ئاکامێکی باش. (حبیب لوی، تاریخ یهود ایران، جلد اول ل ۲۳٤)

بیری سەرهەڵدانی نەبوکەد نەسرێکی دیکە لەهەرێمەکەدا مێشکی یەهودی هەژاندبوو و ڕاوەستانی بینایێ ماڵی خۆدا کە زیانی بەڕەوتی گەڕانەوە دەگەیاند دوودڵی لەبیر و بۆچوونەکانی تەوراتی اسباطدا پێکهێنا و ئەمە بۆ سەرکردەکانی یەهود دڵەڕاوکی بەدوواوەبوو. ئیستا ئیتر دەزانین کە کەمبوجیە بەرانبەر بە یەهود هەڵسوکەوتێکی دۆستانەیێ نەبوو و لەم بارەوە ڕێگایێکی جیاوازتر لەبابی گرتبووە پێش. ئەوێ کە پێنووس بەدەستەکەی هخامەنشییەکان و لەڕاستیدا یەهود، واتا هیرودت دەربارەیێ شێتبوونی کەمبوجیە نووسیویە، کاردانەوەیێ هەڵسوکەوتی کەمبوجیە بەرانبەر بە کۆچبەرکراوەکانی یەهودە.

زانیارییەکانی هێرودیت دەربارەیێ کەمبوجیە، پاش گەڕانەوەیێ بۆ ممفیس، ئەمەیە: (کتێبی سێهەم، بەشی ۲۷ـ۳۸) " کاتێ کە کەمبوجیە بۆ ممفیس گەڕایەوە، میسرییەکان ئاپیس‌یان بینیبووەوە (مەبەست گایێ پیرۆزی میسرییەکانە، کە نێوکەی وەها بوو و نیشانەیەکی تایبەتی هەبوو و پاش فەوتانی گا پیرۆزەکەیان دەبووا بۆ دۆزینەوەیێ گایێکی پیرۆزی نوێ هەوڵیان بدایە). میسرییەکان بەبۆنەیێ ئەم ڕووداوەوە باشترین جلوبەرگەکانیان لەبەرکرد و نوقمی شادی و خۆشحاڵی بوون. کەمبوجیە وەها تێگەیشتبوو کە لەتێشکاندنی ناوبراو لەشەڕدابووە بەهۆێ شادی میسرییەکان و بەبۆنەیێ ئەم خراپ تێگەیشتنەوە بەرپرسانی پولیسی شارەکەی بانگ کرد: و ووتی ئەم خەڵکە بۆچی پێشتر کردەوەیێ وەهایان نەبووە؟ ئەوانە وڵامیان دایەوە کەمیسرییەکان بەبۆنەی دۆزینەوەیێ خۆداوەندەکەیان خۆشحاڵی دەکەن و دۆزینەوەی وەها خۆدایێک هەرچەن ساڵ جارێک ڕێک ئەکەوێ. شاە پاش بیستنی وڵامەکان وتی ئێوەدرۆ دەکەن و سزای درۆ وێژ هەڵواسینە. پاش هەڵواسینی ئەوانە کە مبوجیە پێشەوا ئایینییەکانی بانگکرد و کاتێ هەمان وڵامی لەوانەش بیست، وتی ئاپیسم بۆ بهێنن. ئەوانە چوون بەدووایێ ئاپیس‌دا. ئاپیس مێ‌گوێلکێکی ڕەش و سێ‌گوشەیەکی سپی بەناوچاوانیەوە بوو. پشتی وەکو هەڵو و دوو تاڵ موو لەسەر کلکیەوە ڕوواوە و ژێرزمانی چاڵێکی بچووکی تێدایە. ئەم گێلکە پیرۆزە تەنیا یەکجار دەزێت و پاش‌ئەوە هیچکاتێک ئاوس نابێت، بەباوڕی میسرییەکان تیشکێکی ڕوناکی لەئاسمانەوە دەدا لەم مێ‌گوێلکە و بۆ یەکجار ئەزێت. ئاپیسیان هێنایە خزمەتی کەمبوجیە و ناوبراو وەکو شێت شمشێرەکەی دەرکیشا و ویستی بیکات بەزک ئەو بەسەزمانەدا کەبەر ڕانی کەوت. دووایی ڕوویکردە کاهینەکان و وتی بەڕاستی ئێوە مرۆڤی نزم و نەفامن: مەگەر خۆدا گۆشت و خوێنی هەیە؟ یان ئاسن کاری تێ دەکات؟. ئێوە خەریکن گاڵتەم پێدەکەن و ئەمە بۆ ئێوە تاوانێکی گرانە. پاش ئەوە ئەمری کرد کاهین فەلاقە بکەن و ئەۆمیسرییانە کە خەریکی شادی بوون دەس‌بەسەربکەن و بیانکوژن. وەهابوو ئاکامی ئەو شادییە و ئەمەیە

هەڵسوکەوتی پارسەکان لەگەڵ پێشوایانی ئایینیدا . بەڵام ئاپیس بەهۆی برینەکەی ڕانیەوە مرد و کاهینێک دوور لەچاوی کەمبوجیە لە چاڵێکدا ناشت . هەروەها کەمیسرییەکان ئەیژن کەمبوجیە پاش ئەم کارەی شێت بوو ، بەڵام ئەبی بێژین کە پێش لەوەش ژیرێکی ئەوتۆ نە بوو . (حسن پیرنیا ، ایران باستان ، جلد اول ، ل ٤٩٧)

نەپیرنیا ، نەگریشمەن و نە تەنانەت بریان وشەیەکیان دەربارەی ناسازگاری کەمبوجیە و یەهودییەکان نەنووسیوە ، بەڵام قسەکانی پیرنیا دەربارەی شێت بوونی کەمبوجیە لەزمانی هێرودێت و لە قاڵبی وەها چیرۆکێکی منداڵانە وێ مایە ڕووبەری چەندین لاپەڕەی دووایی داگیر کردووە . ئەگەر قسەکانی هێرودیت کە بە پەسن و ڕێزگرتن لەبنەماڵەی هخامەنشی ، مێژووی ڕۆژهەڵات و بەتایبەت ئێرانی دێرینەی پێوە تلاندوە ، بخەینە پشت گوێ ، بەبەڵگەیەکی بروا پێکراو دەگەین کە لەڕاستیدا کومبوجیە بە پێچەوانەی هێرودیت دەناسێنی .

دەربارەی کردەوەی کەمبوجیە لەمیسردا بەڵگەیەک لە کەسایەتیەکی میسری کەهاوتەمەنی کەمبوجیەبوو دۆزراوەتەوە ، ڕوونکراوەکەی لەواتیکان و لەبنکەی پاپاکانی ڕۆمایە کە پەیکەرێک لەکەسایەتییەکی میسرییە . ئەم کەسایەتییە شایەتی داگیرکردنی میسر لەلایەن کەمبوجیە بووە . پەیکەری ئاماژە پێکراو بەشێکی نووسراوەی هەیە کەژیانی خاوەن پەیکەرەکە و ڕووداوەکانی ئەوکاتەی میسر دەگێڕێتەوە و برگەیەک لەو نووسراوەیە دەربارەی کەمبوجیەیە . ئەم بەشە تەنیا بەڵگەیەکی تەواو لەسەرچاوەمیسرییەکان ، سەبارە ت بەداگیرکردنی میسر لەلایەن پارسەکانەوەیە . کەسایەتییەک کە باسی لێدەکەین ، وەکو خۆی ئەیژی : نێوی ئوجا گررسنت کوڕی سەرۆکی پەرەستنگەی گرای کودک ، کاهینی نیت و سەرۆکی سائیس بووە و نووسراوەکەی بەم جۆرە دەست پێدەکات : ئوجا گررسنت کە لەکن نیت دایە گەورەی خۆدایان و خۆدایانی سائیسی بەڕوومەتە ، شازادەبوونی ناوبراو بەپێی سیستەمی میراتبەری ، و هاوکاتی دەسەڵاتداریەتی ئامازیس ، پادشاهی میسری سەروو وخواروو و خەزێنەوانی پادشاهی و تاقانەی سەردەم و خۆشەویستی پادشاه و نووسەر و سەروکی نووسەرانی بارەگای پادشاه و سەروکی کۆشکی پادشاهی و سەرۆکی هێزی دەریایی پادشاه بوو . لەسەردەمی پادشاهی پسامتیکی سێهەم پادشاهی میسری سەروو و خواروو و پلەی سەرۆکایەتی بەلەمەکانی پادشای هەبووە و ئەڵێ : کاتێ کە کەمبوجیە پادشاهی مەزن ، پادشاهی هەموو وڵاتان هات بۆمیسر ، و خەڵکانی ئاسیای لەگەڵدا بوو ، بوو بەپادشای هەموو ڕووبەری ئەم وڵاتە . پادشاهی مەزنی میسر و دەسەڵاتداری بێوێنە و گەورەی هەموو وڵاتان . خاوەن شکۆ بەمنی فەرموو کە پلەی بەرزی پزیشکی کۆشکەکەی وەرگرم و لەخزمەتیدا سەرۆکی کۆشکی پادشاهی بم . من نازناو و چەمکەکانی پادشاه میسری سەروو و خوارووم بەنیوی بەرێزیانەوە ڕێکوپێک کرد . من لەگەڵ خاوەن شکۆ

مەزنایەتی سائیس کە بنکەی نیت، دایکی پلەبەرزی (را) یە ڕوشن کردەوە ئەم (را)یە ڕۆڵەی یەکەمی نیتە، چوونکە تا ئەوکاتە کۆرپەیەکی بەدنیا نە هێنابوو، هەموو ئەوانە کە دەربارەی مەزنایەتی جێگا و شوێنی نیت، واتا ئاسمان و گەورەیی پەرەستنگەیٚ ئەو و هەموو خوٚداوەندانی نیر و مێ، کە لە پەرەستنگەی ناوبراو وخات بیوتی بنکەیٚ پادشاهی ئاسمانەکان و هەروەها ئەوەیٚ کە پەیوەندی بەگەورەیی و پیرۆزبوونی شوێنی باکوورو باشووری پەرەستنگەی (را) و(ئاتون)ەوە هەیە، خاوەن شکۆم فێرکردووە. ئەمە نهێنی هەموو خوٚداوەندەکانە. من لە کەمبوجیە پادشاهی میسری سەروو وخواروو پاڕامەوە کە ئە وخەڵکانەیٚ ئاسیا کە لە پەرەستنگەکەی نیت دا نیشتەجێ بوون، نەهێڵێ، تا ئەم پەرستنگەیە شوێنی پیرۆزی دووبارە بەدەس بخاتەوە. خاوەن شکۆ ئەمری کرد ئەوانە لەپەرەستنگەکە وەدەرنێن و ئەوٚ خانووانە کە دوٚرستیان کردبوو، هەموویان کاول کرد و . . .کەی خوێیان لەپەرەستنگەکە لابرد. خاوەن شکۆ فەرمووی پەرەستنگەکە خاوێن بکەنەوە و زەلامەکانوکاهێنەکان بگەڕێنێنەوە. خاوەنشکۆ ئەمری کرد پێداویستی بۆ پەرەستنگەیٚ نیت. دایە گەورەیٚ هەموو خوٚداپانی گەورە کە لە سائیسدا هەیە بنێرن و، قوٚربانی بکەن ، و جەژنەکان بە ڕێوەبەن، هەروەها کە لەڕابوردوودا کردوویانە. خاوەنشکۆ بەوٚ بۆنەوە فەرمووی جەژنەکان بەرێوە ببەن کە من گەورەی سائیسم بۆ بەڕێزیان بەیان کرد و ووتم کە ئەمشارە بنکەیٚ هەموو خوٚداوەندانە وگشت خوٚداوەندان هەتا هەتایە لەم شارەدا لەسەر تەختەکانیان دانیشتوون. کاتێ کەمبوجیە پادشاە میسری سەروو و خواروگەیشتە سائیس، خودی خاوەن شکۆێن چووە نێو پەرەستنگەیٚ نیت و بە ڕانبەر بەگەورەیی نیت کەلەهەموویان گەورەترە، وەکوپادشاکانی میسرکەوتەخاک و کوڕنوشی کرد، پاش ئەوە بوٚڕیزگرتن لە نیتی مەزن، دایکی خوٚداوەندان کە لە سائیس نیشتەجێیە، هەمەجوٚر قوٚربانی پێش کەش کرد، هەروەها پادشاکانی پێش لەئەو دەیان کرد. (پیرنیا، ایران باستان، جلد اول، ل ٤-٢، ٥)

مێژوونووس دەیهەوی وتاری ئەم کاهێنە میسرییە لە وتارەکەیٚ هێرودیت کە بەڕەوشتی ئاسایی هێلێنستی دووبارە کەمبوجیە دەناسێنێ، بەباشتر بزانێت. بەمجوٚرە بەرگی دووهەمی مێژووی هخامەنشییەکانیش هەر یەهود دەێنووسێتەوە. جگەلەوەش کە لەبەرگی یەکەمداکورش ڕێ خوەشکەری یەهود لەڕۆژهەڵاتی ناوڕاستدا بوو و بەرپرسایەتی ئینسانی و تێکدانی شارستانیەتی مێزوپوٚتامیایٚ بەئەستوٚیە، لەتەوراتدا نازناوی"مەسێحی خوٚدا" وەردەگرێت و کەمبوجیە کە لە هێزی ڕوو بەزیادبوونی یەهودلەهەرێمەکە، لەئێران و لەبارەگایٚ هخامەنشییەکاندا دەبینێ بەپێ خوٚلقاندنی چیروٚکە ئەحمەقانەکەی گای ئاپیس لەلایێن هیرودیتەوە لەشێت زیاتر نێوێکی دیکە وەرناگرێت.

هەر لەم کاتەدا چیرۆکە هەمیشەییەکەی گایٚ ئاپیس لەلایەن کەمبوجیەوەشەوە، کەلەپشکنینەکانی سراپئوم ممفیس (گلکۆیٚ گاگەلی ئاپیس کە مومیائی کرابوون)، دەچێتە ژێر پرسیارێکی گوماناوی. لەڕاستیدا نووسراوەیٚ سەرگۆری ئاپیسەکەیٚ سەردەمی کەمبوجیە کە لەساڵی ٥٢٤ی پێش زایینیدا نێژراوە، دۆزراوەتەوە. لەئەم نووسراوەدا پادشایٚ پارسی بەجلوبەرگی میسرییەوە، لەحاڵێکدا کرنووشی کردووە و ئەژنۆیٚ لەزەوی داوە و وەکو "هوروس. پادشاهی میسری سەروو و خواروو" نێوی براوە، نیشان ئەدرێت. نووسراوەکە ئەیژیٚ: "(ساڵی)٦، سێیەمین مانگ لە وەرزی شمو، ڕۆژی، ١٠ بۆ سەردەمی خاوەن شکۆ پادشایٚ میسری سەروو و خواروو ... خاوەنی ژیانی هەتهەتایی، خوداوەندی کۆچ کردوو گوێزراێەوە لە (لە ئاشتی و هێمنی‌دا بۆ لایەنی ڕۆژئاوایٚ جوان و ڕندک و ئەو خوٚداوەندەیان لەگلکۆکەیدا حەوانەوە. لە (جێگاکەیٚ) کە خاوەن شکۆ بۆیٚ دۆرست کردبوو... هەموو ڕێگا و ڕەسمێک بەڕێوە چوو، و هەموو شتێک وەکو حەزو ئیرادەی خاوەن شکۆ لە تەلاری مومیائی‌دا بەئەنجام گەیشت.

ئاکام وەرگرتن، لەم ڕووەوە، ڕۆشن و بەرچاوە : **هێرودیت زانیاری درۆ و ناڕاستی بە دەستەوە داوە. کەمبوجیە نە تەنیا ئاپیسی گەنجی نەکوشتووە، بەڵکو لە ڕێگا و ڕەسمی مۆمیایی کردن و گواستنەوە و ناشتنی گایٚ ئاپیس‌دا وەکو نەریتی ئاسایی ئەوٚ سەردەمەیٚ زنجیرەیٚ شیت. بەشداریشی کردووە** . (بریان، مێژووی ئیمپراتوری هخامەنشیان، ل ١٥٧)

لەولاوە، کوڕەکەیٚ دیکەیٚ کورش، بەردیاش بەشێوەیەکی دیکە، ناکەوێتە شوێن نەقشە مێژوویەکانی کورش و یەهود. پرسی بەردیا لەڕەش‌ترین لاپەڕەکانی مێژووی هخامەنشییە و بەرپرسایەتی نەناسینی ئەوانە بەئەستۆیٚ داریوشە کە بەئەنقەس دەستی تێبردووە و شێواندوویە. داریوش بۆشاردنەوەی ئاژاوەگێرییەکانی لەنووسراوەکەیدا بە خراپ کردنی نێوی ەردیا هەڵدەستیٚ. لەگەڵ ئەوانەشدا خاڵێکی حاشا هەڵنەگر هەیە و ئەوەش شوێن نەکەوتنی ڕوشتە سیاسییە پڕ لەتوندی و تیژییەکانی بابیە. بەردیا لەبیری نوێ کردنەوەیٚ پەیوەندی لەگەڵ خەڵکانی ئێرانی دێرینە و مێزوپوتامیادا بووە. لەم حاڵەدا لەوانەیە کە ناوبراو تەنیا ئەندامی بنەماڵەیٚ هخامەنشی بزانین کەبیری لەبەسەرهاتی پەیوەندییەکانی هخامەنشی و یەهود کردووەتەوە و بوو قوربانی ئاژاوەگیریی یەهود و داریوش.

پێشتر پێویستە بکەوینە شوێن چیرۆکەکەیٚ هیرودیت. مێژوونووسی ناوبراو ئەیژێ : (کتێبی سێهەم، برگەی ٦٧ _ ٧٩): **سمردیسی موٚغ بە بیٚ کێشە پادشاهی کرد و لەم ماوەیەدا چاکەیٚ فراوانی لەگەڵ**

**شوێن کەوتووەکانی خۆیدا ئەنجام دا، بەڕادەیەک کە پاش کۆچکردنی هەموو خەڵکی ئاسیا، جگە لە پارسییەکان، لەو ڕێککەوتە خەمبار بوون.** باناگادار بین کە لەدەسپێکی پادشاهیەکەیدا هەموونەتەوەکانی بۆماوەیٚ سێ ساڵ لە زەکات و خەرج و باج و سەربازی بەخشی . (حسن پیرنیا ، ایران باستان ، ل ٥٢ )

تەنانەت هێرودیتش دان بەخۆشەویستی بەردیا لەنێوان نەتەوە بندەستەکاندا دەنێت ، چوونکە هێرودیت مێژوونووسی فۆرمی هخامەنشییەکانە و شیاو نەبوو کە بەلایەنە ئەرێنیەکانی کەسایەتی بەردیا بیر بکاتەوە . لەوانەیە بەو هۆوە ئەم ئیجازەیٚ بەخۆیٚ داوە کە داریوشیش ئاماژەی بەڕاستی خوشەویستی بەردیە لەنێو خەڵکدا کردووە .

داریوش شاە ئەڵێ : ئەو پادشاهییە کە لە بنەماڵەی ئیمە زەوتکرابوو وەکو جاران بەتەواوی نوێم کردەوە . ئەو پەرەستنگانە کە"موغ گائو ماتا" کاولی کردبوو من (هەروەها نوێم کردەوە) من لەوەڕگا و ئاژەڵ و کویلەکان لەگەڵ ئەو داراییانە کە گائوماتا لەوانی زەوت کردبوو . و لەڕاستیدا هی(خەڵک و ئەرتەش) بوو بۆ ئەوانم گەڕاندەوە . من خەڵکی ئێران ١ و مێدیا و وڵاتانی دیکەم وەکو جاران لەشوێنی خۆیاندا نیشتەجێ کرد .

**من هەرچی شتی زەوتکراو بوو هەمووم سەندەوە** . من ئەم کارەم بەیارمەتی ئەهورامەزدا ئەنجام دا . من لەگەڕانەوەیٚ ماڵی خۆمان بۆ شوێنی پێشوی سەرکەوتم بەدەس هێنا و نەمهێشت کە موغ"گائوماتا" ماڵەکەمان داگیر بکات . (داندامایف ، ایران در دوران نخستین پادشاهان هخامنشی ، ل ٣٤٥)

ئەمقسانەیٚ داریوش باسی ململانی بەردیا و گەورەپیاوانی هخامەنش و هەروەها گەڕانەوەیٚ بەشێک لە سامانی خەڵکی ئێرانی دێرینە دەکات . وەها هەبوونێک لەبەردیا لەمێژوودا بەڕوٚشنی دەیسەلمێنێت کە ناوبراو لەبیری تازەکردنەوەی پەیوەندی لەگەڵ خەڵکی هەرێمەکەدا بووە .

لەمڕووەوە ، کاتێک کەداریوش بەردیای کوٚشت ، هەروەها کە نووسراوەکەی بێستونیش ئاماژەیٚ بۆدەکات ، لەگەڵ پارس و مێدیا و وڵاتانی دیکەدا یەکی گرتبوو و ئومێدێکی تازەیٚ لەنێو نەتەوە سەرکوٚتکراوەکانی ئێراندا زیندوو کردبووەوە . زریانێک لەتووڕەیی و یاخی بوون لەسەرانسەر ئیمپراتوریدا دژی داریوش و هخامەنشییەکان ، تەنانەت لەفارس و ئانشان و بەتایبەت مێدیا و

١ بەداخەوە زۆرینەیٚ وەرگێرانی مێژوو ، لەهەموو شوێنێکدا وشەیٚ پارس بەشێوە ئاساییەکەی و بە ناڕاست ، بەئێران تەرجومەیان کردووەتەوە کە هەندێ جار لێکدانەوەیٚ وورد باسەکە لەواتا ڕاستەقینەکەیٚ لادەدات . ئەوانە واتایٚ هەنووکەیی دەستەواژەی پارس لەزمانەکانی دیکەدا ، کە بە وڵاتی ئێران ئاماژەدەکات . لەئەوپەڕی بێسەرنجییەوە پەیوەندی ئەدەن بە نووسراوەکانی ٢٥٠٠ساڵ پێش لەئێستا .

ئیلام و بابوڵدا سەری هەڵدابوو .

لەمێژوودا ئاشکرایە کە کمتر پادشاهێک لە سەرەتایَ پادشاهییەکەیدا لەگەڵ ئەوَ هەموو دژوارییەدا ڕووبەڕوو بوویتەوە کە داریوش تووشی بوو . با ئاماژەبەوەبکرێت کە دوور بوونی درێژخایەنی کەمبوجیە لەئێران کە چوارساڵی خایاند ، هەواڵیک کە لەنەبوونی ناوبراودا بڵاو بووەوە ، ڕاگە یاندنی پادشاهی بەردیا ناڕاست و ئەو کارانە کە لەماوەیَ حەفت مانگ بوَ ڕاکیشاندنی سەرنجی خەڵک ئەنجامی دا (وەکو بەخشینی زەکات و خەرج و باج و خزمەتی سەربازی) **لە دەسەڵاتی ناوەندی لەئەوَ وڵاتانە کە تازە بندەست کرابوون، کەم کردەوەو هەستی سەربەخویی و جیابوونەوەیَ هەڵخراند تا هەرکام لەوانە، لە ئێران جیا بینەوە و بوَحاڵەتی پێشوو بگەڕێنەوە.** (حسن پیرنیا ، ایران باستان ، جلد اول ، ل ۵۳۷ )

**ئەگەر لەتێکستی سەرەوەدا نێوی بەردیایَ ناڕاست بوَ بەردیایَ ڕاستین بگوَڕین ، هەموو لێکدانەوەکانی ئاغای پیرنیا هاودەقی ڕاستییە . بەردیا بووبوو بە هیوای نەتەوە بەدیلگیراوەکانی و پێدەچوو کە ئازادی بوَ ئەوانە بگیرێتەوە .**

**بەردیا و خێڵەکانی ئیمپراتوری** ـ "هیرودێت لەڕاگەیاندنی بڕیارێکی دیکەی اسمردیس/ بەردیا لەکاتی داگیرکردنی تەختی پادشاهیدا ئەمخاڵە دەرئەبڕیَ کە : **بەردیا پەیامی بوَ هەموو هوَزە بندەستەکانی ئیمپراتوری بەڕێکرد و لەوەدا بەخشینی سیَ ساڵ سەربازی و خەرج و باج و زکاتی بەوان ڕاگەیاند** . ئەم بڕیارە کە لەلاێن ژوستنەوە بە کردەوەیەکی فریودەرانە لێکدراوەتەوە (ک یەکەم ، ۹ ۱۲ ـ ۱۳) ، وەکو هێرودیت ئەڵی خوشەویستی و سەرنجی خەڵکی بوَ کەسایەتی اسمردیس ڕاکێشا . لەشوێنێکی دیکەدا (ک شەشەم ۵۹ ) هێرودیت ئاشکرایَ دەکات ، پادشاهێک کە لە "پارسدا" بوو بەپادشاە هەموو خەرج و باجی ڕابوردوی شارەکانی بەخشی بەڵام ئەم دوو بڕیارە دەربارەیَ بردیا ڕاست نییە ، چوونکە ئەوَ بەخشینی باجە دوواکەوتووەکانی وەکو خەڵاتێک بوَ شادمانی هاتنە سەرتەختی پادشاهی فەرمان نەداوە ، بەڵکو بوَ سیَساڵی داهاتوو بڕیاری لەسەر بەخشینی خەرج و باج و خزمەتی سەربازی دەرکرد . (پییر بریان تاریخ ئیمپراتوری هخامەنشیان ، جلد اول ، ل ۲۵۷ )

بەشی بەردیا و گەورەکانی پارسی لە کتێبەکەیَ بریاندا ، لە کوَمەڵیک لێکدانەوەیَ بەنرخ لەسەر ناڕاستی قسەکانی داریوش لەبێستوندا نووسراوە . پرسیارەکانی بریان ئەم باسە ئەخاتە بەردەس کە داریوش و هیرودیت لە تەماویکردنی ئەم ڕووپەلەی مێژوودا هاودەست بوون .

**بردییا/ اسمردیس و گئوماتا** ـ دەبینین کە لە ناسنامەیَ زەلامە یاخیبووەکەو مەرج و حاڵەتی

گەیشتن بەو تاج و تەختە ، تارماییەکی فراوان بەجێماوە. **هاو ئاسۆیی گشتی چیرۆکەکانی هێرودیت و داریوش خۆبەخۆ متمانە و دڵنیاییان لەگەڵدا نی‌یە**. لەڕاستیدا ئەمە دەزانین کە نووسراوەکەی بێستون کە بەفەرمانی داریوش نووسراوە (بند DB ٧٠) لە هەمو بەشەکانی ئیمپراتوریدا بڵاو بووەوە. ئایا چەمکێکی یونانی لەم نووسراوەدە بووە کە هێرودیت توانیبێتی بیخوێنێتەوە؟ **لە هەر حاڵێکدا هاو فیکری هێرودیت و داریوش هیچ شتێک ناسەلمێنێت و ئەم نیشانە ساکارە کە ژیانی داریوش بە چیرۆکەکانی خۆدی خۆی ڕۆشن بووەتەوە ,کە لێک گۆماناویە**. داریوش کە زۆر خولیای ئەوە بوو تاوەکو پادشاهێکی یاسایی، لەبنەماڵەیەکی هخامەنشییەوە (DBI ، ١-٤) سەر هەڵبدات. و وەکو بناغەدانەرێکی شەرعی زنجیرەیەکی پادشاهی خۆی نیشان بدات (DBI ، ١٤) و ئەمە لە هەر ڕوانگەیەکەوە بۆ داریوش سوودی هەبووە تا لەو سۆنگەوە لەسەر فەوتانی براکەی کەمبوجیە و درۆ وتن و فریوکاری گئوماتا پێ‌داگرێت. پادشاهی تازە دەتوانیت بەنەرمونیانی چیرۆکەکەخۆی (ک چوارەم، ٥٨) و عەشق و ئیمان و ڕاستی (ک چوارەم، ٦٤)ئەم دلنیاییانە لە هەرخوینەرێکدا کە پێشتر بە دوژمنی کلیشەیی ئەم جۆرە وتارانە ئاشنایی هەیە، دلنیایی پیک ناهێنی سەرەڕای ئەوەش دەبینرێت ئەو زانیاریانە کە لەم چیروکە هەیە لەگەڵ زانیاری چیروکەکانی دیکەدا هاوئاهەنگی نی‌یە. پیر بریان تاریخ ئیمپراتوری هخامجنشییان ل ٢٤٦ .)

**ئیمرۆ بۆهەر مێژوونووسێکی ئاگا، دیمەنی ئاژاوەکەی داریوش دژی ئاهەنگی سورشتی مێژووی خەڵکانی مێزوپۆتامیا و ئێران، کە کودتای پێ‌دەوترێ، بەڕادەیەک حاشاهەڵنەگرە کە تەنانەت بریانی خۆپارێزیش ناچار دەکات، بەردیا بەکوڕی ڕاستینی کورش بزانین، نەوەک بە ستمکار و داگیرکەری وڵات و سیستەمی پادشاهییەکی.**

دیارە کە پاش مەرگی کەمبوجیە، بەردیا، تەنیا پاشماوەی نێرینەی بنەماڵەی پادشاهی بوو. ئەو بەردیایە کە چەند مانگ یاخی بوو و وڵاتی لە دەسەڵاتدارە پێشووەکەی زەوت‌کردبوو. بەهەرحاڵ کاتێ کە هەواڵی مردنی کەمبوجیە بڵاو بووەوە بەردیا پادشاهی خۆی بەشێوەیەکی فۆرمی ڕاگەیاند؛ و بۆئەوەی کە شەرعیەتێکی زۆرتر بەکارەکەی بدات لەگەڵ هاوسەرانی پادشای پێشودا زەوجی؛ و لێرەوە دەرئەکەوێ کە بۆچی داریوش هەوڵی داوە کە زەوت‌کردنی فورمیی حکومەت لەلایێن بەردیاوە بۆ مێژوویەکی پێش لە مردنی کەمبوجیە بگوێزێتەوە.

**ناوبراو ویستوویە بەم پێشەکییانە پادشاهییەکەی بەردیا، کە دەیتووانی بەهۆی پەیوەندی بنەماڵەییەوە شەرعیەتی پێ بدات, بە داگیرکەر بناسێنی.** (بریان، تاریخ امپراتوری هخامەنشی، ل٢٥٢)

بەخۆشحاڵییەوە کتێبەکەی ئاغای شهبازی، کۆتایی بەباسی کەمبوجیە دەهێنی و و بەم بۆنەوە

دووبارەکردنەوەی نووسراوەکەی بێستون و تاوانبارکردنی دووبارەی بەردیا لەسەرشانی ئێمە لادەچێ. بەڵام گریشمەن دەربارەی ئەم چەرخە پرلەکێشە، کە بەسەرهاتی ئیمپراتوری و هاوئایینەکانی کۆنی دابین دەکرێ، ئیلا دووبارەکردنەوەی ئەوچیرۆکەسارد وسرانەی شێتبوونی کەمبوجیە و حیلکەی ئەسپەکەی داریوش نەبێ، شتێکی بۆوتن نییە.

ئیستا ئیتر دەتووانین بەئاکامی ئەوشتانە بگەین. سەرهەڵدانی گومانخراپی سەبارەت بەیەهود لەدەروونی کەمبوجیە و کاردانەوەی ناوبراو، سەرمایەدانانە فراوانەکەی یەهود و بەدەسەڵات گەیشتنی هخامەنشییەکانی خستبووە مەترسی. ئەم مژارە یەهودی بۆچارەسەری پرسەکە هەڵخراند. لەلایکی دیکەوە سرینەوەی کەمبوجیە دژواری یەهودی ئاسان نەکردەوە، چوونکە پاش مردنی کەمبوجیە، بەردیە بەشێوەیەکی سۆرشتی بوو بەپادشاە و ئەوەش لەخزمەتی هاوکاری نەتەوەیی و هەرێمیدا هەڵسوکەوتی دەکردکارێ کە لەوانە بوو ژووژانەوەی بابوڵ و دووبارە بوونەوەی سەر لێشێواوی یەهودی بەدوواوە ببوایە.

ڕەوتی ڕووداوەکان لەمخاڵەی مێژوودا بەمێژوونووس ئیجازەئەدات بیر بکاتەوە کە بۆچی کەمبوجیە و بەردیا بەپێچەوانەی وتەکانی داریوش و هێرودیت، لە هەڵبژاردنی سیاسەتێکی شیاوتر و ڕاوەستانی هاوکاری لەگەڵ یەهودا وە کو یەک بیریان کردووتەوە. چوونکە ئێمە شایەتی زۆرمان هەیە کە نیشانی ئەدە ن سەکردە کودەتاچیەکانی دژی بەردیا، پاش سەرکەوتنیان لەهەڵبژاردنی دێموکراسی زورتر و ڕەوشتی هێمنتر لەگەڵ نەتەوە بندەستەکاندا پێکەوە کێشەیان هەبووە.

ئەوکاتە سێ ڕوانگە بەرانبەر بەیەک ڕاوەستابوون کە بریتی بوون لە ئەتانس، مکابیز و داریوش.

یەکەم : دانانی ڕژیمێکی خەڵکی کە تێدا دەسەڵات بەدەس خەڵکەوە بێت.

دووهەم : دانانی سیستەمیکی ئەلیگارشی، بەو واتایە کە دەسەڵات بەدەس گروپێکی دیاری کراوەوە بێت.

سێهەم : ڕاگرتنی ڕژیمی پادشاهی. (بریان تاریخ امپراتوری هخامەنشیان، ل ٢٦٦)

سەرهەڵدانی گومانی وەها لەنێوان دەسەڵاتدارانی تازەدا ئاکامی سیاسەتی بەردیا نیشان ئەدات، کە تازەگەیشتووەکان بۆڕەوشتی ناوبراو ڕادەکێشێ. نیشانە مێژووییەکان دیسانەوە ئاماژە بەوە

دەکەن کە داریوش تەنیا دژبەری گۆڕینی ڕەوشت لەکردەوەی هاوڕێکانیدا بوو و وەکو ئەفسانە دەستکردەکەی هێرودیت ک (لەئورارتوییەکان قەرزی کردوە) ئەڵێ : بەپشکخستنی حیلکەی ئەسپەکەی دەسەڵاتی لە بەردیا سەندەوە . لەگەڵ ئەوانەشدا مێژوونووس دەتووانێ بێئەوەی وێنە ڕازاوە مێژووییەکان دەسکاری بکات یان نرخێکیان پێبدات، ئاکامی سەرکەوتنەکەی داریوش هەڵبسەنگێنێت وبەئاسانی بیسەلمێنێت کە پادشاهی داریوش تەنیا دەتووانێت ئاکام و بەرهەمی شورای یەهود بوویێت . چوونکە لەسەردەمی ناوبراودا شوێنەوارێک لەکردەوەی سەربەخۆ، لەوجۆرەی کەمبوجیە و بەردیا بەرانبەر بەیەهود شتێک نابینیرێت و ئەمە داریوشە کە وەکو کورش لەحاڵەتی سەرفرازیدا بەبڕینی گوێچکە و لوت و هەڵکوڵینی چاوی سەرکەردە سەربەخوییخوازەکانی ئێران و مێزوپۆتامیا خەمی ئاشتی و هێمنی یەهود و چاککردنەوەی ماڵی خوداوەند لەئورشلیمدا دەخوات!.

پاش ئەوە داریوش ئەم پەیامەی بۆ تتنای پارێزوان، حوشتر بوزنای و بەرپرسانی ڕۆژئاوای ڕووباری فورات کە هاودەسی ناوبراو بوون، بەڕێ کرد .

بریار بدەن دیسانەوە ماڵی خوداوەند لەشوێنە پێشووەکەیدا بینا بکرێت و **ئاستەنگ بۆ فەرمانداری یەهودا و ئەوسەرکردانە کە دەیانەوێ دەس بەکاری دۆرستکردنەوەی ماڵی خۆدا بین مە خوڵقێنن. بەڵکو بۆ پێشکەوتنی کاری بێوچان هەموو خەرجی پێویست بۆ بیناکە لە خەزێنەی پادشاهی، لەزەکاتێک کە لەلاێنی ڕۆژئاوای فۆرات کۆێ دەکەنەوە, تەرخان بکەن .** بەپێ داخوازی کاهێنەکانی ئورشلیم هەموورۆژێک گەنم، شەراو، ڕۆنی زەیتون، و هەروەها گا و بەران بەرخ ڕادەستیان بکەن تاکو بۆ ڕەزامەندی خوداوەندی ئاسمانی قوربانی پێشکەش و بۆ ساغیەتی پادشا و کوڕەکانی دوعا بکەن .

**هەرکەسێ ئەم بریارەێ من بگۆرێ دارقەواخێک لە داری بنمیچی ماڵەکەێ چاوەڕوانی دەکات و بەئەوەوە هەڵدەواسرێت و ماڵەکەێ دەکرێت بە زوڵڵدان.**

**هەر پادشاه و هەر هۆزێک ئەم فەرمانەم بگۆرێ و ماڵی خۆدا کاول بکات, ئەو خۆدایە کە شاری ئورشلیمی بۆشوێنی ماڵی خۆێ هەڵبژاردووە, ئەو کەسە بکوژێت. من, داریوش پادشاه, ئەم فەرمانەم دەربڕی, دووایی بەبێ دوواکەوتن پێک بهێنرێت.** (عهدعتیق، عزرا، ١٢ _ ٦ : ٦)

جارێکی تر هەروەها کە دەروازەکانی بابوڵ و هەمەدان، بەبێ شەڕ بۆکورش کرایەوە، دەروازەکانی شوش بۆ داریوش کەوتە سەر پشت و جارێکی دیکە مەزنێکی دیکە و دیسانیش لەهیچ سەری هەڵدا و وەکو مەزن

یەکەم لەنێو جەرگەی کارەساتە نەتەوەیی و هەرێمییەکاندا، ئەوانەی کەبناغەی جیگیر بوونیان لەمەترسیدا بوو، کەوتنە بەر تیشکی سەرنجی داریوش و ناوبراو بەبەراوردکردنی ئارەزووەکانی یەهود، بەرانبەر بە وەرگرتنی خەرجی ئیمپراتوریەکەی هەستا . !

ئایا پێویست بوو ئەم دەس بڵاوییەی داریوش وەکو ڕزگارکەرییەکەی کورش بەجوانمێری سۆرشتی ناوبراو بزانین، یا دۆرستتر ئەوەیە کە مەزنی نوێ بەگەڕانەوەی قەرزەکانی یەهود داینین؟ . داریوش کورشێکی دیکەیە کە یەهود لەڕۆژهەڵاتی ناوڕاستدا دەیکات بەخزمەتکاری خۆی، چوونکە هەروەها کەکورش مەترسی نەتەوەکانی دێرینی مێزوپۆتامیای لەدەور و بەری یەهود پژوبڵاو دووری خستەوە، داریوش لە کردەوەیەکی نەقشەداڕێژەرانەی بێوێنەدا، کە بێگومان نیشانەگەلێک لەبیر و کردەوەی یەهودی تێدا داییندەکرا، کەمبوجیە و بە ردیا کە دوو دژەری نوێ یەهود بوون، فەوتاند و دۆخەکەی بۆ خاڵێک گەڕانەوە کە کورش ١٥ساڵ پێش لەئەوّ داینابوو . ئایا نابێ بیرلەوە بکەینەوە کە کورش وداریوش قەیرانێکی وەها دژواریان تووش بوو بوو کەپاش گەیشتن بەدەسەڵات یەکەمین هەنگاوێان بۆ خاترجەمی یەهود هەڵگرت؟ . بەڕاستی ئەوانە چ قەرزدارییەکیان بەرانبەر بەهۆزێک و نەتەوەیەک هەبوو کە هیچ کەس نرخ و حیسابێکی بۆ ئەوانە نەدەکرد؟ .

خۆدای گەورە ئەهورامەزدایە، کە ئەم زەوینەی ئافراند، کە ئەوّ ئاسمانەی ئافراراند، کە مرۆڤی ئافراند، کەشادی ئافراند، کەداریوشی کرد بەشاە .

لەڕۆژهەڵاتی ناوڕاستدا کەشوێنی سەرهەڵدانی خۆداوەندانی بێئەژمارە و هەر بوونەوەرێک جێگاوشوێنێکی هەیە . نانا "خۆداوەندی مانگ" ، ئونو "خۆداوەندانی هەتاو" ، ئانو "خۆداوەندی ئاسمان" ، ئەنلیل "خۆداوەندی هەوا" ، ئانکی "خوداوەندی زەوین" ، مەردوک ، نبو و ئەوانەی دیکە، نووسراوەکەی بێستون خۆداوەندێک دەناسێنێت کە زۆر لەخۆدای یەهود دەچێ .

لەدەسپێکدا، کاتێ کە خۆدا ئاسمانەکان و زەوینی ئافراند، زەوین بەتاڵ و بێ قەبارەبوو . (عهد عتیق، سفر پیدایش، آیهٔ نخست)

یەهودە کە داریوش هەڵدەخرێنێت تا ڕاگەیاندنی سیاسی بێستون هەلکەنێ کە نە پێشینەیەکی

بووه و نه دووباره دەکرێتەوه . پیٚداگرتنی داریوش بۆ ڕۆشنکردنەوەیٚ ئه وکارانه کەکردوویه ، لەدەسپێکەوە تا کۆتاییەکەیٚ ، تەنیا لەبەرژەوەندی یەهوددا بووه که بەڵگەیٚەکه که بۆ پاساکردنی مێژوویی خوی لەدەس تێوەردانی لەهەرێمەکه و کۆشتنی کەمبوجیه و بەردیا پێویست بوو . بەرواڵەت داریوشه که لەفەوتانی نووسراوەکەیٚ بێستون دەترسیٚ و هەوڵی ئەوەئەدا که بەعدەو بەڵێن و خوٚف و ورياكردنەوه ، ئەوٚ نووسراوەیٚه بوٚ هەمیشه بپارێزێت ، بەڵام ڕاستیەکەیٚ ئەوەیٚه که ئەمه دڵەڕاوکی یەهووده لەو نووسراوەدا قسەدەکات .

داریوش شاه ئەیژی : تو که دووایی ئەم نووسراوەیٚ من و وێنەکانی دەبینی خراپیان مەکه و هەرچەن دەتووانی بیانپارێزه . داریوش شاه ئەڵیٚ : ئەگر تو ئەم نووسراوه و وێنەکانی ببینی و خراپیان نەکەی ، ئەهورامەزدا یارمەتی تو ئەدات . **بنەماڵە و نەوەکانت زۆر ئەبن ، تەمەنیان درێژ ئەبیٚ و ئەهورامەزدا کارەکانت بەپیت و بەرەکەت دەکات.** داریوش شاه ئەڵیٚ ئەگەر تو ئەم نووسراوەیٚه و وێنەکانی ببینی و خراپیان بکەی و تائەو جێگا که دەتووانی نەیٚانپارێزی ئەهورامەزدا زەرەرت لیٚ ئەدات و **بنه ماڵە و نەوەکانت دەفەوتێنی و هەر کاریٚ که دەیکەی کاولی دەکات.** (داریوش کتیبەی بێستون ستون ٤ بند١٥)

لەهیچ نووسراوەیٚەکی دیکەی هەرێمەکەدا بەم شێوه پاڕانەوه ، تکا بۆپاراستنی نووسراوەکان نەکراوه . نفرین و دوٚعایٚ خەیٚرخوازانەی نووسراوەکەیٚ بیستون لەنفرین و دوٚعاکانی تەورات دەچیٚ . ئاواتی "تەمەن درێژی" و "پیت و بەرەکەت" و "بەرەیٚ پڕدووایی" لە نموونە ناسراوەکانی تەورات و یەهودن که لەنووسراوەکەدا لکاندویانه بەخوٚاوەندە دەسکردەکەیٚ ئەهورامەزدەوه . تەنانەت هەڵبژاردنی سوووچێکی وەها هێمن و ژمێریاری بوٚکراو ، لەلایٚنی دیاردەی تێکنیکی و قایم‌کارییەوه ، لەگەڵ ڕەوشت و نەریتی داریوش و نیشانەکانی دیکەی نووسراوەکەدا یەک ناگرێتەوه ، تێکستی نووسراوەکه ، وڵامی ئەو پرسیارانە دەداتەوه که پرسیارکەرەکەیٚ نادیاره ، لەحاڵێکدا که نووسراوەکانی داریوش لە نەقشی ڕوٚستەم ، تەختی جەمشید ، شوش و هەمەداندا ، لەچەند ڕستەیٚ لەیەکچوو و ناڕوٚشن پێکهاتووه . ئامادەکاری بۆ ئەوٚ ڕاگەیٚاندنە پڕوپاگەندەبییه سیاسییه دوور و درێژه بۆ تازەپێاکەوتوویەکی نەیٚار که فەرهەنگ ، نەریت و پیتی نووسینی نی‌یه و هێشتا ئارەقی شەڕەکانی وشک نەبووەتەوه ، پرسیاری زۆری بەدوواوەیٚه .

هیچ یاساییەکی مروٚڤایەتی و تەنانەت چەکدارانەش لە وڵامدانەوەیٚ داریوش بەمێژوو ، له

نووسراوەکەی بیستوندا دەس ناکەوێ و سەرەڕای ئەوەش زۆر پەشۆکاو و نامرۆڤانە و بە ئامانجی سیاسییەوە ئامادە کراوە .

داریوش شاه ئەێژێ : بەیارمەتی ئەهورامەزدا ئەم نووسراوەم نووسی و جگەلەوەش بەزمانی ئاریاییش نووسرابوو، لەسەر ڕووپەلی گڵینە و چەرمیش نووسرا بوو . سەرەڕای ئەوە من پەیکەری خۆم دۆرست کرد و ڕەچەڵەک نامەیٰ خۆشم ئامادە کرد . ئەمانە هەموو نووسراون و بۆ من خوێندیانەوە . (داریوش ، نووسراوەیٰ بێستون ، ستون چهارم ، بند ۲۰)

بەم جۆرە داریوش تەنانەت لەنووسراوەکەش بێ ئاگا بووە . ئەوٚ نووسراوەیان بۆ نووسیووە ، پەیکەریان بۆ دورستکردووە و ئەوٚ تەنیا پەسەندی کردووە . نووسراوەکە ڕاشکاوانە هەوڵی داوە کە بەجلوبەرگیٚ پەسن و کرنوش تەنیا ناوبراو بەبەرپرس و سووچداری مێژوو بزانیٚ . سازکردنی وشە لەنووسراوەکەدا شێوە بیانێکی هەیە کە لەڕەسەنی فەرهەنگ نامە وقاموسێکی دارێژدراوە و ئەم شێوەیە لە نووسراوەکانی دیکەی ئەو سەردەمەدا نابینرێت . بێگومان "هخامەنش" شتێک وەکو " ئاریا مهر" دۆرستکراوەیٚ پێشینەیٚ مێژوویی بۆ داریوش و ڕەنگدانەوە و دەسخوەشانەیٚ ناوبراو بەیەهودە و دیسانەوە بەیەهودە کە داریوش بە "ئاریایی" نێو دەبات ، ئەوٚ وشانە کە بۆنی نازناوی بەفارسیکراوی تەوراتی لێدێت و بەئامانجی قنج کردنەوەیٚ داریوش و ناساندنی بەمێژوو ڕێکخراوە ، تا سازکەری سەرەکی ئاژاوەکە ، واتا یەهەود لەپشتییەوە خۆیٚ داشارێت . پێشتریش وتم کە "ئورمزدە" ، نازناوی خوٚداوەندی داریوشیش پێکهاتەیەکی درۆشاوەیە وشەخوڵقێنەرانی یەهود ، بەلاسایی کردنەوە لەباوڕەکانی ئاشوری لەناساندنی خوٚداوەندێکدا دۆرستیان کردووە کە گوٚایە وڵاتانی بەداریوش بەخشیووە .

داریوش ۱۲۰ دەسەڵاتداری بۆ هەموو وڵات دابین کرد تا بەڕێوەیەوە بیات . و سێ وەزیریشی

۱ ـ ڕەحمەتی شێخ محەممەد مەردوخ لە لاپەڕەی ۲۸ی کتێبەبەنرخەکەیٚ "مێژووی مەردوخ" چاپی نوێدا دەنووسیٚ : ئاری وشەیەکە پێکهاتوو لە ئار و ی ڕێژەیی . ئار لەزمانی کوردیدا کە لەگەڵ فورسی کۆندا لەیەک سەرچاوە و نیزیکی یەکترن ، بەواتایٚ ئاگرە . هەروەها ئایر بەیایٚ نادیار و ئاتو و ئەگر ، هەموویان لەزاراوە کوردییەکاندا واتایٚ ئاگریان هەیە و ئیستاش هەر بەم واتایە بەکار دەبرێن . لەزمانی فورسی کۆندا بەوٚ وشەیان وتووە : هار و هیر و ئازەر و ئەتر و ئەگر . هاو وێنەیٚ ئەم وشانە هەموویان لەمادەیٚ ئار جیا بوونەتەوە و واتایٚ ئاگر دەگەیێنن . کەوابوو ئار کە پێکهاتەیەک لە یایٚ ڕێژەییە ، واتاکەیٚ ئاگر و ئاگرپەرەستە و کۆیٚ ئەوە

ئەبێتە ئاریان، واتا ئاگرپەرەستەکان، چوونکە ئەم گروپە هەموو ئاگرپەرەست و سەرقاڵی ئاگربوون ... وشەیَ هاگویان کە لەکتێبی تەواریخی ئەیام، وەرزی پێنجەم، نیشانی دەهەمدا وتراوە، هەر لەم مادە و لەم یاسایە مایە دەگریَ و مەبەست کومەڵێک مروّڤی ئاگرپەرەستی غەیری سامی و دژبەری یەهود بووە. هاگریش کە بەعارەبی دەبێتە هاجەر هەمان نرخی هەیە.

ڕاوەستان لەسەر ئەم باسە گومانی زۆری بەدوواوەیە چوونکە ئەگەر ئاگرپەرەستیی مەبەستی جۆری زەردەشتییەکان بێت، نەیتووانیوە بەشێوەیەک خوّیَ لەگەڵ ژیانی ناوچەیی خەڵکانی باشووری ئێراندا هاودەق بکات کە گەرمی هەواکەی وەکو پێویست بووە بە هوّی ئازاری مروّڤ لەو شوێنەدا. ئەگەر دانیشتووانی چوّڵاییەکانی جیهان لەڕووی جووڵانەوەیَ مانگەوە کات لێک ئەدەنەوە بەوبوّنەوەیە کە هەڵسەنگاندنی هەتاو لەوّ شوێنانە کارێکی دژوارە و هەتاو بەهوّکارێکی هاوڕەوتی ژیان ناژمێردرێت. بەم جوّرە نەریتی خوّشەویستی ئاگر لەوانەیە هاوکاتی هێرشی هخامەنشییەکان لەئێستێپە سەردەکانی باشووری ڕوسیاوەهاتبێتە نێو خەڵکەوە، کەبەبونەی سەردی هەوای ئەوّهەرێمانەوە، ئاگر هەمیشە پێداویستییەکی ژیان و نیشانەی دەسەڵاتی هوّز بووە. و هەروەها بەبوّنەیَ کەڵکوەرگرتنی هەمیشەیی لەئاگر ئەوەیَ بو باوەڕێکی پیروّزی خێڵەکی لە نێوّکوّمەڵگادا گواستووەتەوە ولەدوّخی جوّغرافیایی تازەشدا ناسرێتەوە.

لەوانەیە نەریتی سەرەتایی ڕاگرتنی ئاگر لەنێوّ خێڵەکەیَ داریوشدا، بەبیَ هیچ پەیوەندییەک بەباوڕی زەردەشتییەوە بووبێتە هوّیَ ئەوە کە یەهود نازناوی ئاریایی، واتا پەرەستشکاری ئاگری بەداریوش بەخشیبێت. هەروەها دەتووانرێت وشەیَ ئاریا رەمەن کە نێوی پێکهاتووی باپیری داریوشە، «واتایَ"کوّگایَ ئاگر"بزانرێت و لەوانەیە هەر لەم ڕوانگەوە نێوی پێکهاتووی ئارشامی باپیرە گەورەی داریوش کە لەگەڵ ئاگردا بیَ پەیوەندی نییە، بەهاو وێنەیی"ئاگری دێرین" بزانرێت. واتایَ ڕاستەقینەی داریوش "دَرَیَوَش" بەوجوّرە کە باوە، خاوەنی هوّش نییە، بەڵکو نازناوێکی پێکهاتەییە کە لەتەک "دەریا سان" ڕێک دێتەوە. سازکردنی وەها فەرهەنگ و وەها پێکهاتەیەک لەکاتی خوّیدا بەگشتی نایاب، و هاوردەیەکە نەیار بوّ هەرێمەکە.

دەنگی نازناوی ئەو نێوانە وەکو نێوی خوّدی داریوش و یا هخامەنش کە داریوش بەمێژووی ناساندووە وەهایە کە ناتووانرێت لە ٧٠٠ساڵی پێش زایینیدا هەڵبژاردنی نێوێک لەلایێن باوکی خێڵێکەوە بوّ نەوەکەی دانرابێت. هەڵسەنگاندنێکی وورد وپشکێنەرانەیَ ئەوێنێوانە کە داریوش پێکیهێناوە، وەکو : ئاریا رەمەن، ئارشام، وێدافارنە، گئوبروە، بغابوخشە و ئوردومنش لەگەڵ نێوی ئانشانییەکانی، مرتیی، چین چەرخی، وەیزدات، چش پش، کەبوجیە و ئەوانەیَ دیکە، لەوانەیە ئەوەمان پیَ نیشان بدات کە هەموو، یان زوّربەیَ ئەوّ ٧ سەرکردە کە لەکودتاکەیَ دژی بەردیا «دا بەشدار بوون، بناغەدانەری ڕاستەقینەی هخامەنشییان ـ دەس نیشان کراوی یەهود لەنێوّ هوّزەکەی خوّیاندا بوون، کەبەنازناوی وێنەئێرانییەوە بەمێژوو ناسراون. پێویستە سەرنجی ئەوەش بدەین،

لەحاڵێکدا کە سنووردار بوونی وشەکان هەمیشە کەڵکوەرگرتن لەیەک تاکە ناو بەگۆڕاندنی ژمارەکانی کۆتایی، لەجیهانی کۆندا ناچاردەکرد، داریوش کۆگایەک جۆربەجۆر لەنێوە تێکڵاوەکان برژێنێنە نێو مێژووەوە کەهەموویان خاوەنی قۆرساییەکی دەوڵەمەندی فەرهەنگی بوون.

دابین‌کرد تا چاودێری کاری دەسەڵاتداران بکات و لەبەرژەوەندەکانی پادشا داکۆکی بکات. **زۆری نەخایاند کە دانیال بەبۆنەی لێزان بوونی تایبەتەوە لە وەزیران و نزیکانی شاە پێشکەوت و دوواییی پادشاە بریاری دا بەرێوەبەری کار و باری وڵات ڕادەستی ناوبراو بکەن**. (عهد عتیق، دانیال، ٤ ـ ١ : ٦)

**تاقیکردنەوەکەی کەمبوجیە، زانایان و بەرێوەبەرانی یەهودی یارمەتی دا کە پاش ئەوە بارەگای هخامەنشییەکان بگرنەژێر چاودێرییەکی هەمیشەیی و وریایی شێوی بەرێوەبەری ئەو دەسکردەی خۆیاندا بن. ئەمە نهێنییەکی ڕێکوپێکە کە لەدەسپێکەوە سێبەری خستبووە سەر ئەو ئیمپراتورییە و من پێشتر لەبارەیەوە دوابووم. (١) سەرەڕای هەموو ئەو هەوڵانە کە بۆ شاردنەوەی بەڵگەنامە نهێنییەکانی ئەوسەردەمە کە تاتاستی فەوتاندنی بەڵگە نەتەوەییەکان دراوە هێشتا بە یارمەتی تەورات دەتوانین لەگەڵ جەوهەری دەس‌تێوەردان و دەسەڵات‌نواندنی یەهود لەڕێکخراوەکانی هخامەنشی‌دا ئاشنا ببین.**

پاش‌ئەوە داریوش ئەم بانگەوازەی بۆ هەموو هۆزەکانی جیهان نووسی کە لەرەگەز و زمانە جۆربەجۆرەکان پێکهاتبوون. لەگەڵ سڵاوی فراواندا. **لەم ڕێگاوە فەرمان ئەدەم کە هەرکەس لە بەشێک لە پادشاهی من دا دەژیت، ئەبێ لە خۆاوەندی دانیال بترسێت و ڕیزی لێ بگرێت؛ چوونکە ئەو خۆداوەندی زیندوو و هەمیشەییە و دەسەڵاتی نزم نابێتەوە و کۆتایی پێ نایەت.** ئەوە کە ڕزگارو دەرباز دەکات. ئەوە کە موعجیزە دەکات و کارەساتیی سەرسووڕهێنەر لەئاسمان و زەویندا دەخوڵقێنێت ئەوە کە دانیالی لەژێر چنگی شێراندا دەربازکرد. بەم‌جۆرە دانیال لە سەردەمی پادشاهی داریوش و کورشی پارسی‌دا، سەرکەوتوو و کامران بوو. (عهد عتیق، دانیال، ٢٨ ـ ٢٥ :٦)

**ناوەڕۆکی ئەم‌بەشە لەتەورات وەها نیشانی‌ئەدات کە داریوش بەڵێنەکانی تەورات دووپات دەکاتەوە و یەهود بە هۆزی هەڵبژاردەی خۆداوەند دەناسێت. ئایا ناوبراو لەدەسپێکدا ئاینی موسای بەپیرۆز زانیووە و نەیویستووە ئاشکرای بکات؟ لەگەیشتنی داریوش بەپادشاهی تا سەرهەڵدانی**

١ ـ هاید ماری کۆخ ، لەزمانی داریوشەوە، سەرەتا . ئەگەر خۆمان بمانتووانیایە دەیان‌هەزار خشتی گڵینەی تەختی‌جەمشیدمان بخوێندبایەتەوە، بێگومان بەڵگەنامەی فراوان و پێویست بۆبەهێزبوونی ئەم‌باسەمان ئەدۆزیەوە.

ئەسکەندەر ، بارەگای هخامەنشییەکان بەبێ هیچ جۆرە شاردنەوەیەک لە ژێر چەوساندنەوەی تەواوی ناردراوەکانی خوداوەندی یەهوددا دەبینین کە ئامارەی سەرەوە نیشانەیەکی بچووک لەو شێوە چەوساندنەوەیە . سەرەڕای ئەوە کە زانایانی گەورەی یەهود لە تەوراتدا نووسراوەیان هەیە ، عزرا ، نحمیا ، مردخای ، دانیال و هەزاران ڕاوێژکاری بێناو و نیشانی دیکە و شاژن و پزیشک و ئەستێرەناس و جادوبازی یەهودیش وەکو ماڵی خۆیان بەڕێوەبەری بارەگاکەی هخامەنشییەکان بوون .

لەمانگی کیسلو ، لە بیستەمین ساڵی پادشاهی ئەردەشیر ، کاتێک لە کۆشکی شوش بووم ، یەکی لەبرا یەهودییەکانم بەنێوی حەنانی لەگەڵ چەند کەسی دیکەدا کە تازە لەسەرزەمینی یەهودەوە بۆ دیتنم هاتبوون ، هەندی پرسیارم دەربارەی کاروباری کەسانێک کە لە تاراوگە گەڕابوونەوە و دۆخی ئورشلیمم لێکردن . ئەوانە وڵامیان داوە : کە هەموویان ژیانێکی تەسکیان هەیە و بەڕەزالەت دەژین . دیواری شارەکە هێشتا کاول و ڕووخاوە و دەروازە سووتاوەکەی چاک نەکراوەتەوە . **لەو ڕۆژانەدا من بادەگێڕی پادشاە بووم .**

چوار مانگ پاشتر کاتێک جامە شراوێکم بە ئەردەشێر پێشکەش دەکرد پرسیاری لێکردم : بۆچی بەو ڕادەیە خەمناکی ؟ لەوە ناچێت کە نەخۆش بیت ، کەوابوو شتێک نارەحتی کردوویی . (تائەو ڕۆژە هیچ کاتێک پادشاە منی خەمناک نەدیبوو) ، منیش سەرم نەواند و گوتم : پادشاە هەتا هەتایە بژی ! کاتێک ئەو شارە کە باپیرانم تێدایا نێژراون ، کاول بووە و هەموو دەروازەکانی سووتاون چۆن دەتووانم خەمناک نەبم ! . پادشاە پرسیاری کرد داخوازت چییە ؟ ئەوکات خواوەندی ئاسمانەکانم دوعاکرد و وڵامم دایەوە : ئەگەر پادشاە لام لێبکاتەوە وبڕیار بدات و من بۆ سەرزەوینی یەهودا بەڕێبکات تاشاری باب و باپیرانم ئاوەدان بکەمەوە . لەحالێکدا کە شاژن لەتەنشتی پادشادا ڕوونیشتبوو ، بڕیاری ئەڕێنی بۆڕوویشتنم دەربڕی و پرسیاری کرد ، سەفەرەکەت چەن دەخایەنێ و چ کات دەگەڕیتەوە ؟

من کاتێکم بۆ گەڕانەوەم دابین کرد و وتم ئەگەر پادشاە بەباشی بزانێ ، دەسنووسێک بۆ دەسەڵاتدارانی ڕۆژئاوای ڕووباری فورات بنووسێت و ڕایانسپێرێت کە بۆدەربازبوون لە ناوچەکە یارمەتیم بدەن تا دەگەیمە سەرزەوینی یەهودا و ناملکەیەک بۆ ئاساف بەرپرسی دارستانەکانی پادشاهی بنووسێت و فەرمان بدات کە ناوبراو بۆچاککردنەوەی دەروازەکانی قەڵاکەی تەنشتی ماڵی خودا و دیوارەکەی ئورشلیم و ماڵەکەی خۆم دارو تەختەی پێویستمان پێشکەش بکات . **پادشا هەموو داخوازەکانی پەسەن کرد ،** چوونکە لەژێر دەستی خواوەندی مێهرەباندا بووم . کاتێک گەیشتمە ڕۆژئاوای ڕووباری فورات ، دەسنووسەکەی پادشاهم ڕادەستی دەسەڵاتداری ئەوشوێنە کرد . پێویستە ئەوەش بێژم کە پادشاە بۆ پاراستنی گیانی من ، چەن سەرکردەی سوپا و ژمارەیەک ئەسپ سواری دابین کردبوو . (عهد عتیق ، نحمیا ، ٩ _ ١ : ٢ _ ٣ _ ١ : ١) .

ئایا ئاشکراتر لەم بەڵگانە بۆسەلماندنی دەسەڵاتی یەهود لەبارەگای هخامەنشییەکاندا بخەینە بەردەس؟. لێرەشدا تەورات هەوڵی داوە سەردەمی داریوش بو مێژووی ئەردەشێر بگویزێتەوە، چوونکە دەزانین عزرا، نحمیا، مردخای، ئەستر و دانیال لەدیلەکانی بابوڵ بوون و لەم کاتەدا یادەگەردانی نحمیا لەبیستەمین ساڵی پادشاهی ئەردەشیر، هیچ نەبێ تەمەنی ۱۵۰ ساڵ بووە.

ژمارەیەکی زۆر لەو یەهودییانە کە نەبوکەد نەسر بەدیلی گرتبوونی و بۆبابوڵ گواسترابوونەوە، بۆیەهودا و ئورشلیم گەڕانەوە و هەرکەس چووەوە بۆ شوێنی لەداکبوونی خۆی. سەرکردەکانی یەهود لەم سەفەرەبەرییەدا بریتی بوون کە زروبابوڵ، یەهوشع، نحمیا، عزرا، نکمانی، مردخای، بلشان، مسفارت، بغوای، نحوم، بعنە. (عهد عتیق، نحمیا، ۷ ـ ٦ : ۷)

دەتوانرێت نموونەگەلی دیکە لە پێداگرتنە نائاساییەکەی تەورات بۆگواستنەوەی ڕووداوەکانی سەردەمی داریوش بۆپادشاهی خەشایار شاە وئەردەشێر، بهێنرێتەوە، کە دەسپێکی دەسەڵاتیان بەووردی سەد ساڵ پاش داریوشە و ئەگەر بمانەوێ ژیانی ئەوزەلام و ئافرەتانە کەگشتەکەیان لەدیلەکانی بابوڵ بوون، بەو جۆرە کە تەورات ڕاێسپاردووە، تاکاتی ئەردەشێر درێژە پێ بدەین، ئەوکاتە تەمەنی هەرکامەیان ۱٦۰ ساڵیش تێپەڕ دەکات.

ئەمەیە دەقی نامەکەی ئەردەشێر کە بۆعزرای کاهینی نووسیووەیە، لە ئەردەشێری پادشاوە، بۆ عزرای کاهین و زانای شەریعەتی خوداوەندی ئاسمان. لەمڕێگاوە فەرمان ئەدەم کەلەهەموو خەڵکی ئیسرائیل و پێشوایان و باوڕمەندانی موسا کە لەپانتایی وڵاتەکەم دەژین و دەیانەوێ لەگەڵ تۆدا بۆ ئورشلیم بگەڕێنەوە، تو لەلاین من و حەفت ڕاوێژکارەکەمەوە بۆ ئورشلیم و یەهودا دەنێردریت تا لەسەر بناغەی یاسای خوداوەندت کاروباری خەڵکی ئەو شوێنە هەڵسەنگێنی. لەپاڵ ئەوەشدا زێر و زیوی پیشکەشی ئێمە و ئەو ڕادەیە کە خەڵکی بابوڵ پێشکەشی دەکەن، لەگەڵ پێشکەشی کاهینان و یەهودییەکان بەماڵی خودا، بۆ ئورشلیم ڕاگویزە. (عهد عتیق، عزرا، ١٦ ـ ١١ : ۷)

هەروەهایە هێنانی نێوی مردخای و ئەستر کە شاژنی بارەگای داریوشە، تەورات دەیکات بە پیرەژنێکی ۱۲۰ ساڵ تەمەن و دەیبەخشێ بە خەشایار شاە و دەسەڵاتی مردخاش هەر بەو خشایار شاە بۆ هەموو دانشیتووانی پانتایی وڵاتەکەی کە سنوورەکەی تاکەنارەکانی دوورەدەستی تێپەڕ دەکرد جەزیبەی دابین کردبوو. دەسەڵات و مەزنی کارەکانی خشایار شاە و هەروەها ڕۆشنکردنەوەی تەواوی دەهێزبوونی مردخای و پلە و دەرەجەی کە شاە پێی بەخشیبوو لەکتێبی مێژووی پادشاکانی پارس و مێدیادا نووسراون.

پاش خشایارشاه مردخای یەهودی پرهێزترین کەسایەتی وڵات بوو. ناوبراو بۆ هێمنی و خوەش‌گوزەرانی هۆزەکەی هەرچ پێویست بوو و توانی ئەنجامی دا و یە هودییەکان خۆشیان دەهێانویست (عهد عتیق، استر، ٣ ـ ١ : ١٠)

دەورەوە دەلکێنیێ. ئایا ئەم‌هەمووپێداگرتنە بەئەنقەسەیێ تەورات لەگواستنەوەیێ ڕووداوەکانی سەردەمی داریوشە چۆن پاساو دەکرێت؟ ئەگەر تەورات وەها ڕاشکاوانە ڕاستییەکانی سەردەمی یەکەمین پادشاکانی هخامەنشی دەگۆڕی، لەبەر ئەوەیە کە بە پێچەوانەی ڕوانگەکانی ڕۆژهەڵاتناسان، هەموو پەیوەندییەکانی هخامەنشی و یەهود "سیاسی" بووە نەک "ئیلاهی" و "ئیخلاقی". تەورات وێنەیەک لەدەسەڵاتی یە هود بەسەر بارەگایێ هخامەنشیدا نیشان ئەدات کە بۆ بەشی کۆتایی ئەم نووسراوە باسێکی هروژێنەرە لە ئاکامی دەسەڵاتی هۆزێکی نەیاە کە لەژێر نێوی ئێراندا سێبەری ڕەشی‌خستووتە سەر مێژووی ئێرانی دێرینەدا و ئەو نەتەوانە کەهەمیشە خولیای هونەر و پیشە بوونە و لەم بوارەدا پێشبرکیان دەکرد، تووشی وەها بەسەرهاتێک بوون کە تا هەنووکەش هەر بەتاسۆخی ئازادی و تامازرۆیی گەڕانەوە بۆ سەردەمی سەربەخوییین.

یەهودییەک لەشوش کەنێوی مردخای (کوڕی یائیر و نوع شمعی، لەنەوەکانی قیسی بنیامینی) دەژیا. کاتی نەبوکەد نەسر، پادشاە بابوڵ، کۆمەڵێک یەهودی لەگەڵ یکنیا پادشاە یەهود لە ئورشلیمدا بەدیلی گرت، مردخایش لەڕیزی دیلەکاندا بوو. ناوبراو کچەمامێکی قەشەنگی بە نێوی هدسەیێ هەبوو (کچی ابیحایل) کە استریشیان پێدەگوت. دایک و بابی استرکۆچیان کردبوو و مردخای وکو کچی خۆیێ لەگەڵیدا هەڵوکەوتی دەکر و گەورەیێ کردبوو... ئەوکاتە خشایار شاە بە شاژن استر و مردخای ووت من فەرمانی هەڵواسینی هامانم دا چوونکە دەیویست ئێوەی یەهود بفەوتێنی. هەروها ماڵ و سامانەکەیم بەشاژن استر بەخشی بەڵام ناکرێت ئەوفەرمانە کە بەمۆری پادشاهی مۆرکرا بەتاڵ بکرێتەوە. ئێوە دەتووانن فەرمانێکی دیکە بەنێوی پادشاوە بنووسن کە ڕەنگدانەوەی داخوازەکانی خۆتان بێت و بەموسیلەکەی پادشاە مۆری بکەن، و بۆ یەهودییەکانی بەڕیێ بکەن. ڕۆژی بیست‌وسێهەمی مانگی سێهەم واتا مانگی سێوان بوو. بەپەلە نووسەرەکانی بارەگایان بانگێش کرد و فەرمانەکەیێ مردخایان نووسی. ئەم فەرمانە ڕووی دەمی کردبوو لەیەهودییەکان، دەسەڵاتداران، و بەرپرسانی ١٢٧ پارێزگایێ وڵات، لەهێندەوە تاحەبەشە. و بەپیتی باوی وڵات و هەروەها بەپیتی یەهودی نووسرابوو. مردخای فەرمانەکەیێ بەنێوی خشایارشاوە نووسی و بەموسیلەیێ تایبەتی پادشاە مۆری کردبوو و سپاردیە دەستی نامەبەرانێک کە ئەسپی چالاک و تیژڕەویان هەبوو و بۆ هەموو وڵات بەرێکران.

پادشاه لەم فەرمانەدا بە هەموو یەهودییەکانی وڵات ئیجازەیٚ ئەدا کە بۆ داکۆکی لەخۆیان و بنەماڵەکانیان یەکبگرن و **هەموو نەیارییانیان بکوژن، بیٚ ئەوەیٚ بیر لەوە بکەنەوە کە ئەندامی چ هۆز و نەتەوەیەکن**" . یەهودییەکان لە هەموو وڵاتدا کۆبوونەوە تا پەلاماری کەسانێک بدەن کە مەبەستیان ئازاردانی یەهودییەکانیان لەسەردا بوو . **هەموو خەڵک لە یەهودییەکان دەترسان و نەیاندەوێرا بەرهەڵستیان بینەوە** . گشت دەسەڵاتداران و بەرپرسانی پارێزگەکان و کەسایەتییەکانی بارگایٚ هخامەنشی لە مردخای دەترسان و بەوٚ بۆنەوە یارمەتی یەهودییەکانیان ئەدا ، چوونکە مردخای بۆ بەکەسایەتییەکی بروا پێکراوی بارەگاکەیٚ شاه و ناونیشانێکی بەرزی لەسەرانسەری وڵاتدا بەدەستهێنا و ڕۆژ لە دووایٚ ڕۆژ پرهێزتر دەبوو . **بەم جۆرە یەهودییەکان هێرشی نەیارانی خۆیان ئەدا و ئەوانەیان لە دەمی شمشێرەوە دەرباز دەکرد و دەیانکوشتن** . ئەوانە لەشاری شوشدا ٥٠٠ کەسیان کوشت . . . لەوڕۆژەدا پادشایان لە ژمارەیٚ کوژراوەکان ئاگادار کرد . پاش ئەوە پادشا ، شاژن استری بانگیش کرد و وتی یەهودییەکان تەنیا لەپاتەختدا ٥٠٠ کەسیان کوشتووە کە ١٠ کوڕەکەیٚ هامانیش لەنێو کوژراوەکانددایە ، ئاخۆ لەشارەکانی دیکەدا چییان کردبێت! . ئایا داخوازێکی دیکەت هەیە؟ **هەرشتێک داخوازەکەیٚ بەتۆیٚ دەبەخشم. بێژە داخوازت چییە. استر وتی؛ ئەگەر پادشاه بەباشی بزانیٚ، ئیجازە بدات کە یەهودییەکان ئەو کارە کە ئەمڕۆ لە پاتەخت کردیان ، سبەش دووپاتی بکەنەوە و کەلاکی ١٠ کوڕەکەیٚ هامانیش هەڵواسن .** پادشاه ئەم داخوازەیٚ شاژنی پەسەند کرد و لەم بارەوە فەرمانێکی لەشوشدا بڵاوکردەوە . کەلاکی کوڕەکانی هامانیش هەڵواسرا و **ڕۆژی دووایی یەهودییەکان لە پاتەختدا کۆبوونەوە و دیسانەوە ٣٠٠ کەسی دیکەیان کوشت** . بەڵام دەسدرێژیان بەماڵ و سامانی کەس نەکرد . یەهودییەکانی دانیشتووی پارێزگەکانی دیکەش کۆبوونەوە و لەخۆیان داکۆکییان کرد . ئەوانە ٧٥٠٠٠ کەس لەنەیارانی خۆیانیان کوشت و لەشەڕیان خەلاس بوون ، بەڵام ماڵ و سامانەکەیانیان تاڵان نەکرد . ئەم کارە لەڕۆژی سێزدەیٚ مانگی ئادار دا ئەنجام درا و ڕۆژی چواردەیٚ ئادار بەبۆنەیٚ سەرکەوتنەکەیانەوە ئاهەنگێکی پڕ لەشادی و خۆشییان گێڕا . **بەڵام یەهودییەکانی شوش ئەوٚ ئاهەنگەیان لە ڕۆژی پازدەهەمدا بەڕێوە برد ، چوونکە ڕۆژی سێزدە و چواردە سەرقاڵی کوشتنی دوژمنەکانیان بوون** .لەگەڵ ئەوەشدا ، شاژن استر بەهەمووهێزیەوە پشتیووانی لەنامەکەیٚ مردخای ، دەربارەیٚ ڕاپورتی هەمیشەیی ڕێگا و ڕەسمی (پوریوم)= ؟ دەکرد . سەرەڕایٚ ئەوە بۆ یەهودییەکانی ١٢٧پارێزگەیٚ وڵاتی پارس دەسنووسی دڵخۆشکەری نووسی تا بەرانبەر بەفەرمانەکەیٚ مردخای یەهودی و شاژن استر بەڕۆژو بن و نەریتی ماتەمینی ئەوٚ ڕۆژانە بەجیٚ بهێنن . بەم جۆرە ڕێگا و ڕەسمی ڕۆژانی

پوریوم ، بەفەرمانی استر پشتیووانی کراو لەمێژووی یەهوددا تاپۆکرا . (عهد عتیق، استر، ٧ ـ ٤ : ٢ ، ١١ ـ ٧ : ٨ ، ٧ ـ ٢ : ٩ : ١٨ ، ٩ : ١٠ ـ ١٠ : ٩ ، ٣٢ ـ ٢٨ : ٩)

ئەم ڕووداوەیٚ تەوراتیش ڕووداوەکانی کۆتایی سەردەمی پادشاهی خشایار شاه دەگەیەنیٚ و دەیسەلمێنێت کەنادورستە چوونکە دەزانین کە مردخای لەڕیزی دیلەکانی بابۆل بووە. ئورشلیم لەساڵی ٥٨٦ی پێش‌زاینی‌دا ڕووخا و پادشاهی خشایار شاه لەساڵی ٤٦٥دا ، واتا ١٢١ ساڵ پاش سەرکەوتنی نەبوکەد نەسر کۆتایی پێهات ، بەم‌جۆرە ئەگەر وابزانین کەمردخای لە دەسپێکی بەدیل‌گرتنەکەیدا تەمەنی ٩ ساڵ بوویێت ، لەکۆتایی پادشاهی خشایارشادا پیرەمێردێکی ١٣٠ ساڵە بووە کە لەگەڵ ڕوونکردنەوەکەی تەوراتدا یەک ناگرێتەوە . بەڵام ئەگەر کاتی قۆمینی ئەو ڕووداوانە کە تەورات نێویان ئەبات لەڕاستیدا بەسەردەمی پادشاهی داریوشەوە گریٚ‌بدەین ، ئەوٚ کاتەگریٚ‌کوێرەیەکی دیکە لەمێژووی هخامەنشییەکان دەکرێتەوە و ئەوە ئەوٚ ئامازەیە کە بەموٚغ کوشتن لەدەسپێکی پادشاهی داریوشدا بەناوبانگە .

ئەوٚ کاتەکەوتەڕیٚ و هەر موٚغێکیان دەس‌بکەوتایە هەمان‌دەم دەیانکوشت . پارسەکانی دیکە کەئاگاداری کارەپاڵەوانانەکەیٚ ئەوٚ حەوت هاوڕێیە (٧ ترووریستە هاودەسەکەیٚ داریوش ـ وەرگێر) بوون و لەفێڵی کە دوو برا موٚغەکە دژی ئەوانە ئاگادار بوون ، بەپەلە کەوتنە شوێنیان و خنجەر بەدەس هەر موٚغێکیان بەرچاو بکەوتبایە خەێرا دەیانکوشت و ئەگەر خوٚەر ئاوا نەبووایە ئەوٚ کوشتارە نەدەهاتە ڕاوەستان . چینی موٚغەکان بەگشتی لە فەوتاندا بوون . لەساڵژمێری پارسەکانداڕوٚژی ڕووداوی ئەوٚ ڕووداوەیان بە هێڵی سوور دیاریکراوە و هەموساڵیک بەم بوٚنەوە جەژن و شادی ڕێک دەخەن و نێوی موٚغ‌کوژییان بوٚ داناوە کە هێچ موٚغێک لەوٚ ڕوٚژەدا ناوێری لە ماڵەکەیٚ سەر دەربهێنیٚ . (مری بویس ، تاریخ کیش زردشت ، ل ١٣١)

چما ناتووانرێت جەژنی موٚغ‌کوشتن لەسەردەمی داریوش‌دا ، بەدیمەنی دوژمن‌کوژی یەهود و جەژنی پوریوم لە تەوراتدا وەکو یەک هەلسەنگێردرێت؟ ئایا دەنووانرێت ئەم ڕووداوە بە دووا یەک‌لاکردنەوەیٚ سەرانسەری دژبەرەکانی سەردەمی کەمبوجیە ، بەرانبەر بەتەشنە سەندنی یەهود لەبارەگایٚ هخامەنشییەکاندا بزانرێت کە بیریان لەبەهێزبوونی یەهود و ئاکامی ئەو مترسییانە دەکردەوە؟ . ئەگەر دان بەوەها داکوٚکییەکدا بنین ، ئاسایە کە ئەوانە ئاڵاهەڵگری چەن‌لاین پەرەستی ئێرانی کوٚن بوویێتن کە مێژوو بە موٚغ دەیانناسێنێت . (١) ئێستا جارێکی دیکە دەگەڕینەوە بوٚ یەکەمین‌بەشی ڕستەیٚ کوٚتایی ئەم کتێبە : بەواتایەک مێژووی

هخامەنشییەکان ڕووپەلێکی تازە لەمێژووی یەهودییەکانە و ئەگەر هخامەنشییەکان بەیەکی لەاسباطەکان بزانین، زۆر ئاساییە و لەو بۆچوونە داکۆکی دەکەم: یەهود لەدەروونی دەسەڵاتخوازی، بێناسنامەیی، بێفەرهەنگ وخوێنڕێژی هۆزێکی سەرلێشێواو و بێناو نیشان سوودی وەرگرت، بەپشتیووانی مادی و عەقلی لەوانە، بۆ پلەی بناغەدانەرانی ئیمپراتورییەک هەڵیکێشان، پاش ئەوە بەدەستی ئەوانە و بەقازانجی خۆیان شارستانیەتی مێزوپۆتامیای ژێرمەند و شارستانیەتی لەحاڵی گەشەکردنی ئێرانی دێرینەیان ڕەش کردەوە، تا ئاسایش و هێمنی بێبەدیلی پەرەستنگەکانیان دابین بکەن. ئەم تاکتیکە پارێزکارانەی یەهود جێگای سەرکۆنە کردن نییە و تەنیا ئەوەی کە یەهود بە مێژوونووسینە ناڕاست و دێرینەپرسانە بەئامانجە سیاسییە ناپاکەکانیەوە کە ئەنجامی داوە، یەهود بەشیاوی ڕەخنەوسەرکۆنەکردن دەزانێ، کە بە دووبارەسازکردنی پڕلە ڕق و قینی مێژووی ڕۆژهەڵاتی ناوڕاست بووەتە بەرگر لەچاکبوونەوەی پەیوەندی نێوان خەڵکی ئێران و مێزوپۆتامیا و پەرەسەندنی ناسیونالیسمی بەتەواوی بێڕیشە و شێوە چیرۆک لەئێران و خۆبەزلزانینی دوور لەژێرمەندی نەتەوەیی کە بە دوژمنی کردنی عارەب و[1] ئیسلام دیمەنی خۆی دەنوێنێ و ئاکامەکەی جیاوازی و دڵەڕاوکی لەنێوان ڕوشنبیرانی نەزان و جەماوەری ئێمەدا بەزەقی دیارە و بەمزووییە و لەدۆخی ئیستادا بۆحاڵە ئاساییەکەی ناگەڕێتەوە.

١ ـ لەمبارەوە هەڵسەنگاندنێکی بەربڵاو پێویستە تا ڕۆشن بێتەوە کە دەسەڵاتی یەهود لەباری سیاسی، ئابووری و فەرهەنگی نەتەوەیی بەسەر بارگای هخامەنشیی سەردەمی پادشاهی داریوش‌دا گەیشتووتە ڕادەیەکی بەرز. و هەروەها کە تەورات ڕایدەگەیەنێ، یەهودییەکان، سەرکردە سەربەخویی خوازەکانی ئێران، واتا دژبەرەکانی یەهودیان، بەفەرمان و ئیجازەی داریوش دەکوشت. لەو حاڵەدا و کاتی پادشاهی داریوش کە چرای فەرهەنگ و عەقڵ و نەتوایەتی: لەمێزوپۆتامیا و ئێراندا بە قازانجی هێز و دەسەڵاتی یەهود کوژاوەتەوە و ئەو دەسەڵاتە ڕەشە هێشتا هەر لەژیانداییە.

# ئاکام :

١ ـ هۆزێک کە بەڕاسپاردە و پشتیووانی یەهود کە بەنێوی هخامەنش لەمێژووی ئێراندا سەری هەڵدا، بەگوێرەی سەدان بەڵگە کە بیٚلایێنانە ، شی‌کراوەتەوە بەهیچ شێوەیەک ئێرانی نەبوونە و لەوانەیە پێویست بکات کە ئەوانە بە تەنیا خێڵی کۆچەری دەرەوەیی و نەناسراوە لەهەرێمەکەدا بزانین کە دەور و بەری ٦٥٠ی پێش‌زاینی و ڕاستتری ئەوەیە کەبێژین ماوەیەکی کورتپێش لە ڕووخانی بابوڵ، کۆچبەری مێزوپۆتامیا بوون و پاشتر هاتنە نێو ئێرانەوە .

٢ ـ خراپترین حاڵەت ئەوەیە کە بەگوێرەیٚ گریمانەکان، هاتنی ئەوانە بۆبەرزاییەکانی ئێران، هەروەها کە بڵاوٚ بووەتەوە، بە دەسپێکی هەزارەیٚ یەکەمی پێش زاینی بزانین. چوونکە لەم کاتەدا خێڵێکی وەها بیٚڕەگ‌وڕیشە لەهەرێمەکەدا سەری هەڵداوە کە بۆماوەیٚ ٤٥٠ ساڵ بۆ نیشتەجیٚ بوون لەشوێنێکی سەربەخۆدا، نە سەرکەوتنیان بەدەس‌هێنا و نە نیشانەیەکی مادی ژیان و فەرهەنگی کۆمەڵایەتی. لەپاشماوە هونەری و مادییەکانی ئێرانی دێرینەیٚ پێش لە هخامەنشییەکان، هیچ نموونە وئاسەوارێکی مادی، فەرهەنگی و هونەریمان نەبینیەوە کە بتووانین نێوی هخامەنشی لەسەر دابنین.

٣ ـ سەرهەڵدانی کوتوپڕی و یەک‌شەوەیٚ ئەوانە لەگەڵ پەرژوبڵاوی و هەبوونی پرهێزی یەهود لەئێراندا هاوکاتە. بەرهەمی پشتیووانی لەم هۆزە، سەرهەڵدانی بەپەلەی و بیٚپێشەکی ئیمپراتورییەکی خوێن‌ڕێژە کە لەنێو خەڵکانی ڕۆژهەڵاتی ناوڕاستدا، تەنیا و تەنیا یەهود لەژێر ناوی ڕزگارکەردا یادی لێکردوون.

٤ ـ تایبەتمەندی بیٚبەرپرسانەیٚ ئەم خێڵە، کە پەیوەندی بەشارستانیەتی هەرێمەکە و خەڵکی ئێرانی دێرینەوە نی‌یە، لەناسینی فەرهەنگی تایبەتی مێزوپۆتامیا بیٚبەرییە، یەهودی سەرلیٚشێواو

کەسامان و مێژووکەیان بە دەستی ئیمپراتورانی مێزوپۆتامیا هەڵپێچرابوو، هەڵخراند کەسەردارێک لەنێوان هخامەنشییەکاندا بەهێزبکات و بەدەستی وەهاسەردارێک تۆڵەی تێکشکاندنی خۆی لە شارستانیەتەکانی مێزوپۆتامیا کردەوە و ڕێگای گەڕانەوەی بۆئورشلیم هەموار کرد. ئەوانە پاش هاودڵی تەواو لەگەڵ کورشدا. کە هێشتاشوێنی سەرهەڵدانەکەی نازانین، کۆمەڵێک بەڵگەنامەیان دەربارەی ئەم هاودڵییەوە خستەبەردەس و بۆ دڵخوەش کردنی نەتەوەی یەهودی کویلە، وەکو بەڵێنی خۆدای گەورە مزگێنی ئازادیی پێدان و وەکو بەشێک خستیانە سەر دەستورەکانی تەورات. ئەم بەشە ئیتر سرانەوەی بۆ نەبوو و ئەمە بۆ مێژوو نووسی ئیستا شانسێکی شیاوە کە وێنەیەکی ڕاستەقینەتر لەسەرهەڵدانی هخامەنشییەکان لەڕۆژ هەڵاتی ناوڕاستدا دەرەخسێنێت.

٥ ـ ڕواڵەتی بەربڵاوی فەرهەنگی ئەم هۆزە، پاش سەرکەوتن، نیشانەی بیروبۆچوونێکی باش و جیاوازتر دەخاتە بەرچاو کە هۆکارە لاوکییەکانی قایم‌بوونی ئەم دەسەڵاتە چاوەڕوان نەکراوە دەهێنێتەوە بیریان. هەم گڵە نووسراوەکە کورش لەبابۆل، و هەم نووسراوەکەی داریوش لەبێستوندا و هەم دوو نووسراوە سەختەکارانەکەی ئارشام وئاریاڕەمنە وهەم دێرە ژێرنووسە سەختەکانی پاسارگاد، هەموویان لەخزمەتی خویی نیشاندانی هێزێکی نامۆ کەڵکیان لێوەرگیراوە.

چۆنە کە هۆزێکی بێ‌ناونیشانی ڕاستەقینە، پاش سەرهەڵدانی ئەم هەمو پێداویستییەی بە دووپاتکردنەوەی خۆی هەیە؟ وڵام تەنیا ئەمەیە، کەئامادەکاری ئەم‌هەموو فرەوێژییە زۆرەملییە، خۆلقاندنی تارماییەکی ڕەشە تا کەسێکی دیکە لەپشتیەوە خۆی داشاری : هۆزی یەهود!.

٦ ـ شارستانیەتی یەکجار دروشاوەی مێزوپۆتامیا کە سەرچاوە و کانی شارستانیەتی مرۆڤایەتییە، بە دەستی هخامەنشییەکان کاول کرا و ئەوان بوون بە تاوانکار لەفەوتاندنی ئاشور، بابۆل و سومەر. بەرانبەر نووسراوەکەی داریوش لەبێستوندا، هەوڵە یەک لەدووای یەکەکانی ئەو نەتەوە مەزنانە بۆ ژیانەوەی شارستانییەتی مێزوپۆتامیا، هەزاران جار کەوتەبەر سەرکەوتکردنی سەردارانی داریوش و هەزاران تێکوشەری ئەونەتەوانە بەم بوونەوە لەخوێنی خۆیاندا تلانەوە. ئاکامی کردەوە دژە مێژووییەکانی ئەم هۆزەهێرشبەرە گەشەکردنی ناوچەیی و سورشتی، فەرهەنگی و شارستانییەتی لەڕۆژهەڵات و ئێراندا بەربەند کرد و بۆماوەی ١٢٠٠ساڵ لە

بڵاوبوونەوەیٚ سۆزشتی ڕاگرت . ئەگەر گومانمان لەسەرسڕینەوەی هخامە نشیایەکان بێت ، بە دلنیاییەوە دیسانەوە فەلسەفە و زانست و ئەندیشەیٚ جیهانی وەکو مژارەکانی دیکە لە مێزوپۆتامیا و ئێرانەوە دەژیانەوە ، بەوٚ شێوە کە مێژوو و فەرهەنگی مرۆڤایەتی ، هێندی و چینییەکان کە لە هێرشی تۆقێنەری باکوورییەکان بەدوور ماوٚن ، لەگەشەکردنی هەموو لایەنەکانی زانستی جیهانی کۆندا بەبەشدار دەزانیٚ . تیشکی درۆشاوەیٚ زانست پاش هێرشی هخامەنشییەکان لەڕۆژهەڵاتی ناوڕاستەوە بۆهیند و چین و بەتایبەت یونان ، (١) گوێزراوەتەوە و بەدرێژایی ١٢٠٠ ساڵ بوو بەهۆیٚ ئەزۆکی فەرهەنگی لەئێران و مێزوپۆتامیا وسەرەکیترین هۆکاری پاشکەوتوویی ئەم هەرێمەیە .

٧ ـ هەرچەند مێژوونووسانی زۆر کە زۆرینەیان یەهودین ، هەوڵیان داوە تا سەرهەڵدانی بەهێزی ئەم هۆزە لەئێران و مێزوپۆتامیادا وەکو نیشانەیٚ سەختەبوونی ئیمپراتوری ئێران برازێنینەوە ، بەڵام ئەمە کارەساتێکی تاوانکارانەیە کە لەمسەردەمەیٚ دووایيدا بۆ سازکردنی دووبەرەکیی نێوان ئێرانییەکان وخەڵکانی مێزوپۆتامیا کەئیستا بەهەڵە بەعارەب ناویان دەبەین ، لەلایەن سەهیونیزمەوە ئامادەکاری بۆکراوە و دووا ئامانجی لادانی ئەوٚ بیروڕایانەیە کە هاوبەشییە بەرپڵاوەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوڕاست پێکەوە گریٚ ئەدات .

١ ـ هەر بەوٚ جۆرە کە سوقرات و ئیفلاتون و ئەرەستو ، پاش داڕوخانی ئێران و مێزوپۆتامیا سەریان هەڵدا وهەروەها کە زانست و فەلسەفە ، پاش سەرهەڵدانی ئیسلام جارێکی دیکە بۆ ڕۆژهەڵات گەڕایەوە . بەداخەوە دەسەڵاتی درێژخایەن و زەبر و زەنگی دوورلەفەرهەنگ و کردەوەیٚ تاڵانکارانە ، کە بناغەکەی لە ڕۆژهەڵاتی ناوڕاست لەوانەیە لەجیهانیشدا ، هخامەنشییەکان و جیٚنشینە نامۆ بە ئێرانییەکانیانی ئەشکانی و ساسانییەکان دایانناییت ، تەنانەت خەلیفەکانی ئیسلام و حاکمە ئیسلامی و ئێرانییەکانی هەڵخراند کەشێوەحکوومەتەکەیان لاسایی بکەنەوە . شیرینی و سەرنجی مێژووی ئێران لەوەدایە کە پاش ئیسلامیش خەڵکی ئێمە دژی شێوەیەک لە حوکمکردن بەشەڕ هاتوون کە مۆرکی ڕێبازەکەیٚ داریوشی پێوە بووە . وەهایە کەلەمێژووی ئیسلامی ڕۆژهەڵاتی ناوڕاستدا پاش خولێکی کۆرت لەسەدەکانی سەرەتایٚ ئیسلام کەتووشی حاڵەتی دڵنیایی و خوشەویستی هەستیارانە بوون ، سەدان زانایٚ موسڵمان ، بۆنموونە لەئێراندا سەریان هەڵدا ، بۆشایی بەرتەسکبوونی سیاسی ، ئابووری و فەرهەنگی داسەپاوٚ . ئەوٚ بۆچونەیٚ کەبەئاسایش و ئامادەکاری پێداویستی هەیە ، جارێکی دیکە بۆجوغرافیایٚ هێمن ڕێنموونی کرد ، کە ئیستا پیٚئەڵێن ڕۆژئاوا و ئائیمرو بەهەمان ئامانجەوە درێژەی هەیە و بە ڕاکردنی مێشکەکان بەناوبانگە کەلەڕۆژهەڵاتەوە بۆ ڕۆژئاوا شایەتی ڕێشتنیانین . هیوایٚ گەڕانەوە بۆ تازەکردنەوەیٚ ناسنامەیٚ کۆنی ڕۆژهەڵات کە تیشکەکەیٚ پاش ٢٥٠٠ ساڵ ململانیٚ ئاشکرا دەبیٚ ، هێشتا لەناو خوێیەوە ئەم خەیاڵ پەروەردە دەکات کە کە ڕۆژهەڵاتی ناوڕاست سەرەڕای ڕواڵەتی دەرەوەیی هەنووکەیی ، لەکۆتاییدا بەعەقڵ و زانست و بلیمەتی دەروونی خۆیٚ ، بۆ ڕزگاری جیهان ڕادەپەڕیٚ و پەیغامبەرانی سۆزی وەکو هەلبژاردەکانی خوداییی دوێنیٚ ، بانگەوازی دەربازبوون لەگەروبانەوە دەر دەبرن .

٨ ـ ئێرانییەکان لەم کارەساتە گەورەیٚ مرۆڤایەتیەدا، کە بەڕاوەستانی بزاوی سۆرشتی مێژوو لەڕۆژهەڵاتی ناوڕاستدا کۆتایی پێهات، هیچ بەش و بەرپرسایەتییەکی بەئەستۆیان نی‌یە. چوونکە ئێرانی دێرینە لەو کاتەدا وەکو خەڵکانی مێزوپۆتامیا، سەرەڕایٚ دەیان و دەیان جار بزاوی نەتەوەیی و ئازادیخوازانە، بندەستی چەکدارانی نامۆیٚ هخامەنشی بوون و تێکشکانی نەتەوە و شارستانیەتە مەزنەکانی ئێرانی لە باشووری دەریای کاسپین، سیەلک، ئیلام، ئورارتو، مێدیا و سیستان، نزیک بەسەردەمی هخامەنشییەکانەوە بووە.

٩ ـ ئیسلام ژیانی دووبارەیٚ ئێران و ڕۆژهەڵاتی ناوڕاست، پاش دووانزە سەدە بێدەنگییە. ئەمە پێخاوسە و نەزانەکانی عارەب نەبوون کە جیهانیان لەهەردوو لاوە و لەکاتێکی کەمدا بەدەس‌خست. ئەمە دەمار بەرزی نووستووی مێزوپۆتامیایٚ تێکشکاو بوو کە بەهێزی ئیسلام دیسانەوە سەری‌هەڵدا. یەکگرتوویەک بوو لە شارستانیەتی سامی و ئارامی، ئاشور و بابۆل، سومەر و ئەکەد، کە هێزی دێرینەیان لەقاڵبی بۆچوونی ئیسلامەدە دەگێڕایەوە.

١٠ ـ ئەوەی کە ئیستا لە ڕۆژهەڵاتی ناوڕاستدا لەئارادایە، لەڕوانگەیٚ مێژوویەوە، درێژەی ململانی دێرینی یەهود و شارستانیەتەکانی مێزوپۆتامیایە، ئیستا کە ئەو شارستانیەتانە دێرینانە ڕوویان لەئیسلام کردووە، بەشێوەیٚ ململانی نێوان ئیسلام و یەهود خۆیان نیشان ئەدەن و ئەو بێزاری و تۆقاندنە کە خەڵکانی مێزوپۆتامیا لەڕووی نەزانینەوە سەبارەت بەئێرانییەکان هێشتا دەری‌ئەبڕن، کاردانەوەیٚ کردەوەیٚ دێرینی هخامەنشییەکان بەرانبەر بەشارستانییەتی مێزوپۆتامیایە. سووتانی تەختی جەمشید وڵامی بلێسەیٚ ئاگرەکەیٚ ئاتینیا و تێکشکانی ئێرانییەکان لەقادسیە وڵامی تێکشکانی بابۆل بوو. هەرچەندە خەڵکانی ئێرانی دێرینە لە خلقاندنی ئەو کارەساتانە نەقش و بڕپرسایێتییەکیان نەبوو بەڵام کاتی ئەوەیە کە بەڕەتکردنەوەیٚ کردەوەی هخامەنشییەکان کە سەختەکارانە بەنێوی ئێرانییەکانەوە ئەنجام دراوە، زەمینەیٚ نزیکی خەڵکانی ڕۆژهەڵاتی ناوڕاست ئەمادە بکەین؛ چوونکە مێژوو بەبڕیارە، هەڵسپاردنی بۆنی‌یە، هیچ شتێکی لەبیر ناچێت. گێڕانەوەیٚ شەڕی ئێران و یونان و ئێران و ڕۆما هێشتا لاپەڕەیٚ کتیبی خوێندنگەکانی ئەو وڵاتانەیٚ ڕازاندووەتەوە. ڕووداوەکانی ئوروپایٚ ڕۆژهەڵات سەلماندی کە

داخی تاوانی عوسمانییەکان لەباڵکاندا پاش پانزە نەوە هێشتا هەر تازەیە و شایەتی ئەوەبووین کە چۆن منداڵە شیرەخۆرەکانی بوسنیایی کەوتنە بەر تۆڵەی تاوانی دەمارگرژی باپیرانیان و بەدەستی نەوەکانی دووایی سوربستان هاتنە کوشتن، ئەو سۆربستانیانە کە زکی ئافرەتانی دووگیانیان بەدەستی سەربازانی عوسمانی، سێسەد ساڵ پێش لەئیستا هاتبووە هەڵدڕین. و زۆر نموونەی دیکە سەهیونیزم هەوڵ ئەدا کە بە فاماندن و ناساندنی شارستانیەتی درۆشاوەی وەکو "باوە و ئەیژن" پێش لە ئیسلام، کە مێژوو و فەرهەنگی مرۆڤایەتی، پاش هخامەنشییەکان، هێشتا نیشانەیەکی پێوە نییە، دووبەرەکی نێوان ئێرانییەکان و عارەب قووڵتر بکاتەوە تا ئێرانییەکان ، عارەب، کە گوایە شاهەنشاهی و شارستانیەتی ئێمەیان فەوتاندووە بەهۆکاری دوواکەوتنی مێژوویی خۆیان بزانن. ئەم کتێبە لەهێڵی گشتیدا لەخزمەتی سرینەوەی ئەم خەیاڵە نەتەوەییەدایە، چوونکە ئاکامەکانی ئەو وەهمانە دەبوو بەهۆکاری قووڵتربوونەوەی جیاوازی لەنێوان توێژە جۆربەجۆرەکانی ئەوخەڵکانە کە ئیسلام بە ئامرازی ژیانەوەی نەتەوە و شارستانیەتی خۆیان، وڕۆشنبیرانی ئیسلام و دژبەعارەب دەزانن.

١٢ - وڵاتێک بەنێوی پارس و هۆزێک بەنێوی پارسەکان هیچ کاتێ لەئێراندا نەبووە و نەژیاوە. هەوڵدانی مێژوونووسانی خۆیی و هاوکاری مێژووی ئێران نووسی یەهود، لە ژیانەوەی ئەم وشەدا، لەبەر ئەوە خەڵکی ئێران بۆختیانیان بۆ هێرشبەرانی باشوور دۆرست کردووە ، تازەڕاگرتنی وشەیی بەواتای سەختەوەیە کە لەژێر وەها ئاڵایێکدا، تائیستا ئیلا کاولکردنی یەکیتی نەتەوەیی نەبێ، کارێکی دیکەی نەکردووە.

١٣ - وڵاتی ئێمە ئێرانە کە لانی کەمی لە ٢٠٠٠ ساڵ پێش لەهخامەنشییەکانەوە، پانزە هۆز و نەتەوەی زانا و پرهێزی تێدا دەژی و زۆربەیان نێو و ناسنامە دێرینەیان پاراستووە و بەهەوڵ و تێکوشانی زەلام و ئافرەتانی خۆی ڕێگای پرکەند وکۆسپی مێژوویی، لەوانە دەورانی دوور و درێژی ١٢٠٠ ساڵەی دەسەڵاتداری هۆزە هێرشبەرە نامۆکان، لەماوەی سەرهەڵدانی هخامەنشییەکان تا کۆتایی دەورانی ساسانییەکان و سەدان کوێرەوەری دیکە کە هۆکاری هێرشی هۆزە هێرشبەرە نەناسراوەکانی دیکە وەکو سەلجوقی، غەزنەوی، مەغۆلی، تەیموری و قەجەری

جۆن و ئیلت ئیستاکەی نەتەوەیەکی زیندوو، مێژوو ساز و پێشرەو لەڕۆژھەڵاتی ناوڕاست و جیھانیان پێوەیە. ھەرئەم ململانێ و بەسەرھاتە ھاوبەشە، یەکێتیەکی قایم و ناڕاستەخۆی، لەنێوان ھۆز و نەتەوەکانی ئەم وڵاتەدا پێکھێناوە کە ھەمیشە بووە بە ھۆی سەرسووڕمانی جیھانیان.

١٤ ـ ھەنووکە ئێمە لە ناوچەیَ ئانشان بە پارس دەناسین کە بەشێک لە ئێرانی دێرینەیە و ئەو پیتە کە پیتی ئێرانییە و نووسەرانی ئیلامی بەبلیمەتێکی تایبەت و بەپەلە خولقاندوویانە، بەھەڵە پێ ئەیژین پارسی. لەوانەیە کە ئارەزوو بکەم تا ئەم نێوە کە بناغە سەرەکییەکەی جنێو و سووکایەتییە، لەم وڵاتە و لە سەر ئانشان بسڕیتەوە کە بەشایەتی مێژوو و بەردەنووسراوەکەی بێستون، خەڵکەکەی لەھەموو ململانێیەکانی دژبەداریوش ھەنگاوی یەکەمیان ھەڵگرتووە.

١٥ ـ ئەم کتێبە لەقەبارەی بچووکدا تەنیا سەرنجێکە لەبناغەی مێژووی ئێران و ئەگەر کەڵکی لێ وەربگیردرێت دەتووانرێت دەیان کتێبی تەواو یا تاقەنووسراوەی دوور و درێژی لێ بکەوێتەوە کە ئەنجامیان لەئاستی تووانایی نووسەردا نییە. چوونکە ڕاگەیاندنی سەرھەڵدانی ئیسلام و سەفەوییە و شۆڕشەکانی سەردەم، لەئەگەری چەن ڕۆژێک کەلەتەمەنم ماوە، بەپێویست دەزانم و ئەوە ژێرنووسێکە لەم کتێبە کە لەگەڵ دەسکردی ڕۆژھەڵاتناسان و پاشکۆ نێوخۆییەکانیان جیاوازە. لەوانەیە بەیارمەتی بەرەی گەنجی ئێران، کە لەداھاتوویەکی پرشنگداری ئەم وڵاتەدا بەشداریان زۆرترە، بەشە چکۆلەکانی ئەم ئاخەفتنە مێژوویە باشتر فام بکرێت.

## کۆتایی

حەمە سدێق میرزا - دووەمی ئازاری ٢٠٠٤ی زایینی